

# ناوەڕۆك

تەوەری ژمارە:



بابەتی گشتی:








# ڕێکخراو و گرووپە ئیسلامییەکان
## لە کوێی پێداویستییەکانی کۆمەڵگەی کوردیدان

کاری ڕێکخراو و گرووپە ئیسلامییەکان لە کۆمەڵگای کوردیدا فرەڕەهەند و جۆراوجۆرە، بەشێوەیەک هەموو بوارەکانی سیاسەت و بەرخۆدان و خێرخوازیی و بانگەواز و پەروەردە و...هتد دەگرێتەوە، دوای زیاتر لە سێ دەیە لە ئەزموون دەپرسین:

- تا چەند ڕەوت و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان لەگەڵ دروشمەکانی خۆیاندا ڕاستگۆ بوون؟
- لایەنە سلبی و ئیجابییەکانی بەشداری ئیسلامییەکان لە کابینەکانی پێشووی حکومەتی هەرێمدا چین؟
- ئیسلامییەکان و ڕاگرتنی باڵانسی هێز لە کوردستاندا.
- ئایا کار و چالاکی ئیسلامییەکان لەمڕۆدا دەتوانێت وەڵامگۆی پێداویستییەکانی کۆمەڵگەی کوردی بێت؟
- ئایا ئیسلامییەکان پێویستییان بەوە نییە کە میکانیزمەکانی کارکردنیان بگۆڕن بۆئەوەی بتوانن لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکاندا هەڵبکەن و دەربچن؟
- تا چەند جیاوازیی و ململانێکانی نێوان گرووپ و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان زیانی بە ناو و ناوبانگیان گەیاندووە؟
- ئایا دوورەپەرێزیی ئیسلامییەکان لەیەکتر، زیانی بە پێگەی جەماوەرییان نەگەیاندووە؟
- ڕۆڵی ئیسلامییەکان لە پاراستنی بەها کۆمەڵایەتییەکاندا چی بووە؟
- دامەزراوە پەروەردەییەکانی ئیسلامییەکان و ڕۆڵیان لە پەروەردەکردنی تاکی تەندروستدا.
- ئایا کۆمەڵگەی کوردی سودمەند بووە لە کارە خێرخوازییەکانی ڕێکخراوە ئیسلامییەکان.
- داواکارین لە نوسەرانی بەڕێز، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی کە ئاماژەیان پێدراوە تا ڕێکەوتی (١/ ٧/ ٢٠٢٢) بنێرن بۆ گۆڤارەکەمان.




# ئەزموونی حوکمڕانیی لە هەرێمی کوردستاندا، هەڵسەنگاندن و بەراوردکردن

خاڵ گۆڤارێکی هزریی و ڕۆشنبیرییە، هەوڵی داوە بابەتەکانی لەو بازنەیەدا بن، بەڵام هزر و ڕۆشنبیریی و سیاسەت زۆرجار وەها لە یەک دەئاڵێن لێکترازاندنیان ئەستەمە، سەرەڕای ئەوەش پاش زیاتر لە سی ساڵی دەسەڵاتداریێتی کوردی لە کوردستاندا، ناکرێت ئەم ئەزموونە بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە قسە و باسی لەسەر نەکرێت.

لەو چوارچێوەیەدا گۆڤارەکەمان بابەتی(ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێمی کوردستاندا، هەڵسەنگاندن و بەراوردکردن)ی کرد بە تەوەری ئەم ژمارەی خۆی. لەڕاستیشدا ئەم ناونیشانە بەشێوەیەکی سادە ئەمڕۆ بووەتە باس و خواسێکی گەرم و بەربڵاو لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا، ئەم بابەتە بۆ نووسەران و ڕۆشنبیران کە بژاردەی ناو خەڵکن ئەولاترە، بۆیە دەبێت قسەی جددیان لەسەر ئەم ئەزموونە هەبێت.

لەم سۆنگەوە کۆمەڵێک نووسەر و قەڵەمبەدەستی پسپۆڕ لە ڕەهەندە جیاوازەکانەوە، هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەزموونی حوکمڕانی هەرێمی کوردستانیان کردووە و هەریەکە لە گۆشە نیگایەکەوە شەن و کەوی ئەم بابەتە هەستیارەی کردووە. بەو ئومێدەین لەم ڕێگەیەوە مەڵۆیەکی دیکەمان خستبێتە سەر مەعریفەی خوێنەرانی گۆڤارەکەمان و دەسەڵاتدارانیش بەرپرسانە لەم تەوەرە بڕوانن و بیخوێننەوە.

گۆڤاری خاڵ





پ.د. دانا عەلی ساڵح بەرزنجی

# دیوە تاریکەکەی ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێمی کوردستان

**دەستپێك..**

**هەرێمی کورستان، وەك کیانێکی سیاسی، لە بۆشاییەوە نەهاتووە؛ بەرهەمی خەباتێکی دوورودرێژ و نەپساوەیە، لە دۆخێکی نێودەوڵەتیدا وەکو دیفاکتۆ هاتەکایەوە و لە دوای ڕاپەڕینی گەل لە ساڵی ١٩٩١ و کشانەوەی دامودەزگا فەرمییەکان لەلایەن بەغداوە و دواتر ئەنجامدانی یەکەمین هەڵبژاردنی پەڕلەمانی کوردستان، بەدیاریکراوی لە ١٩٩٢/٠٥/١٩، جۆرێك لە سەربەخۆیی ئیداریی بەخۆیەوە بینی. ئیدی لەوێوە چیرۆکی حوکمڕانی خۆبەخۆی هەرێمی کوردستان، بە جۆرێك لە جۆرەکان، دەستیپێکرد.**

هەنووکە نزیکەی سێ دەیە بەسەر ئەو ڕووداوە مێژووییەدا تێدەپەڕێت؛ ئێستا پتر لە نەوەیەک پێگەیشتووە کە سەردەمی ڕژێمی بەعسیان نەبینیوە و لە سایەی دەسەڵاتی خۆماڵیدا چاویان هەڵهێناوە، دەپرسن هەرێمی کوردستان چ پەرەسەندنێکی بەخۆوە بینیوە؟ چۆن بتوانین هەڵسەنگاندنێکی هێمن و ورد بۆ ئەوە بکەین کە ئەم ماوەیەی حوکمڕانی بەرهەمی هێناوە؟

کاتی ئەوەیە کە بە جیددی ئاوڕ لەو ئەزموونە بدرێتەوە و پەنجە لەسەر برینە قووڵەکانی دابنرێت و ڕێگەچارەی گونجاو بۆ ئەو گرفت و کەموکووڕییانە بدۆزرێتەوە، کە تا هەنووکە پێوەی دەناڵێنین. بۆیە دەپرسین: ئایا ئەوانەی جڵەوی دەسەڵاتیان بەدەستەوە بووە، سەرکەوتوو بوون لە ئیدارەدانی کۆمەڵگە و بەرەوپێشبردنی، یاخود نەخێر نەیانتوانیوە وەکو پێویست لایەنە جیاوازەکانی حوکمڕانی بخەنە سەرپێ و زیاتر ڕۆڵی پیاوی سیاسەتیان بینیوە و نەیانتوانیوە بگەنە ئاستێک ڕۆڵی پیاوی بنیاتنانی دەوڵەت و دەوڵەتداری ببینن و لە بەرانبەردا بوون بە پارێزەری کورسی و دەسەڵاتی خۆیان و پارتەکانیان و کورسی و دەسەڵاتی خۆیان و بەرژەوەندی تایبەتیان خستووەتە پێش بەرژەوەندیی گشتییەوە و نەیانتوانیوە بناغەی سستمێکی حوکمڕانیی تەندروست دابڕێژن و ئەزموونەکەیان گیرۆدەی چەندین گرفت و ئاریشەی قووڵ کردووە، کە چارەسەرکردنیان ماوەیەکی زۆری پێویست بێت؟ بۆ ئەمە پێویستە لە چەند ڕەهەند و لایەنێکەوە هەڵسەنگاندن بۆ ئەو ماوەیە لە حوکمڕانی بکرێت؛ بۆ هەڵسەنگاندیش پێویستە هاوسەنگییانە و بابەتییانە تاوتوێی ئەو مژارە گرنگە بکرێت، چونکە ناکرێت لایەنە پۆزەتیڤەکان نادیدە بگیرێن و هێڵی تان و پۆیان بەسەردا بهێنرێت؛ هەرێمی کوردستان لە سی ساڵی ڕابردوودا پەرەسەندنی باشی بە خۆوە بینیوە، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا لە ئاستی پێویستدا بووە، یان نا؟ ئایا دەکرا کاری باشتر بکرێت و نموونەیەکی سەرکەوتووانەی حوکمڕانی پێشکەش بکرێت؟ ئایا ئەم ئەزموونە شیاوی ئەوەیە –وەک بەرپرسان دەڵێن– بۆ شوێنی تر بگوێزرێتەوە؟

بە کورتی، ئێمە لێرەدا تەنها تیشکێک بەخێرایی دەخەینە سەر دیوە تاریکە مەترسیدارەکەی ئەزموونی سی ساڵەی حوکمڕانی لە هەرێمی کورستان و گریمانەی ئەوەمان کردووە کە نەخێر لە ئاستی پێویستدا نەبووە و دیوە تاریک و مەترسیدارەکەی ئەو ئەزموونە کاریگەریی نەرێنیی گەورەی لەسەر ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی و کولتووریی کۆی کیانەکە و هاوڵاتییانیش هەبووە و دەبێت، هەروەک چۆن کاریگەریی نەرێنیی لەسەر ئایندەی ژیانی نەوەکانی ئایندەو سستمی حوکمڕانییش هەبووە و دەبێت لە هەرێمی کوردستان، هەربۆیە ئەم ئەزموونە شیاوی گواستنەوەش نییە بۆ هەر شوێنێکی دی. بۆ سەلماندنی ئەمە دەبێت شیکارێک بۆ دۆخی هەرێمی کوردستان و شێوازی بەڕێوەبردن و حوکمڕانی بکەین لە هەرێمی کوردستان لە چەند ڕەهەندێکی جیاوازەوە.

## یەکەم: لەڕووی سیاسییەوە:

لەڕووی سیاسییەوە، هەرێمی کوردستان، لەگەڵ ئەوەی لە سەرەتاوە هەڵبژاردنی ئەنجامدا، کە هەنگاوێکی ئەرێنی بوو، پارتە سەرەکییەکان نەیانتوانی دەرەنجامەکانی هەڵبژاردن قبووڵ بکەن و بە ڕێککەوتنی پەنجا بە پەنجا هەرێمیان بەڕێوەبرد، کە ئەمە تا هەنووکە ڕەنگدانەوە نەرێنییەکانی لە زۆربەی کایەکانی ژیانی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی و دامەزراوەییشدا بەردەوامە. ئەمە وێڕای هەڵایسانی چەندین جەنگی ناوخۆیی لە نێوان پارتە سیاسییەکاندا، لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو، کەماڵوێرانکەرترینیان جەنگی ناوخۆیی نێوان پارتی دیموکراتی کورستان و یەکێتی نیشتمانیی کوردستان بوو، کە دوای نزیکەی چوار ساڵ لە جەنگ و کاولکاری (١٩٩٤-١٩٩٨)، بە ڕێککەوتننامەی واشنتۆن سنووری بۆ دانرا، ئەم جەنگە شیرازەی فەرمانڕەوایەتیی شێواند و هەرێمی کوردستانی لە چەندین ڕووەوە لەت کرد و بووبە هۆی پەلکێشکردنی بێگانە و ناحەزان بۆ ناو هەرێم و دەستێوەردانی دەرەکیی لە کاروبارەکانیدا ئاسانتر کرد.

ئیدی وایلێهات، لەو ماوەیەدا، دوو جۆر دەسەڵات لە دوو زۆرنی جیاوازدا پیادە بکرێت، ئەمەش گورزێکی کەمەرشکێن بوو بۆ ئەزموونی دەسەڵاتداری لە هەرێمی کوردستان و شیرازەی دامەزراوەکان تێکچوو و هەتا ئێستاش لێکەوتەکانی ئەو جەنگە بەکردەیی بەرۆکی سستمی دەسەڵاتداریی بەرنەداوە، دیارترین بەڵگەش بۆ ئەمە جیاوازی دەسەڵاتی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکەیەتی لە سنووری زۆنی زەرد و سەوزدا، بەتایبەت لە کۆکردنەوەی سەرچاوەی داهات و بەڕێوەبردنی دارایی و بەڕێوەبردنی دامەزراوە خۆجێییەکان بەجۆرێک لە جۆرەکان و مانەوەی «سنووری دێگەڵە» وەک هێڵێکی ڕەش بۆ دابەشکردنێکی ناوخۆیی هەرێمی کوردستان. تەنانەت لە ساتەوەختی نووسینی ئەم چەند دێڕەدا (٢٠٢٢/٣/٣)، سەرۆکی حکومەتی هەرێم لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیدا لە هەولێر ناڕەزایی و نیگەرانی خۆی لە نەگەڕاندنەوەی داهاتی ناوخۆی سنووری زۆنی سەوز بۆ خەزێنەی گشتی ڕاگەیاند، بەبێ ئەوەی هیچ ڕێگەچارەیەکی گونجاو و کردەیی بۆ ئەو پرسە هەبێت.

لەڕووی بەڕێوەبردنی پەیوەندییەکانی دەرەوە، تا ئێستا هەرچەندە نزیکەی (٤٠) کونسوڵخانە و نوێنەرایەتی وڵاتانی جیهان لە هەرێم بوونیان هەیە و نزیکەی (١٤) نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێم لە دەرەوە هەیە، بەڵام هێشتا پارتەکان بۆ خۆشیان نوسینگەی نوێنەرایەتییان لە هەندێک لە وڵاتان هەیە، کە ئەمە پێچەوانەی فەلسەفەی حوکمڕانیی تەندروستە. لەلایەکی ترەوە، نەتوانراوە پەیوەندیی دیپلۆماسی لەسەر ئاستی فەرمی یەکبخرێت و هەر لایەنێکی سەرەکی کەوتووەتە بازنەی هەژموونی دەوڵەتێکی ئیقلیمییەوە،

هەروەک چۆن لە پرسە نیشتمانییە باڵاکاندا نەتوانراوە سازان و کۆدەنگیی تەواو دروست بکرێت و گوێ لە هەموو ڕا و بۆچوون و لایەنەکان بگیرێت و حساب بۆ دەرەنجامە نەخوازراوەکان بکرێت، نزیکترین نموونەش بۆ ئەمە ڕێفراندۆمی سەربەخۆیی ساڵی (٢٠١٧) یە، کە هەرێم لە ئەنجامی لێکەوتەکانی، نزیکەی نیوەی ئەو خاکەی لەدەستدا کە بەدەستییەوە بوو، ئەمە وێڕای ئەو گۆشەگیرییەی کە دوچاری بووەوە و دەسەڵاتەکانی سنووردارکران. هەرچەندە سەربەخۆیی کوردستان خەونی لەمێژینەی هەموو تاکێکی کوردە.



**ڕۆژنامەنووسان تا سنوورێکی دیاریکراو ئازادن و ناتوانن هێڵە سوورەکانی بەرژەوەندیی حیزبە دەستڕۆیشتووەکان ببەزێنن**



وێڕای ئەمانە، نەتوانراوە بەرژەوەندییە باڵاکانی هەرێم بخرێنە پێش بەرژەوەندییە حیزبییەکانەوە لە بەغدا، هێندەی کار بۆ پۆست و جیاوکی کەسی و بنەماڵەیی و حیزبی کراوە، هێندە گرنگی بە پرسە گرنگ و چارەنوسسازەکان نەدراوە، وەک پرسی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠)ی دەستوور و پێشمەرگە و ماف و شایستەکانی هەرێمی کوردستان و هاوڵاتیانی، بەڵکوو بەپێچەوانەوە، لە بەغدا شەڕی گەورە و کارتی فشاری زۆر لە دژی یەکتری بەکاردەهێنن، نوێترین بەڵگەش بۆ ئەمە شەڕی دوو پارتە دەسەڵاتەکەی هەرێمە لە بەغدا، لەسەر پۆستی سەرۆککۆمار، کە بە بەرچاوی دۆست و نەیارەوە ململانێیەکی توند لەسەر ئەو پۆستە دەکەن.

لەلایەکی ترەوە، هەرچەندە فرەیی حیزبی لە هەرێمی کوردستان هەیە، کە خۆی خاڵێکی ئەرێنییە، بەڵام بەشێکی زۆری پارتەکان لە دەوری دوو جەمسەردا دەخولانەوە و وەک ئامرازی فشار بۆ سەر یەکتری و لە پرسە جیاوازەکاندا بەکاردەهێنران.

دوای دروستبوونی پارتی ئۆپۆزسیۆنی کاریگەریش، کە خۆی خاڵێکی ئەرێنی بوو، قووڵبوونەوەی ڕکابەری و ململانێی نێوان ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵاتی زیاتر کرد، بەڵام نە ئۆپۆزسیۆن توانی وەک ئۆپۆزسیۆنێکی کردەیی بەهێز کاربکات و دەرەنجامی هەوڵەکانی بە تەواوی بخاتە خزمەتی خەڵکەوە، نە دەسەڵاتیش توانی مامەڵەیەکی تەندروست لەگەڵ ئۆپۆزسیۆن بکات و چەندین بەریەککەوتنی ناتەندروست لە نێوانیاندا دروست بوو، کە

زۆر جار خەڵكی بەگشتی لێی زیانمەند دەبوون.

هەرکاتێکیش پارتەکانی دەسەڵات ڕێککەوتبن، وەک ئەوەی لە ڕێککەوتننامەی ستراتیژیی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا کرا، جۆرێک بووە لە ڕێککەوتن لەسەر دابەشکردنی دەسەڵات و پۆست و جیاوکەکان و جۆرێک لە دوو ئیدارەیی تێیدا ڕەنگی داوەتەوە. بەشداریی لایەنەکانی تریش، هێندەی ڕازاندنەوەی سفرەی حوکمڕانی و ڕازیکردن و بێدەنگکردنی هەندێک لایەنی ناڕازی و بەخشینی هەندێک پۆست و جیاوک بووە بە چەند لایەنێک، هێندە بە هاوبەشیکردنی ڕاستەقینەی بڕیارە چارەنووسسازەکان لە قەڵەم نادرێت.

لەلایەکی ترەوە، تا ئێستا بەتەواوی پابەند نەبوون بە وادەیەکی جێگیر بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و ئەنجومەنی پارێزگاکان و ئەمەش دەکەوێتەوە بەر نەشتەری ویستی پارتە فەرمانڕەواکان و بەرژەوەندییەکانیان.

لەلایەکی ترەوە، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنییش، بەشێکی زۆریان کرانە پاشکۆی پارتە دەستڕۆیشتووەکان، ئەوانەی دارایی و ئیدارە و بڕیاری ئەو ڕێکخراوانەیان لەدەستدابوو و وەکو ئامرازێکی کۆنترۆڵکردنی ناتەندروست بەکارهێنراون، هەر لە فێرخوازانەوە بیگرە، تا دەگاتە مامۆستایان و پزیشکان و پارێزەران و کرێکاران و جوتیاران و پیشەوەران ...هتد، تەنانەت یەکێتییەکانی زانایان و ژنان و کەمئەندامان و کۆمەڵە و سەندیکاکانی ڕاوچییانیشی گرتەوە، تا کار گەیشتە ئەوەی تەنانەت ناوی ڕێکخراوەکان و کۆمەڵەکانیش دابەش کران؛ زاراوە و وشەکانیش بۆ هەمان ناوەرۆک بەشێوازی جیاواز و جیاکاری و دووبەرەکی بەکارهاتن؛ لەلایەک خوێندکار و ژن و کۆمەڵە... بەکارهات، لەلایەکی تر، بۆ هەمان ناوەرۆک، قوتابی و ئافرەت و یەکێتی... بەکاردێت!

ئیدی هەموو ئەوانە لەبری ئەوەی ببنە پردی گواستنەوەی خواستەکانی خەڵک و کۆمەڵگە بە دەسەڵاتی سیاسی و ڕێکخستنی داواکارییەکانیان، زیاتر بەلای ئەوەدا بوون کە وەک پاشکۆ و ئامرازێکی پارتەکانی دەسەڵات کار بکەن، ئەمەش بواری بۆ کارکردنی تەندروستی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی تەسک کردەوە، بەڵکوو وایکردووە ئەو ڕێکخراوانە نەتوانن ببنە ناوەندێکی کارا و بەهێز بۆ دروستکردنی فشار بەسەر دەسەڵاتدارانەوە. ئەگەر بێینە سەر ئازادی بۆچوون و ڕۆژنامەگەری، ئەوا هەرێمی کوردستان ئەزموونێکی تەواوی پێشکەش نەکردووە، ڕۆژنامەنووسان تا سنوورێکی دیاریکراو ئازادن و ناتوانن هێڵە سوورەکانی بەرژەوەندیی حیزبە دەستڕۆیشتووەکان ببەزێنن، شەهیدکرانی ڕۆژنامەنووسان دەستگیرکردنیان و سنووردارکردنی کارەکانیان و سوتاندنی کەناڵی

ئاسمانی و هەموو پێشێلکارییەکانی تر، کە ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوەکانی هیومان ڕایتس وۆچ و ئەمنیستی ئینتەرناشناڵ و ..، بەڵگەی ئەو ڕاستییانەن، تا گەیشتبووە ئاستێک حکومەت فەرمانگەیەک بەناوی «فەرمانگەی وەڵامدانەوەی ڕاپۆرتە نێودەوڵەتییەکان» بکاتەوە! کە دواتر ناوەکەی گۆڕدرا بۆ «لیژنەی هەڵسەنگاندن و وەڵامدانەوەی ڕاپۆرتە نێودەوڵەتییەکان»، ئەم دیوەی ئەزموونەکە ناشرینەییەکانی دەسەڵاتی گواستۆتەوە بۆ نێوەندە نێودەوڵەتی و جیهانییەکان و لێکەوتەی نێودەوڵەتیشی دەبێت.

ڕوویەکی تاڵی تری ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێمی کوردستان، بریتییە لە بوونی دەسەڵاتی قووڵ لەپشت دەسەڵاتە فەرمییەکانی هەرێمەوە؛ جێبەجێکردن، یاسادانان، دادوەری، کە پارتە فەرمانڕەواکان تەحەککوم بەکاری هەر یەکێکیانەوە دەکەن و هەژموونیان بەسەریانەوە هەیە، واتە زۆرجار لەپشت دامەزراوە فەرمییەکانەوە بڕیارەکان دەدرێن و ئەو دەزگایانە یان شەرعییەتی یاسایی پێ دەدەن، یاخود جێبەجێی دەکەن؛ پتر لەوە، هەرکاتێک ویسترابێت دەزگایەک لەکار بخرێت، یاخود کارایی نەهێڵرێت، یان بەجۆرێک لە جۆرەکان بێڕۆڵ بکرێت، زۆر بە ئاسانی دەستی بۆ براوە؛ بەتایبەت پەرلەمان؛ کە بە بەرچاوی هەموو دونیاوە، لە ٢٠١٥/١٠/١٢دا ڕێگری لە سەرۆکی ئەو کاتەی پەرلەمانی کوردستان (یوسف محەمەد سادق) کرا کە بچێتەوە پەرلەمان و کاری ئاسایی و یاسایی خۆی ئەنجام بدات!

هەروەک چۆن دامەزراوە فێرخوازی و پەروەردەیی و ئەکادیمییەکان، بە بەرایی و باڵاوە؛ هەروەها شێوازی بەڕێوەبردنیان و دیاریکردنی بەرپرسان و بەڕێوەبەرانیان، هەر لەلایەن ئەو پارتانەوە بڕیاری لێدراوە، تا کار گەیشتووەتە ئەوەی، مەکتەبی سیاسی و لق و مەڵبەندی ئەو پارتانە ڕۆڵی یەکلاکەرەوەیان هەبێت لە یەکلاکردنەوەی پۆستە باڵاکانی نێو زانکۆ و پەیمانگاکان، ئەمەش ڕەنگدانەوەی نەرێنیی لەسەر پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن و بەرەوپێشچوونی ئەو دامەزراوانە جێهێشتووە، چونکە، زۆرجار، پێوەری حیزبیبوون خراوەتە پێش پێوەری لێوەشاوەیی و کارامەیی و توانای ئەو کەسانەی کە بۆ ئەو پۆستانە دیاری دەکرێن.

پەڵەیەکی ڕەشی تر بەم ئەزموونەی حوکمڕانییەوە بریتییە لە بێئومێدکردنی خەڵک بە گشتی لە چاکسازیی و هەنگاونان بۆ پێشەوە، هەروەها نەبوونی دامەزراوەیی بەهێز بە واتای وشەکە لە هەرێمی کوردستان، چونکە حیزب و بەرپرسە دەستڕۆیشتووەکان پۆستەکان هەڵی دەسووڕێنن، هەروەک چۆن پۆستەکان بەستراونەتەوە بە کەسەکانەوە و دامەزراوەییبوون تێیاندا لاوازە؛ بە جۆرێک کە لەگەڵ گۆڕانی کەسێک لە پۆستێک، هەندێکجار تەنانەت بەرپرسەکە ئەرشیفەکەش لەگەڵ خۆی دەبات و بەرپرسی داهاتوو




لە سەرەتاوە دەستپێدەکاتەوە، ئەمە وێڕای نەبوونی پلانی درێژخایەن و ستراتیژی بۆ شێوازی حوکمڕانی.

ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێم نەیتوانیوە پێش ڕووداوەکان بکەوێت و بە پلان هەنگاو بنێت، بەڵکوو زۆربەی کات دوای ڕووداوەکان کەوتووە، نزیکترین بەڵگەش بۆ ئەمە کارنەکردنە بۆ ڕێگریکردن لە بڕیارەکەی دادگای باڵای فیدراڵی پێش دەرکردنی بڕیاری « هەڵوەشاندنەوەی یاسای نەوت و گازی هەرێم بەبیانووی نادەستووریبوونی یاساکە»، کە لە ساڵی ٢٠١٢وە داواکە تۆمارکراوە! ئێستاشی لەسەر بێت هەوڵی کاری جیددی نادرێت بۆ مامەڵەی دروست لەگەڵ لێکەوتەکانی بڕیارەکە.

دیوێکی تریش بریتییە دیاردەی گەندەڵی کە بە سیستماتیک کراوە و، ئەمە لەسایەی نەبوونی دامەزراوەی سانسۆر و چاودێریی کارا بەسەر کار و ئەرکی دامەزراوە فەرمییەکانەوە، بەتایبەت حکومەت، کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە کاروبار و بەرژەوەندیی هاوڵاتییانەوە هەیە و بواری گەندەڵی زۆرە لە کارەکانیدا.

## دووەم: لەڕووی ئاساییشەوە:

ئەم ئەزموونەی هەرێمی کوردستان، کە دەکەوێتە نێوان بەرداشی فارس و تورک و عەرەبەوە، لەڕووی ئاساییشەوە، ئاساییش بەواتا فراوانەکەی، نەیتوانیوە هەنگاوی گەورە و ستراتیژی و دەوڵەتمەدارانە بنێت. سەرەتای ئەزموونەکە بە چەندین جەنگی ناوخۆیی و ململانێی چەکداری خوێناوی بوو، کە قوربانییەکی بێشوماری گیانی و ماددی لێکەوتەوە و چەندین نەوەی تری دەوێت تا کەمێک لە زامەکانی ئەو جەنگانە سارێژ دەبن. ئاوارەبوونی ناوخۆیی و پەلکێشکردنی وڵاتانی هەرێمی و بەغداش لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا، بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێکان، دەرەنجامێکی تاڵی ئەو مێژووەن.

نەک هەر ئەوە، بەڵکوو ئاساییش بە واتا بەرتەسکەکەی تا ئێستاش لە مەترسیدایە، چونکە تا ئێستاش هێزی سەربازی و پۆلیس و ئاساییش و هەواڵگری، بەتەواوی لە دەستی حکومەت و وەزارەتی پێشمەرگە و ناوخۆدا نین؛ بەوشێوەیەی کە دەوڵەتداری دەیخوازێت، بەڵکوو هێز لە دەستی حیزبە باڵادەستەکاندایە، لەوەش مەترسیدارتر ئەوەیە کە هێزی تایبەت بە بەرپرسان هەیە و فەرمان لە تاکەکەسێکەوە، لە دەرەوەی وەزارەتی ناوخۆ، یان پێشمەرگە، وەردەگرن و نەتوانراوە لە چوارچێوە هێزێکی نیشتمانیی یەکگرتوودا یەک بخرێن، بە جۆرێک کە لەژێر دەستێکی ئەمینی مەدەنیی حکومیدا بن و بۆ ململانێی حیزبی بەکارنەهێنرێن و کار بۆ ئاساییشی نیشتمانی بکەن، ئەمە لە کاتێکدایە کە وڵاتانی زلهێز هەوڵی زۆریانداوە و هۆشداریشیان لە مەترسییەکانی نەبوونی هێزێکی

یەکگرتووی نیشتمانی داوە، بۆئەوەش پاکێجیان بۆ یەکخستنی هێزەکان پێشکەش کردووە.
بەواتایەکی تر، نەتوانراوە ئاساییشی ئەرێنی «positive peace» دروست بکرێت و ئەوەی هەیە، لە باشترین باریدا، تەنها لە چوارەچێوەی ئەوەدا دەخولێتەوە کە لە کایەی ئەکادیمیدا پێی دەوترێت ئاساییشی نەرێنی « negative peace».
خۆ ئەگەر ئاساییش بەواتا فراوانەکەی باس بکەین، وەک ئەوەی قوتابخانەی کۆپنهاگن و بە دیاریکراوی «باری بوزانBarry Buzan » ئاماژەی پێدەکات و جەختی لێ دەکاتەوە، تا ئێستاش هاوڵاتی لە هەرێمی کوردستان ناتوانێت بە ئارامی بخەوێت و ئاساییشی بۆ بەجەستە نەکراوە، ئەمەش لە ڕەهەندە (سەربازیی و سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی و ژینگەیی)یەکەیەوە ڕەنگی داوەتەوە؛ بەواتایەکی تر، ئاساییشی مرۆیی بەگشتی بە بارێکی خراپدا گوزەری کردووە و هاوڵاتی لەم هەرێمە بە ئارامی و بەبێ ترس ژیانی بەڕێ نەکردووە؛ ترس لە هەموو ڕووەکانی ژیانەوە؛ لە ترس لە ژیانی ئێستا و ئایندەش، کە ئەمەش ڕێژەییە و لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی دی و لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی دی گۆڕاوە و دەگۆڕێت، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە، بنکە فیزیکییەکەی هەرێم وەکو کیانێکی نادەوڵەتی (گەل، سامان، تەکنۆلۆجیا)و ڕووکارە دامەزراوەییەکەشی (سیستەمی سیاسی و کارگێڕی) هەر نەگەیشتوونەتە جێگیریی و کەناری ئارامی. بۆ وێنە، چەند بەڵگەیەک، لە چەند ڕوویەکەوە، دەخەینەڕوو:
١. ئاساییشی خۆراک بوونی نییە و کاری تەواوی بۆ نەکراوە، لە ئەگەری هەر سنووورداخرانێکدا، لە هەرێمێکی داخراودا –کە هیچ دەروازەیەکی ئاویی نییە- ڕاستەوخۆ هاوڵاتی دوچاری دڵەڕاوکێ و تەنگەتاوی و زیانی بەرجەستە دەبێت.
٢. لەڕووی ئاساییشی کۆمەڵایەتییەوە –کە دواتر زیاتر لەسەری دەوەستین- نەتوانراوە بناغەیەکی بەهێز دابڕێژرێت.
٣. ئاساییشی ژینگەیی: تا ئێستا میکانیزمەکانی ئاساییشی ژینگەییش دانەنراون و مەترسی لەسەر ژینگەش بوونی هەیە.
٤. هەروەها  بە ئەزموونی سی ساڵی حوکڕانی نەتوانراوە ئاساییشی ئاو دابین بکرێت و بناغەیەکی تۆکمەی ئەوتۆ هەبێت کە لەو جوگرافیا لەبار و گونجاوەی هەرێمی کوردستاندا ئاساییشی ئاو دابین بکات، بە دروستکردنی بەنداو و سیستەمی ئاودێری و تەکنیکی نوێی ئەوتۆ کە هاوکاربێت بۆ دابینکردنی ئاوی پێویست بۆ هاوڵاتیان و کشتوکاڵ و ئاژەڵ و ..هتد، بەدرێژایی ساڵ.
٥. ئاساییشی تەندروستی: کە تا ئێستا نەتوانراوە بە تەواوی هاوردەکردن و بەرهەمهێنانی دەرمان کۆنترۆڵ بکرێت و بە فلتەرێکی دڵنیایی جۆرییدا تێبەپەڕن، ئەمە

لەلایەک، لەلایەکی ترەوە کۆمپانیاکانی دەرمان لەژێر کۆنترۆڵی حکومەت و وەزارەتی تەندروستیدا پابەند نین.

٦. لەڕووی کیانەکەشمانەوە، تا ئێستا هەر لەژێر مەترسیی هەژموونی بەغدادایین و هەر جارەی بە میکانیزمێک قەڵەمڕەو و دەسەڵاتمان کەم دەکرێتەوە، جارێک بە هێزی سەربازی (ئەوەی لەدوای ١٦ی ئۆکتۆبەر ڕوویدا)، جارێک بە فشاری دارایی و ئابووری (بڕینی بەشە بودجەی هەرێم)، جارێکی دی بە میکانیزمی دادگا و دامەزراوەی قەزائی (بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی یاسای نەوت و گازی هەرێم..). مەترسی بەرژەوەندی و هەڕەشەی هێزە ئیقلیمییەکان (بەتایبەت ئێران و تورکیا) و نادڵنیابوون لە پشتیوانی هێزە نێودەوڵەتییەکانیش (بەتایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکان) لە هەڵوێستە هەستیار و چارەنوسسازەکاندا، لەولاوە بوەستێت.

کەواتە تا هەنووکە هەڕەشە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی ئاساییش بوونیان هەیە و نەتوانراوە ئاستێکی باشی ئارامی بۆ هەرێم، وەکو کیان و دامەزراوە و هاوڵاتی و سامانەکانیشی، فەراهەم بکرێت.

## سێیەم: لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە:

تاکی کورد لە سی ساڵی ڕابردوودا، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لە سایەی ئەو حوکمڕانییەی کە هەبووە، دوچاری چەندین گرفتی جەوهەریی بووەتەوە.

شەڕی ناوخۆ و نەبوونی ئاساییش لە قۆناغێکدا، نەبوونی هەلی کار و بێکاری و هەژاریی و قەیرانی دارایی و نەبوونی مووچەی پێویست و نەدانی مووچە لەکاتی خۆیدا و بێسەروبەرەیی میدیا و پڕکردنی سۆشیال میدیا بە لاپەڕە و هەژماری سێبەری بەرپرسان و پارتە فەرمانڕەواکان و کارکردنیان بۆ وروژاندنی کۆمەڵێک پرسی ناتەندروست، هەروەها پەخشکردنی بێفلتەری دراما و فیلمە بیانییەکان، شیرازەی کۆمەڵگەیان لەڕووی خۆمەڵایەتییەوە دوچاری گرفتکردووە و بەشێکی زۆری خێزانەکانیانی ڕووبەڕووی گرفتاری و کێشە کردووەتەوە، تاکیش لەسایەی ئەم دۆخەی کە دروستکراوە، لە بارێکی دەروونیی نائارام و ناجێگیردا دەژیت، حاڵەتەکانی خۆکوشتنی مامۆستا و خوێندکار و کاسب و نەدار و بێکارانی ئەم هەرێمە کە ڕۆژانە گوێبیستیان دەبین، بەشێکی دەرەنجامی ئەو دۆخە نەخوازراوەیە کە هەیە، تەنانەت گرفتە خێزانییەکان و تێکچوونی شیرازەی خێزانیش بەشێکی پەیوەستە بەو بارە نەخوازراوەی کە هەیە، چونکە تا ئێستاش نەتوانراوە ئەو دیاردە دزێوانەی کە لە سۆشیال میدیادا هەیە بە یاسا چارەسەر بکرێت و کار بۆ کۆنترۆڵکردنیان بکرێت، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە، هێزە دەسەڵاتدارەکان،

نەیانتوانیوە تەبایی گشتگیر لە کۆمەڵگەدا بخولقێنن، بەپێچەوانەوە، هەوڵی تۆخکردنەوەی خێڵگەرایی و هۆزگەرایی و ناوچەگەرێتی فرەوەلائییان داوە، بەمەش زۆر جار لەبری دروستکردنی یەکگرتوویی نیشتمانی، ناکۆکی و دووبەرەکییان زیاتر کردووە. کۆچی بەلێشاوی گەنجان و هاوڵاتیان بەگشتی، ئەو ڕاستییە دووپات دەکەنەوە کە تاک ئینتیمای بۆ نیشتمانەکەی نەماوە لە سایەی ئەم دەسەڵاتەدا، کۆچێک پتر لە سەرهەڵگرتن دەچێت بە ڕێگای مەرگ و مان و نەماندا، تا کۆچێکی ئاسایی؛ خنکان و تیاچوون و ڕەقبوونەوەی سەدان هاوڵاتیی ئەم هەرێمە گەواهیدەری حاشاهەڵنەگری ئەو ڕاستییەن.

بەدیوێکی تردا، بوونی ئەو ڕۆتین و بیرۆکراسیەتە زۆرە کە لە دامودەزگاکاندا هەیە، بەتایبەت خزمەتگوزارییەکان، لەگەڵ ئەوەی بووەتە هۆی بەهەدەردانی سامانی گشتی و زایەدانی توانا و کاتی هاوڵاتیان، هۆکاری سەرەکییش بووە بۆ زیادبوونی دیاردەی بەرتیلدان و بەرتیلخواردن و واستەکاری و خزمەخزمێنە و گەندەڵی.

لەلایەکی ترەوە ئەو جیاوازییە زۆرەی لە نێوان چینی بەرپرسان و خەڵکی ئاساییدا هەیە جۆرێک لە چینایەتیی زەقی دروستکردووە و ئاشتەوایی کۆمەڵایەتیشی لاواز کردووە، بە جۆرێک لە ئەگەری ڕوودانی هەر ناڕەزایەتییەک و تەقینەوە و خۆپیشاندانێکدا، ماڵی بەرپرسان، ئەگەر پاسەوانیی توندوتۆڵ نەبێت، مەترسیی هێرشبۆکردنیان زۆرە و نموونەی لەو حاڵەتانەش بوونی هەیە. ئەمەش دەلالەتە لە بێزاری خەڵک بە گشتی لە دەسەڵات.

بەواتایەکی تر، دەسەڵات لە ماوەی ئەم سی ساڵەی حوکمڕانیی خۆیدا نەیتوانیوە وەلا و ئینتیما لەنێو تاک و کۆمەڵگەدا دروست بکات، بە جۆرێک نەک دەسەڵات، بەڵکوو دامودەزگا فەرمییەکانیش بە هی خۆیان و نەوەکانی ئایندە بزانن، بەپێچەوانەوە، لە کاتی هەر شڵەژان و خۆپیشاندان و ناڕەزایەتییەکدا، یەکەم شوێن کە بەر شاڵاوی گەنجان کەوتووە، دامودەزگا فەرمییەکان بوون، چونکە گەنجێک کە لە سەردەمی حوکمڕانی ئەم دەسەڵاتەدا چاوی بە دونیا هەڵهێناوە، بێهیوا کراوە و بێکاری یەخەی گرتووە و هیچ ئاسۆیەکیش بۆ ئایندە لەلای ڕوون نییە، بۆیە یان هەوڵی هەندەران دەدات، یاخود بیر لە دەربڕینی ناڕەزایەتی دەکاتەوە بەو شێوەیەی کە ڕەنگە لای بەرپرسان پێشبینیکراو نەبێت.

## چوارەم: لەڕووی ئابوورییەوە:

دۆخی ئابووری هەرێمی کوردستان دۆخێکی ناجێگیری هەیە و بەدەست چەندین گرفتەوە دەناڵێنێت، دیسانەوە فەلسەفەی ئابووری لێرە ڕوون نییە.

هەرێمی کوردستان لە سی ساڵی ڕابردوودا زنجیرەیەکی درێژ گرانی و سەختی و قەیرانی دارایی و بێکاریی و هەژاریی و نەداریی هاوڵاتیانی بەخۆیەوە بینیوە، ئەمانە

هۆکاری گەورە لە پشتییانەوە بووە، بەشێکی گەورەی هۆکارەکان پەیوەست بوون بە شێوازی ئیدارەدان و بوونی گەندەڵی و بەشبەشێنەی کۆمپانیا و کەرتی تایبەت لە نێوان پارتە فەرمانڕەواندا و نەبوونی سانسۆری کارا، ئەمە لەپاڵ هۆکارە کارگێڕیی و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکانی تر کە جەستەی فەرمانڕەوایەتی هەنووکە پێیانەوە دەناڵێنێت.

بەڕوونی دیارە کە یەکێک لە هۆکارەکان ئەو سیستمە پەیڕەوکراوەیە، کە چینێکی بردووەتە ئاسمان؛ کە کەمینەیەکی لەسەررژاوە، چینەکەی تریش، کە زۆرینەی هاوڵاتیانی لەبەربڕاون؛ چینی هەژاران و کەمدەستانن و چاوەڕێی دەستی کەمینەیەکی چاوچنۆکن، کەمینەیەک زۆربەی، یان سەر بە پارتە فەرمانڕەواکانن، یاخود بە پاڵپشتیی ئەوان کار دەکەن، بەڵکوو کۆمپانیاکان و کەرتی تایبەتیش زۆربەیان، پاشکۆی پارتەکانی دەسەڵاتن، ئەمەش دەروازەی بۆ گەندەڵیی دارایی خۆش کردووە، چونکە زۆربەی تەندەری پرۆژە گەورە و مامناوەندی و گچکەکانیشە هەر بۆ ئەوان دەبێت و دابەشکاریی بۆ دەکرێت. ئەمە وێڕای نەدانی باج و ئەرکە داراییەکانی سەرشانیان و چاوپۆشیکردن لێیان لەلایەن حوکومەتەوە. لەملاشەوە هەرچی باج و سزا و غرامە و ئەرکە داراییەکانی تری سەر هاوڵاتیی ئاساییە، چەند هێندە کراوە و بارگرانییەکی زۆری بۆ هاوڵاتیان دروستکردووە.

لەلایەکی ترەوە، کاتێک حکومەتی هەرێمی کوردستان بڕیاری ئابووریی سەربەخۆی دا، نەیتوانی ئەرکەکەی بە سەرکەوتووانە جێبەجێ بکات و شەفافانە و لێزانانە کارەکانی ئەنجام، بە بەڵگەی ئەوەی چەندین گرێبەستی ناتەندروستی لە بواری نەوت و گازدا ئەنجامداوە، کە بارگرانییەکی گەورەی دروستکردووە، لەلایەک، لەلایەکی ترەوە، جگە لە چەند بەرپرسێکی کەمی دەسەڵاتدار، تەنانەت پەرلەمان و پەرلەمانتارانیش وردەکاری ئەو گرێبەستانە نازان، ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئەم هەنگاوە بوو بەهۆی بڕینی بەشە بودجەی هەرێم لە بەغداوە، هەرێمیش تا هەنووکە نەیتوانیوە گرفتە داراییەکانی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەغدا ساغ بکاتەوە، بە جۆرێک کە لە سوودی هاوڵاتیان و ئەزموونەکەشدا بێت.

لەلایەکی ترەوە، هەرێمی کوردستان نزیکەی هەشت ساڵە یاسای بودجەی نییە و پلان و پرۆژەکانی ڕوون نین و لەسایەی نەبوونی ئەو یاسایەدا، وەکو پێویست بەڕێوەناچن.

بە دیوێکی تردا هەرێمی کوردستان ئابوورییەکی کرێخۆری بێ پلانی هەیە و نەتوانراوە، لەگەڵ دەوڵەمەندیی هەرێم لە ڕووە جیاوازەکانی سامانەوە، سەرچاوەکانی داهات و دارایی هەمەچەشن بکرێن و لە دۆخێکی وەکو کاتی هەرزانبوونی نەوتدا، کە سەرچاوەی سەرەکیی داهاتە، هەرێم دوچاری گەورەترین قەیرانی دارایی بووەوە و هاوڵاتیانی خۆی بە سەختترین قەیراندا برد، کە تەنانەت نەیتوانی مووچەی مووچەخۆرانیش دابین بکات؛ جارێک بە بڕین و جارێک بە پاشەکەوت و جارێکی دی بە نەدان و جارێکی دی بەناوی خۆگونجاندن و بەپێی

گیرفان، مافی ڕەوای خەڵکیان لە مووچە و شایستەی دارایی دەخوارد. ئەمەش ناڕەزایەتی گەورەی مووچەخۆران و چەندین لێکەوتەی نەخوازراوی بەدوای خۆیدا هێنا.

لەڕوویەکی ترەوە، نەزانی بەڕێوەبردنی ڕاژەی گشتی و هەوڵدانی دوو پارتە فەرمانڕەواکەی هەرێم، وایکرد لە قۆناغێکدا بە لێشاو و بەبێ فلتەر و پێوەری زانستی و کارگێڕی و پێویستی دامودەزگاکان و بۆ ڕاکێشانی وەلای خەڵکی و ڕازیکردنیان، سەدان هەزار خەڵک لە کەرتی گشتیدا دامەزرێنرا، کە بەم هەنگاوە ناستراتیژییە نازانستییە کەمەرشکێنە، حکومەت هەڵاوسانێکی وەزیفیی وای بۆ دروستبوو، کە تا هەنووکە چارەسەری نەکراوە، چونکە لەلایەکەوە ئەم هەنگاوە کەرتەکانی تری وەکو کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و ..هتد، خاڵی کرد لە کەسانی پسپۆڕو شارەزا و بە ئەزموون و هێنانی لە بوارێکی تر و لەسەر مێز و کورسییەک دانیان کە شارەزاییان لێی نەبوو، بەمەش کەمەری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری شکان و لادێکانی بەرە و چۆڵبوون برد، لەبری ئەوەی پلانی ئاوەدانکردنەوەیان دابنێت. لەلایەکی ترەوە، دەسەڵاتداران بەم کارەیان بارگرانییەکی زۆریان لەسەر بودجەی گشتی دروستکرد و بێکاریی ڕووپۆشکراویان کرد بە ئەمری واقیع، بە جۆرێک کە ئەگەر تەنها سێیەکی فەرمانبەران دەوام بکەن، دەتوانن دامودەزگاکانی حکومەت بە باشی بەڕێوە ببەن. لەلایەکی ترەوە، بەشێکی زۆری کادیر و کەسانی حیزبی بە ناشایستەیی مووچەی خانەنشینییان بۆ بڕایەوە، ئەمە وێڕای ئەوەی کە کەسانێکی زۆر لەژێر ناوی فەرمانبەردا مووچە وەردەگرن بەبێ ئەوەی ڕۆژێک دەوامی ئاسایی بکەن، ئەمەش دیاردەی «فەرمانبەری بندیواری» کردە مۆتەکە بەسەر بودجەی گشتی و خەڵکیشەوە، کە تا ئێستا ئیرادەیەکی بەهێز نییە بۆ لابردنی ئەو بارگرانییە ناڕەوایە بەسەر دارایی گشتییەوە و چارەسەر نەکراوە.

لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا سندوقی خانەنشینی فەرمانبەرانی دەوڵەت دانەمەزرێنراوە، کە بەپێی یاسای ژمارە (٢٧)ی ساڵی (٢٠٠٦)ی هەموارکراو، دەبوایە دروست بکرێت. ئەم ئەزموونە لەم ڕووەوە لە هیچ شوێنێکی دونیا بەو شێوەیە نەبینراوە!

وێڕای هەموو ئەمانە، داهاتی ناوخۆش پشکێکی زۆری بۆ هەردوو پارتی فەرمانڕەوا دەچێت و ناگەڕێتەوە خەزێنەی گشتی، ئەمەش گەورەترین زەنگی مەترسییە بۆ سەر ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێمی کوردستان. لەپاڵ ئەمانەشدا قاچاخچێتیش مۆتەکەیەکی ترە کە ئابووری هەرێمی لاواز کردووە و تا ئێستا نەتوانراوە سنووری بۆ دابنرێت، کێشە گەورەکەش ئەوەیە کە ویستێکی ڕاستەقینە نییە بۆ نەهێشتنی ئەو دیاردە قێزەونە، بەڵکوو زۆرجار دەوترێت بەرپرسانی حیزبی لەپشت ئەم کارەوەن. ئەوەشمان بیر نەچێت کە بوونی ڕۆتین و بیرۆکراسیەتی زۆر، بەتایبەت لە دامودەزگا خزمەتگوزارییەکاندا، بووتە هۆی بەهەدەردانی سامانی گشتی، وێڕای زایەدانی توانا و کاتی تاکی هاوڵاتی.

## پێنجەم: لەڕووی دەستووری و یاسایی و دادوەرییەوە:

گەورەترین گرفت کە تا ئێستا هەرێمی کوردستان پێوە دەناڵێنێت نەبوونی دەستوورە؛ دەستوورێک بتوانێت شێوازی سیستمی فەرمانڕەوایەتی دیاری بکات و ماف و ئازادییەکان بە ڕوونی دیاری بکات و پەیوەندیی نێوان دامەزراوەکانی فەرمانڕەوایەتی دیاری بکات و پسپۆڕی و کار و دەسەڵاتەکانیان بنەخشێنێت. بە جۆرێک کە ببێتە حەکەم و لایەنەکان لە ململانێکانیاندا بۆی بگەڕێنەوە و دەروازەیەکی گرنگ و یەکلاکەرەوەی زۆرێک لە گرفتە و ناکۆکییەکان بێت و ببێتە بەردی بناغەی ئەو یاسایانەی کە لە پەرلەمانەوە دەردەچن، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە ڕەشنووسێک هەیە، بەڵام کارەکانی نەگەیشتووە بە پایان.

> **دەسەڵات لە ماوەی ئەم سی ساڵەی حوکمڕانیی خۆیدا نەیتوانیوە وەلا و ئینتیما لەنێو تاک و کۆمەڵگەدا دروست بکات، بە جۆرێك نەك دەسەڵات، بەڵکوو دامودەزگا فەرمییەکانیش بە هی خۆیان و نەوەکانی ئایندە بزانن**

لەلایەکی ترەوە، یاساکان لە هەرێمی کوردستان فەلسەفەیەکی ڕوونیان لەپشتەوە نییە، دەزگای یاسادانانیش ڕۆڵەکەی کارا نییە، هێندەی جێبەجێکاری ئەجێندای پارتە دەسەڵاتدارەکان بووە، هێندە ڕەوتی یاسای بابەتییانە و وەڵامدەرەوەی خواستەکانی کۆمەڵگە نەبووە، هەندێک لەو یاسایانەش کە دەرچوێندراون، نەچوونەتە بواری جێبەجێکردنەوە، یاخود هەندێک یاسا خۆیان دەروازەیان بۆ گەندەڵی و بەهەدەردانی موڵک و سامانی گشتی خۆشکردووە، بۆ نموونە یاسای وەبەرهێنان.

واتە دەسەڵاتی یاسادانان لە هەرێمی کوردستان دەسەڵاتێکە، لە زۆربەی قۆناغەکاندا، وەکو دەزگایەکی شەرعیەتدەر بەو یاسا و کار و ڕێکارانە ڕۆڵی بینیوە، کە پارتە سەرەکییەکانی پێکهێنەری حکومەت دایانڕشتووە و نەیتوانیوە هاوسەنگی لە نێوان خۆی و حکومەتدا دروست بکات، یان بە واتایەکی تر، نەیتوانیوە ئەرکی دووەمی وەک پێویست جێبەجێ بکات، کە -دوای یاسادانان- چاودێریکردنی کارەکانی حکومەتە، بەڵکوو زۆربەی کات وەڵامی پرسیارەکانیشی نەدراوە و بانگهێشتکردنیشی بۆ بەرپرسانی حکومی زیاتر میوانداری بووە، تا پرسیارکردن و لێپێچینەوە، چجای متمانە لێسەندنەوە!

لەڕوویەکی ترەوە پەرلەمانی کوردستان، لە یاساکانیدا جۆرێک لە ڕەوایەتی بە

دوو ئیدارەیی شاراوە داوە، تەنانەت لە یاساکانیشدا جێی زاراوەی ئەدەبیاتی هەدوو پارتی حکومڕان کراوەتەوە بۆ ڕازیکردنیان و نەیتوانیوە هەموو زاراوەکان یەکبخات و فەرهەنگێکی سەربەخۆی یاسایی تایبەت بەخۆی بنیات بنێت، بەڵکوو لەلایەکی ترەوە تا هەنووکەش بەشێک لەو زاراوانەی کە لە یاساکاندا بەکاردەهێنرێت، هەر عەرەبین، یاخود کراون بە ئینگلیزی، لەبری ئەوەی بە کوردی ڕەوان وشەی بۆ دابنێن. نموونەیەکی زەقی دابەشکاریی یاسایی زاراوەکان، کە بۆ ڕازیکردنی هەردوو لایەنی دەسەڵات دانراوە، ناوی «خوێندکار» و «قوتابی»یە، کە هەردووکیان لە (پڕۆژەیاسای پەروەردە و فێرکاری لە هەرێمی کوردستان – عێراق)دا جێیان کراوەتەوە، لەبری یەکخستنی ناوەکە، هەرچەندە لە ماددەی (١/بڕگەی بیست و دووەم)دا بەجیا ناسێنراون و قوتابی بۆ بنەڕەتی و خوێندکار بۆ سەروو بنەڕەتی تا زانکۆ، دیاری کراوە. لەڕوویەکی ترەوە دامەزراوەی پەرلەمان نەیتوانیوە نوێنەری ڕاستەقینەی هاوڵاتیان بێت، یاخود ئەرکی تەنفیسی سیاسی و کۆمەڵگەیی وەک پێویست بەرجەستە بکات؛ واتە شەڕی شەقامی خەڵک بە ئازادانە لەوێ بکرێت و ئارامیی هاوڵاتیان پارێزراو بێت و هاوڵاتی دڵنیا بێت لەوەی کە نوێنەرەکانی شەڕی قوت و ئازادییەکانیان و مافەکانیان لەژێر گومەزی پەرلەماندا بۆ دەکەن.

لەڕوویەکی ترەوە ئەزموونی دادوەری هەرێمیش بەکۆی گشتی لەژێر پرسیاردایە، سەربەخۆییەکەی، بڕیارەکانی، تەنانەت داواکاری گشتی لە چەندین پرسی جیاوازی پێشێلکاری مافی مرۆڤدا هیچ نابزوێنێت، بەمەش میسداقیەتی خۆی لەدەست دەدات.

دادگاکانیش هەر لەلایەن دوو پارتی دەسەڵاتدارەوە پێکهێنراون؛ دادوەرەکانیش بەگشتی هەر بە تەزکییەی ئەوان دانراون و ئاڕاستە کراون؛ بەواتایەکی دی، بەڕوونی پارتە فەرمانڕەواکان هەژموونیان بەسەر دادگاکانەوە هەبووە و هەیە و لە ململانێ سیاسییەکانیشدا بەکاریان هێناون، تەنانەت بوونەتە شوێنی دەرکردنی فەرمانی دەستگیرکردن بۆ بەرپرسانی پارت و لایەنی تر و چالاکوان و ڕۆژنامەنووسان و سەرکردەکانی ڕا، کە زۆرجار لە شێوەی فشاردا ئەمە کراوە و هەندێکجار جێبەجێش نەکراون. ئەمەش نیشانەی پرسیاری گەورە لەسەر ئەو دامەزراوەیە و کارایی و سەربەخۆییەکەی دروست دەکات. لەلایەکی ترەوە هەندێک لە ڕاپۆرتە نێودەوڵەتییەکان تا ئێستا باس لە بوونی گرتووخانەی حیزبی هەیە، کە مەترسییە بۆ سەر ئازادییەکان و مافی سیاسیی تاک.

## شەشەم: لەڕووی زمانی ستانداردەوە:

ئەزموونی دەسەڵاتداریی هەرێم نەیتوانیوە زمانی ستانداردی کوردی دیاری بکات و لەو ڕووەوە خەمساردییەکی زۆر بەدی دەکرێت. نەتوانراوە بڕیاری سیاسیی بوێرانە لەو ڕووەوە بدرێت و پشت بە ئەکادیمییانی ئەو بوارە ببەسترێت و ڕێگری بکرێت لە ناوچەگەریتی خەونی لەمێژینەی کورد بهێنرێتە دی و زمانی فەرمیی یەکگرتووی نوسین بهێنرێتە کایەوە و کایە سیاسی و ئابووریی و ڕۆشنبیری و ئەدەبی و زانستی و دیپلۆماسییەکانیشی پێ ڕێکبخرێت، دواجار ڕەنگدانەوەی لەسەر یەکگرتوویی کورد هەبێت، لانیکەم لەڕووی زمانی فەرمییەوە، هەروەها ئامرازێک بێت بۆ پاراستنی کولتوور و فەرهەنگ و قوتاربوون لە دەردی خێڵەکیی و ناوچەگەریتی و ئیدی لە دامەزراوە فەرمیی و کارگێڕیی و پەروەردەییەکانیشدا، لەبری دوو زاری زمانی کوردی، کار بە یەک زمانی ستانداردی یەکگرتوو بکرێت و بکرێتە دیفاکتۆ و پەرەسەندنێکی ژیاریی و فەرهەنگی و سیاسی و کۆمەڵایەتییش بهێنرێتە کایەوە.

## حەوتەم: لەڕووی فەلسەفەی حوکمڕانییەوە:

تا هەنووکە لە هەرێمی کورستان فەلسەفەی حوکمڕانی ڕوون نییە؛ نازانرێت چ جۆرە ئاڕاستە و ستراتیژێکی هەیە، هەر جارە و بە بارێکدا و بەبێ پلانێکی گشتگیر و ڕوون کار دەکرێت، تەنانەت لە بوارە گرنگەکانی وەک پەروەردە و فێرکردن و خوێندنی باڵاشدا، نەتوانراوە فەلسەفەیەکی ڕوون هەبێت و زۆرجار بە گۆڕانی وەزیرێک فەلسەفەی خوێندن و پەروەردەش گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەمە ئەگەر لە بنەڕەتدا ئەو فەلسەفەیە بوونی هەبێت. ئایا ئەم ئەزموونە بەم شێوازە لە ئاستی پێویستدا بووە؟ یاخود دەکرا کاری باشت بکرێت؟

دەڵێین: نەخێر ئەزموونێکی پڕ لە کێشە و قەیران و گرفت بووە و دەکرا بە ئەقڵیەتێکی کراوە و گەورەوە حوکمڕانی بکرێت و کۆمەڵگە و ئەزموونەکەشی بەو ئاقارە خراپەدا نەبرێت.

## خستنەڕووی ئەم دیوە تاریکە بـۆ؟

خستنەڕووی ئەم دیوە تاریکە، لە سۆنگەی دڵسۆزییەوەیە بۆ ئەزموونەکە، بـۆ ئەوەیە بەرپرسان ئیدی چاوێک بە ئەزموونی حوکمڕانییاندا بخشێننەوە و هێندەی تر هەنگاوی هەڵە بە ئاڕاستە هەڵەدا نەنێن و بزانن ئەو ڕێگەی لەسەر دەڕۆن مەترسیدارە و دەیان لێکەوتەی نێگەتیڤی لە هەموو کایەکانی ژیانی سیاسی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و کولتووریی و نەتەوەییەوە لێکەوتووەتەوە، بەڵکو خودی کیانەکەش خەریکە دەکەوێتە مەترسییەوە؛ ئیدی کاتی گۆڕانکارییە.

## ڕێگەچارە

چارەسەری ئەم گرفتانە بە گۆڕینی ئەقڵیەتی حوکمڕانی دەبێت، بە بوونی فەلسەفەیەکی ڕوون دەبێت بۆ حوکمڕانی و خزمەتکردنی گشتی، بە نووسینەوەی دەستوورێکی مۆدێرن دەبێت کە سیستمی سیاسی و ئابووری ڕوونبکاتەوە و ببێتە زامنی پاراستنی مافەکان و ڕێکاری گشتی ڕکابەریی و ململانێکانیش دیاری بکات، بە دامەزراوەییکردنی دامودەزگاکان و بەڕێوەبردنیان دەبێت، کە کەسانی شایستە و لێهاتوو بەڕێوەیان ببەن، کەسانێک پیاوی دەوڵەتداری، نەک سیاسەتکردن، بن، واتە بۆ بەرژەوەندیی گشتی و نەوەکانی ئایندەش کار بکەن، نەک بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی حیزبی و بنەماڵەیی و شەخسی و فەرامۆشکردنی نەوەکانی ئایندە و ئایندەی نیشتمان. هەروەها بە هەمەچەشنکردنی سەرچاوەکانی داهات و داڕشتنی پلانێکی ئابووریی درێژخایەنی تۆکمە دەبێت کە بتوانێت هەموو توانا مرۆیی و سامانە سرووشتییەکانیش بخاتە گەڕ و خۆشگوزەرانی بۆ هەموو خەڵک بهێنێت و ژێرخانێکی ئابووریی بەهێز دابمەزرێنێت.

هەروەها لە ڕێگەی دابینکردنی ئاسایشەوە دەبێت، ئاساییش بە واتا فراوانەکەی، لە ڕێگەی دامەزراندنی دامەزراوەی نیشتمانیی پارێزەری هەمووان، کە نەتوانرێت لە ململانێ ناوخۆییەکاندا بەکاربهێنرێن و بڕیار لە دەزگا فەرمییەکانەوە وەربگرن و پارێزەر و خاک و خەڵکی کوردستان بن، بەبێ جیاوازی.

هەروەها لە ڕێگەی دەرهێنانی دەستی حیزبەوە دەبێت لەناو حوکومەتدا و کاراکردنی دامەزراوە فەرمییەکان و پاراستنی شکۆیان. لە ڕێگەی دروستکردنی تەبایی و یەکڕیزیی و دروستکردنی پایە گەورەکانی نیشتمان و نیشتمانسازی و هێنانەدیی خۆشگوزەرانی و بنیاتنانی پەیوەندیی دروست لەگەڵ هەموو لایەک، دەوڵەتان و ڕێکخراوەکان و بەغدا، لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی گشتی و هێنانەدیی ئامانجە نەتەوەیی و نیشتمانییە باڵاکان، بۆئەوەی ئیدی ئەو دیوە تاریکەی حوکمڕانی بڕەوێتەوە و ئاسۆیەکی نوێ بە گزنگی پرشنگدارەوە چاوەڕیی نەوەکانی ئێستا و ئایندە بێت.



نووسینی: د.شەماڵ ئەحمەد ئیبراهیم

# کوردستان، پاش سی و یەک ساڵ، هەڵکشان بەرەو لووتکە!

پێشەکی:

ئەزموونی هەرێمی کوردستان، لە سەرجەم بوارەکانی ژیانکردندا، یەکێکە لەو ئەزموونانەی کە شایستەی ئەوەیە توێژینەوە وهەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت، زۆر بە سادەیی، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە: هەرێمی کوردستان، یەکەم ئەزموونی حوکمڕانیکردنی کوردە لە تەواوی مێژووی هاوچەرخی ئەم نەتەوەیەدا کە توانیبێتی سی و یەک ساڵ بڕ بکات، ئەزموونێکە لەگەڵ هەموو لایەنە جوان و ناشرینەکانیدا، لەم مێژووەدا، بێ هاوتایە لەڕووی ماوەی بەردەوامییەوە، کەواتە لەڕووی مێژووییەوە، گرنگی خۆی هەیە، لەم ئەزموونەدا، کۆمەڵە ڕەفتار و گوتار و کردار و بڕیارێک بەدی دەکرێن، لە داهاتوودا ئەرشیفی ئەم نەتەوەیەن، پێویستە پارێزگاریی لێ بکرێت، ئەگەر جوان بن یان نا.

دواتر لەڕووی مەعریفییەوە، ئەزموونێکی کەڵەکەبووی سیاسەتکردن و پارێزگاریکردنە لە هاوسەنگی هێز لە ناوچەیەکدا کە هەرێمی کوردستان تەنیا بەفەرمی ناسێنراوی کوردانە لەنێو وڵاتانێکدا کە ماف بە بوونی نەتەوەیی کورد نادەن، سەرەڕای ئەمەش توێژینەوە تەنیا دەرخەری لایەنە گەشاوەکانی ئەزموونەکە نییە، بەڵکو کەلێنە قووڵ و تاریکەکانیش، ماددەیەکی باش و پڕبەهای توێژینەوەکانە، ئێمەش مرۆڤین و دەشێت هەڵە بکەین، گرنگ ئەوەیە سوود لە هەڵەکان وەربگیرێن. ئومێد دەکرێت، لە داهاتوودا، ئەو کەلێن و ئاستەنگانە لەڕێگای دامەزراوەکانەوە چارەسەر بکرێن.

کوردستان لەڕێگای هەڵکشان بەرەو لووتکە، ئامانجی ئەوەیە کە دیوە گەش و تاریکەکانی ئەم ئەزموونەی هەرێمی کوردستان لە ڕوانگەی پێنوێنەکانی گەشەپێدانی مرۆییەوە هەڵبسەنگێنێت، کە کۆمەڵە پێنوێنێکی دیاریکراوی ستانداردی جیهانین، بۆ نموونە: خۆشگوزەرانی، تەندروستی، بواری خوێندن، ئەم پێنوێنانە، پێویستیان بە داتا و ئاماری ورد هەیە بۆئەوەی ئەنجامی ڕاست بدەن بەدەستەوە، بۆیە هەوڵێکی نموونەییە ئەگەر بتوانێت ئەو ئەرکە بەجێ بگەیەنێت. ئامانجیش ئەوەیە کە بزانین ئێمە لەکوێی هاوکێشە مرۆییەکەداین؟ پێویستە لە کوێوە وچۆن و بەرەوکوێ هەنگاو بنێین؟ پرسیارە سەرەکییەکانی ئێمە ئەوەیە کە: ئێمە پاش سی و یەک ساڵ چەند هەنگاومان بڕیوە بەرەو لووتکە؟ سست بووین یان خێرا؟ هۆکار و ئالەنگارییەکان، پاڵنەر و پشتگیرییەکان، کامانەبوون؟

ئێمە لەم توێژینەویە پێمانوایە کە» دامەزراوە نیشتمانییەکان توانای بەڕێوەبردن و کاراکردنی شانەکانی چارەسەریان دەبێت ئەگەر لەژێر هەژموونی کاریگەری توخمە لاوەکییەکاندا نەبن، بەڵام ئەمە تاوەکو ئێستا لەهەرێمی کوردستان نەهاتووەتە دی و هەر ئەوەش هۆکاری چەقبەستوویی ئەزموونی هەرێمە لە بوارەکانی گەشەپێدان و حوکمداریکردنی پێگەیشتوودا»

ئەم توێژینەوەیە لە دوو بەش پێکدێت، بەشی یەکەم تەرخانکراوە بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکە بەکارهاتووەکانی ناو توێژینەوەکە و یەکخستنی تێگەیشتنی خوێنەر لەو چەمکانە، بەشی دووەم هەڵسەنگاندنی ئەزموونی هەرێمی کوردستانە بەپێی ئەو چەمکانەی کە پێشتر و لە بەشی یەکەمدا ڕوونکراونەتەوە و باس لە ڕەوشی گەشەپێدانی مرۆیی دەکات لە هەرێمی کوردستاندا و ئامانج لێی دیاریکردنی پێگەی هەرێمە بەپێی پێوەرە ستانداردەکان. لەکۆتایدا توێژینەوەکە ڕاسپردە و ئەنجامەکانی دەخاتە ڕوو، لەگەڵ ئەو سەرچاوانەی کە توێژەر سوودی لێ بینیوون بۆ نووسینەوەی ئەم بەرهەمە.

### ١. چەمکە بەکارهاتووەکان

لەم بەشەدا، توێژینەوەکە هەوڵ دەدات کە دوو چەمکی سەرەکی و دوانی دیکەی لاوەکی ڕوونبکاتەوە، چەمکە سەرەکییەکان بریتین لە: دامەزراوە نیشتمانییەکان و پێکهێنەرە لاوەکییەکان، چەمکە لاوەکییەکان بریتین لە: گەشەپێدانی مرۆیی و پێنوێنەکانی گەشەپێدانی مرۆیی لەم دوو پارەی خوارەوەدا:

### ١-١. چەمکە سەرەکییەکان

مەبەستمانە لەم بەشەدا باسێک لە دامەزراوە نیشتمانییەکان و پێکهێنەرە لاوەکییەکان بکەین و بیانناسێنین، تاوەکو لە داهاتوودا، لە ساتی بەکارهێنانی چەمکەکان لەناو توێژینەوەکەدا بزانرێت مەبەست لێیان چییە؟ بەچی دەوترێت دامەزراوە نەتەوەییەکان و کامانەن توخمە لاوەکییەکانی دەرەوەی دامەزراوە نەتەوەییەکان.

### ١-١/١. دامەزراوە نیشتمانییەکان

دامەزراوەکان بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لەو ئامرازەی کە دادەمەزرێت بەمەبەستی ئەنجامدانی ئەرکێکی دیاریکراو، بۆ نمونە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییەک بەپێی کۆمەڵە پێوەرێکی پەسەندکراو لەلایەن کۆمەڵگاوە، هەروەها دەوترێت کە دامەزراوەکان بریتین لەو ڕێکخراوانەی کە بەمەبستی بەدەستهێنانی ئامانجێک یان زیاتر دادەمەزرێن و کار بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە دەکەن، بۆ نمونە لەوانەیە ئامانجەکان فێرکاری یان کارگێڕی یان کۆمەڵایەتی یان سیاسی یان ئابووری...هتد، بێت(١).

هەروەها دامەزراوەکان بەبێ ڕەچاوکردنی جیاوازی لە ئەرک و فەرمانەکانیاندا، چەندین ئامانجی هاوبەشیان هەیە، ئەو ئامانجانە ڕەچاوی ئەوە ناکات کە مەبەست لە دامەزراوەکان بەدیاریکراوی چییە، چونکە لێرەدا هەموو دامەزراوەیەک هەوڵی بەدیهێنانی دەدەن بۆ نمونە: گەشەپێدانی توانا مرۆیی و ماددی و داراییەکان، کەمکردنەوەی تێچووەکان لە بواری کات و شوێن و داراییەوە بە تایبەتی کە لە ئێستادا کات وەکو یەکێک لە تێچووەکان ئەژمار دەکرێت و باشترین نمونە حکومەتی ئەلەکترۆنییە، کە تیایدا کەمترین کات بەفیرۆدەچێت، لەگەڵ ئەمەشدا یەکێک لە ئامانجە هەرە گەورەکانی دامەزراوەکان بریتییە لە ناساندن و پشتگیریکردن و برەودان بە بەهاکانی دامەزراوەکە لە ڕووی مرۆیی و دارایی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و...هتد(٢).

دامەزراوە نیشتمانییەکان ئەو دەسەڵاتانەیە کە لەڕووی (بوار و کاریگەری)یەوە لەسەر ئاستی سنووری نیشتمان و هاونیشتمانیان کارەکانی بەڕێ دەکات، کەواتە سنووری دامەزراوە نیشتمانییەکان تەواوی ڕووبەر و سەروەری دەوڵەت دەگرێتەوە، هەروەها کاریگەرییەکانی بەسەر تەواوی هاونیشتمانیانی دەوڵەتدا دەبێ، بەبێ جیاوازی ڕەگەز و

توخم و نەتەوە و ئاین و ئایدۆلۆجیا. کاتێک کە باس لە دامەزراوە نیشتمانییەکان دەکەین مەبەستمانە دوو لایەن ڕوونبکەینەوە کە بریتین لە بنەما و ئەرکی ئەو دامەزراوانە، بۆ نمونە: دامەزراوەی یاسادانان، بنەماکەی بریتییە لە بنەمایەکی یاسایی و ڕەوایەتییەکی کۆمەڵایەتی ئەو دامەزراوەیە و ئەرکەکەی بریتییە لە یاسادانان، ئەم نمونەیەش بۆ هەموو دامەزراوە نیشتمانییەکان ڕاستە.

خشتەی ژمارە (١)ی خوارەوە ڕوونیدەکاتەوە کە مەبەست لە دامەزراوە نیشتمانیی و پەیوەندی نێوان مەودا و کاریگەری و بنەما و ئەرکی دامەزراوە نیشتیمانییەکان چییە.




### ١-٢/١. پێکهێنەرە لاوەکییەکان

مەبەست لەم پێکهێنەرانە، ئەو دامەزراوە لۆکاڵییانەن کە لەوانەوە دامەزراوە نیشتمانییەکان دروست دەبن، بەشێوەیەکی گشتی خۆیان لە: پارتە سیاسییەکان، «ڕیکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و پیشەییەکان دەبیننەوە، پارتە سیاسییەکان بریتییە لە کۆبوونەوەیەکی ئازادانەی کۆمەڵە کەسێک بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجێک یان چەند ئامانجێک کە دەشێت خۆپاڵاوتن بۆ بوون بەئەندام لە ئەنجومەنەکانی یاسادانان لەناو سیستەمێکی دیموکراسیدا یەکێک بێت لە ئامانجەکانی ئەو پارتە سیاسییانە»(٣).

پارتە سیاسییەکان ئەو سەکۆ ڕاستەقینەیەیە کە تیایدا ئەندامانی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە و ئازادانە دەتوانن گوزارشت لە ویست و داخوازییەکانی خۆیان بکەن، لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا پارتە سیاسییەکان خاوەن بەرنامەی تۆکمەن و بە یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی کۆمەڵگە فرەییەکان ئەژمار دەکرێت، لە هەمانکاتدا دەشێت پارتە سیاسییەکان

ئەو ڕایەڵەی بەیەکگەیشتنەبن کە کۆمەڵگە و دەسەڵات بەیەکتر دەگەیەنێت و دەبێتە هۆی بەدیهێنانی ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی لەڕێگای گواستنەوەی داخوازییەکانی کۆمەڵگا بۆ دەسەڵات و ڕەوایەتیدان بە بڕیارەکانی دەسەڵات لەناو کۆمەڵگا پێگەیشتووەکاندا(٤).

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیی و پیشەییەکان، ئەو دامەزراوانەن کە دەتوانن خۆیان بگەیەننە زۆرترین ژمارەی ئەو هاوڵاتییانەی کە خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکانیان بۆ دەستەبەر نەکراوە، ئەم ڕێکخراوانە ڕەگەزێکی سەرەکین لە بواری بەدەستهێنان و دەستەبەرکردنی دادوەری کۆمەڵایەتی، بۆیە بەوە دەناسرێنەوە کە لە کۆمەڵە دامەزراوەیەکی لاوەکی پێکدێت وەکو ئەنجومەنە خۆجێیەکان و سەندیکاکانی کرێکاران و پیشەوەران و ژووره بازرگانی و پیشەسازییەکان و ئەو دامەزراوانەی دیکە کە هاوتای ئەمانەن، کەواتە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی وەکو: خێزان و خێڵ و هۆز و پێکهاتە مەزهەبی و ئاینیی و ئەتنییەکان لەچوارچێوەی کۆمەڵگای مەدەنیدا نین، هەروەک چۆن دامەزراوەکانی کۆمەڵگای سیاسی و حکومییەکان ناچنە ناو چوارچێوەی ئەم پێناسەیەوە، بەڵام ئەوەش ئەمە ناگەیەنێت کە دابڕانێکی تەواو هەیە لە نێوان ئەم سێ کۆمەڵگایەدا (کۆمەڵگای کۆمەڵایەتی، کۆمەڵگای مەدەنی، کۆمەڵگای سیاسی)، بەڵکو دواجار ئەو کۆمەڵگایانە کاریگەرییان بەسەر یەکدییەوە هەیە(٥).

### ١-٢. چەمکە لاوەکییەکان

دوو بابەت کە کاریگەرییان لەسەر دامەزراوەکان هەیە، کە ئەوانیش گەشەپێدانی مرۆیی و پێنوێتەکانی گەشەپێدانی مرۆیین و لێرەدا باسیان دەکەین.

### ١-٢/١. گەشەپێدانی مرۆیی

گەشەپێدانی مرۆیی، یەکێکە لەو بابەتە نوێیانەی کە بوارێکی فراوانی بیرکردنەوە و نووسین و ڕاهێنانی بیرمەندان و نووسەرانی بواری کارگێڕی داگیرکردووە لەم سەردەمەدا؛ هۆکاری ئەو گرنگییەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سەروەتی ڕاستەقینەی هەر دەوڵەتێک بریتییە لە سەرمایەی مرۆیی ئەو دەوڵەتە؛ بۆیە دەوڵەتان پێویستە پابەندبن بەوەی کە تەمەنێکی درێژ و تەندروستییەکی تەواو و ژیانێکی شایستە بۆ هاوڵاتیانیان دابین بکەن. بەدیهێنانی گەشەپێدانی مرۆیی پێویستی بە گرنگیدانە بە تواناکانی تاکی هاوڵاتی لە ڕێگای: بەرەوپێشبردنی تواناکانی تاک و وەبەرهێنانی لەو توانایانەدا کە تاک هەیەتی، بەوەش دەتوانین لە سەرجەم بوارەکانی؛ تەندروستی و فێرکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی تاک بەرزبکەینەوە، ئامانج لەم پرۆسەیە گرێدانی سەرمایەی ئابووریی و مەعریفیی تاکە لە بوارەکانی ژیاندا کە دواتر ئەوەش کاریگەری دەکاتە سەر بەرزبوونەوەی ئاستی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگە. پرۆسەی گەشەپێدانی مرۆیی پرۆسەیەکە تیایدا مرۆڤ

سەنتەرە، بەڵام بەرهەمی ئەم سەنتەرییە لە کۆمەڵگەدا ڕەنگ دەداتەوە(٦).

دەتوانین بڵێین کە گەشەپێدانی مرۆیی بریتییە لە پرۆسەیەکی بەردەوام لە گەشەپێدان، ئامانجی وەبەرهێنانە لە تواناکانی مرۆڤدا لەڕێگای باشترکردنی ئاستی خوێندەوارییی و تەندروستی و خۆراکییاندا، مەبەستی سەرەکی لەم پرۆسەیە باشترکردنی توانا و لێهاتووییەکانیانە بە ئومێدی زیادکردنی بەرهەم و گەشەپێدانی ئابووریی و دابەشکردنیان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بەسەر هەموو ئەندامانی کۆمەڵگەدا، کە ئەمەش گەرەنتی بەشداربوونیانە لەم پرۆسەیەدا و دواتر پێکەوە گەشەپێدانی ئابووری بەردەوامی پێدەدەن(٧).

**١-٢/٢. پێوێنەکانی گەشەپێدانی مرۆیی**

پێوێنەکانی گەشەپێدانی مرۆیی، بریتییە لە پێوێنێکی نێونەتەوەیی، دیاریکردنی ئاستی خۆشگوزەرانی دانیشتوانی وڵاتانی گۆی زەوی بە ئامانج دەگرێت، بەرنامەی گەشەپێدانی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNDP) گرنگی بەو پێوەرانە دەدات، هەروەها ساڵانە ڕاپۆرتی تایبەت بەو مەبەستە بڵاودەکاتەوە، ئەم پێوێنە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە کۆمەڵە پرسێکەوە هەیە کە تەواو گرۆیی مرۆیی پێیەوە گرێدراوە وەک: ڕێژەی خوێندەواری، تەمەن، نەخوێندەواری وئاستی بژێوی ژیانی هاوڵاتیان، تەواوی وڵاتانی جیهان لەناو پێوێنەکانی گەشەپێدانی مرۆییدا خۆیان دەبیننەوە چەند وڵاتێک نەبێت کە عێراق یەکێکە لەو وڵاتانە. بەشێوەیەکی گشتی ئەو پێوەرانەی کە لەم بوارەدا بەکاردێن دەکرێن بە دوو بەشەوە کە بریتین لە پێوەرە ژمێراوەکان کە: هەژاریی و خوێندەوارییی و تەندروستی، لەخۆی دەگرێت، لەگەڵ پێوەرە نەبژێراوەکان کە: یەکسانی و ڕێگەپێدان و بەردەوامبوون لەخۆی دەگرێت(٨).

خشتەی ژمارە (٢) ڕوونکردنەوەی پەیوەندی نێوان چەمکە بەکارهاتووەکان:



## ٢. هەڵسەنگاندنی ئەزموونی هەرێمی کوردستان

پاش تێپەڕبوونی سی و یەک ساڵ بەسەر ئەزموونی هەرێمی کوردستان، جێگای خۆیەتی کە پێنوێنەکانی گەشەپێدانی مرۆیی بکەین بە سەرەتایەک بۆ پێوانەکردنی ئاستی دامەزراوەکانی هەرێمی کوردستان. هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە جیهانی ٢٠٢٢ هەمان جیهانی ١٩٩١ نییە، پاساوەکانی دروستبوونی هەرێمی کوردستان لە ١٩٩١، بۆ ئێستای هەرێمی کوردستان شیاو نین، بەردەوامبوونی ئەزموونی هەرێمی کوردستان پەیوەندی بەو پڕۆژە و ئەرکانەوە هەیە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە بوارەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی هەژاریی و نەخوێندەواری و پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری تەندروستیدا ئەنجامی دەدات، لەگەڵ ئەمانەدا هەوڵدانە بۆ خوێندنەوەی بەدیهێنانی چەمکەکانی وەک دادپەروەریی و یەکسانی لە بەدەستهێنانی هەلیکار و بەردەوامی خزمەتگوزارییەکان، بۆ شیکردنەوەی ئەم بابەتانە باس لە دوو تەوەر دەکەین بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

### ٢-١. پێنوێنەکانی گەشەپێدانی مرۆیی بەپێی داتاکانی حکومەتی هەریمی کوردستان

سەرجەم ئەو بوارانەی کە لێرەدا باس دەکرێن بریتین لە (هەژاری –داهات، خوێندەواری – هەلی خوێندن، کەرتی تەندروستی – ڕووبەڕووبوونەوەی شانەی قەیرانەکان) بۆ ئەم بابەتەش پشتمان بە: ڕاپۆرت و داتاکانی هەرچوار وەزارەتی (کاروباری کۆمەڵایەتی، پەروەردە و خوێندنی باڵا و تەندروستی) بەستووە، مەبەست لەم بابەتە، پێوانەکردنی هەنگاوەکانی ئەو سێ وەزارەتانەیە لە هەرێمی کوردستان، لەو سێ بوارەی کەباسی لێوە دەکەین.

### ٢-١/١). هەژاری

هەژاری یەکێکە لەو دەردە کوشندانەی کە تواناکانی کۆمەڵگە لەناو دەبات، مەبەست لە هەژاری بەپێی پێوەرە ستانداردەکان ئەو کەسە کە داهاتی ڕۆژانەی (١.٩$) دۆلار بێت، واتە ئەو کەسەی کە داهاتی لەخوار ئەو بڕە داهاتەوەیە دەکەوێتە خوار هێڵی هەژارییەوە، کاتێک باس دێتە سەر هەرێمی کوردستان کێشەکە لەوەدایە کە دامەزراوەکانی هەرێمی کوردستان داتا نوێیان نییە سەبارەت بەڕێژەی هەژاری، کێشەیەکی دیکە ئەوەیە کە ئەو داتایانەی کە لەلایەن دامەزراوەکانەوە دادەنرێن کێشەی ڕاستاندنیان هەیە، دیارترین نمونە سەبارەت بەم بابەتە، کاتێک کە باس لە کێشەی هەژاری و ڕێژەکەی دەکرێت لە هەرێمی کوردستان، تاکە سەرچاوە کە باسی دەکات دەگەڕێتەوە بۆ بەرواری ٢٠٢٠/١٠/١٠، کە تیایدا دارا ڕەشید وەزیری پلاندانانی عێراق و پارێزگای سلێمانی لە ڕاگەیاندنێکی ڕۆژنامەوانیدا باس لەوە دەکەن کە ڕێژەی هەژاری لە هەرێمی کوردستان نزیکەی ٩٪

نۆ لەسەدە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بەوە بدەن کە چۆن ئەو ڕێژەیە دیاریکراوە لەلایەن ئەو بەڕێزانەوە، ئەمەش کۆمەڵە پرسیارێک سەبارەت بە کێشەی هەژاری دروست دەکات(٩). لە دیارترینیان ئەوەیە کە ئایا ئەو ڕێژەیەی لەو ڕاگەیاندنەدا هاتووە تا چ ئاستێک ڕاستە و پێوەرەکانی ڕاستی ئەو داتایە چییە؟

وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی کاتێک باس لە ڕێژەی بێکاری دەکات، ئاماژە بەوە دەدات کە ڕێژەی بێکاری لەنێو گەنجاندا بەبێ جیاوازی جێندەری ١٣.٥٣٪ دەبێت، هەروەها کۆی گشتی بێکارەکان لە ساڵی ٢٠١٥ لەنێو هەردوو ڕەگەزدا ٦٧٠٠٠ دەبن(٩). بابەتی هەژاری و بێکاری دوو بابەتن کە تەواو پێکەوە گرێدراون، دانانی بەرنامە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەژاری پێویستی بەوە هەیە کە هەلی کار لە بەردەم دانیشتوانی هەرێمدا بڕەخسێنرێت، بەڵام بواری وەبەرهێنان لە هەرێمی کوردستان لەلایەن کەرتی تایبەتەوە و هەروەها کەرتی گشتی نەیتوانیوە ئەو کەلێنە پڕ بکەنەوە.

**سەروەتی ڕاستەقینەی هەر دەوڵەتێک بریتییە لە سەرمایەی مرۆیی ئەو دەوڵەتە؛ بۆیە دەوڵەتان پێویستە پابەندبن بەوەی کە تەمەنێکی درێژ و تەندروستییەکی تەواو و ژیانێکی شایستە بۆ هاوڵاتیانیان دابین بکەن.**

### ٢-٢/١. خوێندەواری

ڕێژەی خوێندەواران یەکێکە لەو پێنوێنانەی کە ئاستی گەشەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ئابووری وڵاتانی پێ دەپێورێت، پێدەچێت یەکێک لەو بابەتانەی کە هەرێمی کوردستان لەم بوارەدا کێشەی نییە بریتییە لەڕێژەی خوێندەوار، بەرنامەی نەهێشتنی نەخوێندەواری پەیوەستە بە کۆمەڵە بوارێکی دیکەوە، کە لە گرنگترینیان ئەم خاڵانەی خوارەوەن:

١. بەرزبوونەوەی ڕێژەی خوێندەواران پەیوەندییەکی ڕاستەوانەی هەیە لەگەڵ هۆشیاری کۆمەڵایەتیدا، بەتایبەتی کاتێک کە پڕۆسەی خوێندەواری پڕۆسەیەکی ئامانجدار بێت و مەبەستی بێت کە تاکێکی هۆشیار بە مافەکانی بەرهەم بهێنێت.

٢- کەسانی خوێندەوار کەسانێکی چالاکن بەبەراورد بەو کەسانەی کە نەخوێندەوارن، گرووپی یەکەم لەبواری سازشکردن و گفتوگۆ بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشەکان چەندین ڕێگا تاقیدەکەنەوە تاوەکو لەسەر ڕێگایەک ڕێکدەکەون.

**٣- خوێندەوار باشتر دەتوانێت خۆی لەگەڵ کلتوورە نوێیەکاندا بگونجێنێت،** لەبەرئەوەی کە کلتوور بابەتێکی فێرکارییە و تەنانەت گواستنەوەی لە باوانەوە بۆ نەوەکان پێویستی بە پیاداچوونەوە هەیە بۆئەوەی لەگەڵ داخوازییەکانی نەوەکاندا بگونجێت.

ئەم سێ خاڵەی سەرەوە تەنیا بۆ نموونە باسکراون، گەر نا گرنگی خوێندەواری بەپێی کەس و گرووپ و شوێن و کات گۆڕانکاری بەسەردا دێت، پرسیارە گەورەکە لە هەرێمی کوردستان ئەوەیە کە ئێمە بەکێ دەڵێین خوێندەوار؟ ئایا خوێندەوارەکان چییان پێشکەش بە کۆمەڵگەی کوردی کردووە؟ کۆتا پرسیار حکومەتی هەرێمی کوردستان چۆن مامەڵەی لەگەڵ خوێندەواریدا کردووە؟ بەشێک لە داتاکانی وەزارەتی پەروەردە باس لەوە دەکات کە ڕێژەی خوێندەوار لە هەرێمی کوردستاندا ٨٤٪ تێپەڕاندووە.

**٢-٣/١) تەندروستی**

کەرتی تەندروستی بەپێی ئامارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، بەتایبەت کە لێرەدا باس لە کەرتی گشتی دەکرێت و ئامارەکانی کەرتی تایبەت بەهەند وەرناگرین لەبەرئەوەی کە کەرتی تایبەت کەرتێکی بازرگانییە و بەشێکی زۆری دانیشتوانی هەرێم توانای داراییان لەو ئاستەدا نییە کە – ئەگەر بە ناچاری نەبێت ڕوو ناکەنە کەرتی تایبەت بۆ وەرگرتنی چارەسەر. یەکێک لەو ئامارانەی وەزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستان پێمان دەڵێت کە بۆ (١٠٠٠) هاوڵاتی هەریمی کوردستان لە ساڵی ٢٠١٢ تەنیا (١.١) پزیشک تەرخانکراوە، هەروەها (٧١٩٢) تەختی نەخۆش لە نەخۆشخانەکانی هەرێمی کوردستان لە هەمان ساڵدا بەردەست بووە بۆ تەواوی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان، ئەمە لەکاتێکدا (٦٩) نەخۆشخانەی حکومی لە ساڵی ٢٠١٢ خزمەتگوزارییەکانی پێشکەشی هاوڵاتیان کردووە بەرامبەر بە بوونی (٥٢) نەخۆشخانەی تایبەت(١١)، کێشەی ئەم ئامارە لەوەدا کە ئامارەکە باسی ساڵی ٢٠١٢ دەکات و لە سایتی فەرمی وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەردەستە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەو ساڵەوە (٢٠١٢) کە تا نووسینی ئەم بابەتە کە ساڵی (٢٠٢٢)ەوە هیچ ئامارێک و لێکۆڵینەوەیەک لەو وەزارەتە ئەنجامنەدراوە سەبارەت بەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە تەندروستی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانەوە.

**٢-٢) پێنوێنە نەژمێردراوەکان**

بوارەکانی هەژاریی و تەندروستی و خوێندەواری پەیوەندییان بە سێ چەمکی دیکەوە هەیە کە بریتین لە (یەکسانی، دەستەبەرکردن و بەردەوامی) ئەم سێ بوارە یارمەتیدەرمانن بۆ شیکردنەوەی ئەو بابەتانەی لە سەرەوە باسمان لێوەکردن.

### ٢-١/٢) یەکسانی

یەکێک لەو کێشە هەنووکەییانەی کە ئەزموونی هەرێمی کوردستان گرفتاری بووە بریتییە لە بابەتی یەکسانی، یەکسانی لە هەموو بوارەکاندا و لەنێو هەموو یەکەکاندا، بۆنموونە یەکسانی جێندەری، یەکسانی پلەبەندی، یەکسانی لە نێوان شار و شارۆچکە و گوند و ناحیە و ...هتد، ئەوەی بەڵگەیە لەسەر نەبوونی یەکسانی و توانای پێوانەکردنی هەیە بریتییە لە بەکارهێنانی کەرتی تایبەت بۆ بەدەستهێنانی خزمەتگوزارییەکان، بۆنموونە کەرتی پەروەردە. ئەم کەرتە بەپێی ئامارێکی وەزارەتی پەروەردە بۆ ساڵی ٢٠١٧-٢٠١٨ ژمارەی قوتابخانە ناحکومییەکان لە هەر پێنج پارێزگای هەرێمی کوردستان (هەولێر، سلێمانی، دهۆک، هەڵەبجە، کەرکوک و ئیدارەی گەرمیان) بەمشێوەیە بووە (باخچەی ساوایان - ١٢٥، بنەڕەتی - ٩٤، دواناوەندی - ١، ئامادەیی - ٤٩، پیشەیی - ٠، پەیمانگا- ٤١، فێرکردنی خێرا - ٠، و کۆی گشتی - ٣١٠)[١٢]، ئەمە لەکاتێکدا کە بەهۆی قەیرانی داراییەوە بەشێکی زۆری قوتابخانەکانی هەرێمی کوردستان - کەرتی گشتی بەهۆی نەبوونی مووچەی مامۆستایان و کارمەندانەوە دەرگایان بەڕووی خوێندکاراندا داخستبوو، بەڵام ئەو قوتابخانە ناحکومییانە خوێندکارەکانیان بەردەوام بوون لە خوێندن، ئەو نایەکسانییەی کە لێرەدا بەدیدەکرێت پەیوەندی هەیە بە ئاستی گوزەرانی باوانی خوێندکارەکانەوە، ئەمەش لە داهاتوودا کاریگەری نەرێنی دەکاتە سەر توانستی زانستی خوێندکاران، ئەمە ئەگەر بۆ وەزارەتی پەروەردە ڕاست بێت بەهەمانشێوە بۆ وەزراەتی خوێندنی باڵا وتوێژینەوەی زانستیش هەمان کاریگەری هەیە بەڵگەیە لەسەر نایەکسانی و نادادپەروەری لە نێوان خوێندکارانی یەک قۆناغی خوێندندا لەسەر بنەمای توانستی دارایی باوانی خوێندکاران.

### ٢-٢/٢) دەستەبەرکردنی مافەکان

بەدیهێنانی یەکسانی لە سێکتەرە خزمەتگوزارییەکان پەیوەندییەکی ڕاستەخۆی بە دەستەبەرکردنی مافەکانەوە هەیە، یەکێکی دیکە لە کێشەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بریتییە لە نەبوونی پێوەری گونجاو بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی هاوڵاتیان، بۆ نموونە ڕێژەی بێکاری لەناو مێینەدا ٢٩.٤٪ بە بەراود بە ڕەگەزی نێر کە ڕێژەکەی تەنیا ٩.٧٪ یە[١٣]، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەلی کار لەبەردەم ڕەگەزی نێرینەدا زیاترە وەک لەوەی کە لەبەردەم مێینەدا هەیە، لەوانەیە بەشێک لەو کێشەیە پەیوەندی بە کلتووری کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە هەبێت، بەڵام جێگای پرسیارە کە ئایا حکومەتی هەرێمی کوردستان چ کارێکی کردووە بۆ نزیکردنەوەی یەکسانی نێوان دەستەبەرکردنی مافەکانی نێوان ڕەگەزە جیاوازەکان.

### ٢-٣/٢) بەردەوامی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری

یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی حکومەت بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییەکان، کە زۆر بوار دەگرێتەوە، بۆئەوەی پێوەرەکانی ئەم نووسینە یەکانگیری یەکتر بێت، هەمان سێکتەرەکانی پەروەردە و تەندروستی و خوێندنی باڵا بەنموونە وەرگرین بۆمان دەردەکەویت کە لە دوای ساڵی ٢٠١٤، هەروەها بەهۆی قەیرانی دارایی حکومەتی هەرێمی کوردستان نەیتوانیوە ئەو خزمەتگوزارییانە وەکو پێویست پێشکەش بە دانیشتوانی هەرێمەکەی بکات، کەرتی تایبەتیش نەیتوانیوە کەلێنی ئامادەنەبوونی کەرتی گشتی پڕبکاتەوە لەبەرئەوەی کە خزمەتگوزراییەکانی ئەو کەرتە پێویستی بە توانایەکی دارایی هەیە – وەک چۆن پێشتر ئاماژەمان پێدا کە هەر لە بنەڕەتدا هاوڵاتیان دووچاری داڕمانی دارایی ببوون بەهۆی نەبوونی مووچە و چەقبەستوویی بازاڕەوە، کەواتە چۆن بتوانێت سوود لەو خزمەتگوزارییانە وەربگرێت.

بەکورتی دەتوانین بڵێین کە، حکومەتی هەرێمی کوردستان پاش تێپەڕبوونی ئەزموونی ٣١ ساڵ نەیتوانیوە ئەو ئامانجانەی کە حوکمڕانییەکی باش کاری بۆ دەکات بۆ هاوڵاتیانی دەستەبەری بکات، لەلایەکی دیکەشەوە بەرنامەی چاکسازیکردن لە دامەزراوەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان نەیتوانیوە دەستی بگەیەنێتە قوڵایی کێشەکان و چارەسەریان بکات، ئەمەش جارێکی دیکە دەبێتە هۆی نائومێدی لەبەردەم هەنگاوەکانی داهاتووی حکومەتی هەرێم، کەواتە پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە کە چۆن دەکرێت بەر لەو هەڵدێرەی حکومەتی هەرێم بگیرێت؟ باشترین دەرفەت لەبەردەم حکومەتی هەرێمی کوردستان بریتییە لەوەی کە کار لەسەر دامەزراندنی دامەزراوە نیشتمانییەکان بکات، لەبەرئەوەی کە کێشەی حکومەتی هەرێم هەروەک لە گریمانەی توێژینەوەکەدا هاتووە ئەوەیە کە دامەزراوە لاوەکییەکان دەسەڵاتی باڵایان هەیە، لەبەرامبەردا دامەزراوە نیشتمانییەکان دەستەوستانن لەبەردەم هەژموون و کاریگەری پارتەکان، خۆشبەختانە حکومەتی هەرێمی کوردستان خاوەنی پێگە و بنەمای یاسایی و دەستووری دامەزراوەکانە ئەوەی پێویستە بوونی ئیرادەیە بۆ کاراکردنیان.

## پەراوێزەکان


١. بۆ زانیاری زیاتر سەردانی ئەم ماڵپەڕە بکە: INSTITUTION | Meaning & Definition for UK English | Lexico.com یان INSTITUTION | Meaning & Definition for UK English | Lexico.com

٢. سەردانی ئەم ماڵپەڕە بکە: أهداف المؤسسة - منتدي فتكات (fatakat-a.com)

٣. منظمة الأمن والتعاون في اوروبا، مبادئ توجيهية لتنظيم الأحزاب السياسية، الناشر مكتب المؤسسات الديمقراطية وحقوق الانسان التابع لمنظمة الأمن و التعاون في اوروبا، ٢٠١٠، ص١٧.

٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

٥. عبدالغفار شكر، نشأة وتطور المجتمع المدني: مكوناته و إطاره التنظيمي، الحوار المتمدن، العدد:٩٨٥، التأريخ ١/١٣ /٢٠٠٤/٠، بەردەستە لەم ماڵپەڕە: عبد الغفار شكر - نشأة وتطور المجتمع المدنى : مكوناته وإطاره التنظيمى (ahewar.org)

٦. مريبعي سوسن، التنمية البشرية في الجزائر — الواقع والآفاق، مذكرة مكملة لنيل شهادة ماجستير في علوم التسيير، جامعة منتوري- كلية علوم الإقتصادية و علوم التسيير، ٢٠١٢-٢٠١٣، ص٦.

٧. إبراهيم مراد الدعمة، التنمية البشرية الإنسانية (بين النظرية و الواقع)، دار مناهج للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٩، ص١٧.

٨. عبدالرحيم تمام أبو كريشة، دراسات فى علم الإجتماع التنمية، المكتب الجامعى الحديث، الإسكندرية، ٢٠٠٣، ص٣٢٨.

٩. بۆ زانیاری زیاتر سەردانی ئەم ماڵپەڕە بکە: ڕێژەی هەژاری لە هەرێم ڕاگەیەنرا (nasnews.com)

١٠. پروشەری چوارچیوەی ستراتیجی لە ماڵپەری وەزراەتی کاروباری کۆمەڵایەتی لەم لینکە: ٠.٢ پرۆشەری چوارچێوەی ستراتیجی پاراستنی کۆمەڵایەتی.pdf (gov.krd)

١١. بۆ زانیاری زیاتر سەردانی ئەم لینکە بکە: حکومەتی هەرێمی کوردستان | وەزارەتی تەندروستی (gov.krd)

١٢. ڕاپۆرتی وەزارەتی پەروەردە لەم لینکەی خوارەوە: ١. ئاماری قوتابخانە ناحکومییەکان - خوێندنی ناحکومی.pdf (b-cdn.net)

١٣. بۆ زانیاری زیاتر سەردانی ئەم لینکە بکە: ٠.٢ پرۆشوری چوارچێوەی ستراتیجی پاراستنی کۆمەڵایەتی.pdf (gov.krd)



پ.ی.د. ئەمین فەرەج شەریف/ مامۆستا لە زانکۆی سەڵاحەدین
محەمەد ڕەحمان ئەحمەد/ ماستەر لە زانکۆی سەڵاحەدین

# پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی سیاسی و هێزە کۆمەڵایەتییەکان لە هەرێمی کوردستان

**پێشەکی**

هەموو کۆمەڵگایەک بونیادێکی کۆمەڵایەتی و کەلتووری تایبەت بەخۆی هەیە کە ڕەنگدانەوە و زادەی فاکتەرگەلێکی وەک مێژوو، جوگرافیا، دابونەریت، ئایین، تایبەتمەندییە ڕەگەزیی و نەتەوەییەکانی خۆیەتی... ئەمانەش کاریگەری زۆر و بەرچاویان دەبێت لەسەر کایەی سیاسەت، چونکە سیاسەتیش ڕەنگدانەوە و کارتێکراوی ژێرخانی کۆمەڵایەتی و کەلتوورییە. کارلێککردنی کایەی کۆمەڵایەتی و سیاسی، کاریگەری هێزە کۆمەڵایەتییەکان و دەسەڵات لەسەر یەکتری، چۆنیەتی یەکتر بەرهەمهێنانەوەیان، ئاستی پاڵپشتی و ململانێی یەکتری...

جێگای بایەخی زۆرێک لە بیرمەندانی بواری کۆمەڵناسی سیاسی و گەشەپێدانی سیاسییە.پرسی گەشەپێدانی سیاسیش لە دوای دووەم جەنگی جیهانییەوە تاوەکو ئێستاش پرسێکی گرنگ و بایەخداری کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەگشتی و وڵاتە تازە پێگەیشتووەکانە بەتایبەتی، بەجۆرێک لە زۆربەی وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان پرۆسەی گەشەپێدانی سیاسی شکستی هێناوە لەوکاتەوە تا ئێستا، ئەمەش نەک تەنها کێشەیە بۆ ئەو وڵاتانە، بەڵکو بووەتە کێشە بۆ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش، سەرەڕای هەوڵ و هاوکارییە نێودەوڵەتییەکان بۆ ئەم وڵاتە تازە پێگەیشتووەکانە.بۆ ئەمەش زۆرێک لە زانایانی بواری کۆمەڵناسی سیاسی جەخت لەسەر بونیادی کۆمەڵایەتی و کەلتووری ئەو کۆمەڵگایانە دەکەنەوە کە وەک ئاڵنگارگەلێک ڕۆڵ دەبینن لە هەمبەر پرۆسەی گەشەپێدانی سیاسی.

کۆمەڵگەی هەرێمی کوردستانیش وەک کیانێکی نیمچەسەربەخۆ کە لە دوای ١٩٩١ دەرکەوت، بەدەر نیە لە شکستخواردنی پرۆسەی گەشەپێدانی سیاسییەکەی.لەم ڕووەوەش ناسین و بنکۆڵکردنی بونیادی کۆمەڵایەتی و کەلتووری کۆمەڵگەی هەرێمی کوردستان، کە تا چ ئاستێک ڕۆڵ و کاریگەرییان هەیە لەسەر پرۆسەی گەشەپێدانی سیاسی و شکستپێهێنانی بایەخێکی زۆری هەیە، چونکە بونیادی کۆمەڵایەتی و کەلتووری هەر کۆمەڵگەیەک دەبێتە ژێرخانێک بۆ سەرخانە سیاسییەکە، بەجۆرێک هەردوو کایە کارلێک دەکەن و یەکتربەرهەمدەهێننەوە.

## ناوەڕۆك

یەکێک لەو پێشمەرجانەی کە لایەنگران و تیۆرداڕێژەرانی بە مۆدێرنەکردن بۆ بەمۆدێرنبوونی سیستەمی سیاسی هەر وڵاتێک دایانناوە بریتییە لە بونیادی کۆمەڵایەتی(social structure)، بەومانایەی ئەگەر بێتوو بنیادی کۆمەڵایەتی هەر وڵاتێک کە خۆی دەبینێتەوە لە ڕێکخراو و کۆمەڵەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، دەستە و کۆمەڵەی بازرگانی، یەکێتییەکانی پیشەیی، گرووپە لکاوەکانی ئایینی و ئیتنی و...، گرووپی ژنان و یەکێتییەکانی کار، میدیا...چالاک و کارا و سەربەخۆبوون و بتوانن بەشێوەیەکی مۆدێرن خۆیان ڕێکبخەن ئەوا دەتوانن ڕۆڵێکی گرنگ ببینن لە گەشەپێدانی سیاسی و بەرجەستەکردنی دیموکراسیەت و سنوردارکردنی پانتایی دەسەڵات.هەروەها پێیانوایە گەر ئەو گرووپە ناوەندییانە کە وەک پردێکن لە نێوان خەڵک و دەسەڵات گەر لە هەر سیستەمێکدا هەبوون ئەوا دەبنە بەردی بناغە بۆ بە دیموکراسی بوونی ئەو سیستەمە بەپێچەوانەوەش نەبوونی ئەم گرووپە ناوەندییانە هەڵبەت بەشێوەیەکی ئەکتیڤ و مۆدێرن دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو کۆمەڵگایە هەمیشە لە بەردەم مەترسیدابێت بۆ




هەژموونكردنی لەلایەن دەسەلاتەوە واتە دەسەلات تەواو پانتایی كۆمەلایەتی داگیربكات، كە هەر ئەمەشە یەكێك لە گرنگترین ئەو گرفت و ئالنگارییانەی كە لە ولاتانی تازە-گەشەكردوو هەیە لە بەردەم پرۆسەی گەسەپێدانی سیاسی و بە دیموكراسیبوونیان.[1]

بەم پێیەش ڕادەی گەشەپێدانی سیاسی هەر ڕژێمێك دەوەستێتە سەر دیاریكردنی پانتایی هەر یەك لە دەولەت و كۆمەلگای مەدەنی، كە ئایا پانتای كۆمەلگا چەندە و، دەسەلات تا چ ئەندازەیەك ڕێز لەو پانتاییە دەگرێت؟ بەمەش هەرچەندە پانتایی دەسەلاتی كۆمەلگا فراوانبێت و دەسەلاتی دەولەت بچووك و سنوردار بێت ئەوا نیشانەی بە دیموكراسی بوونی ئەو ڕژێم و ولاتەیە، پێچەوانەكەشی هەر ڕاستە.هەروەها دامەزراوەكانی كۆمەلگای مەدەنی بەپێی پێداویستییەكانی بنیاد و دارشتەی كۆمەلگە و وەرچەرخانەكانی سیاسیی و ئابووریی و كەلتوورییەوە سەرهەلدەدەن بە سروستی خۆیان و خۆرسكانە، بەم شێوەیە دامەزراوەگەلێكی وەك یەكێتییەكان و سەندیكاكان و گرووپەكانی فشار بۆ ئەوە سەرهەلدەدەن كە خواست و داواكارییەكان بگۆڕن بۆ سیاسەتی گشتی و تیایدا بەشداری بكەن[2].

لێرەدا پێویستە بپەرژێینە سەر باسی سروشتی پەیوەندی نێوان دەسەلات و كۆمەلگە و هێزەكۆمەلایەتییەكان لە هەرێمی كوردستاندا.كە ئایا ئەو دوو پانتایی و كایە تا چەند جیاوازن؟ چۆن كارلێك دەكەن و ئاستی كاریگەرییەكانیان لەسەر یەكتر چۆنە؟ بەمانایەكی تر ئایا كۆمەلگەی ئێمە ئەو ڕۆحیەتە مەدەنیەی تیادا هەیە كە بتوانێ خۆی ڕێكبخات لە ڕێكخراوگەلێك كە بەشێوەیەكی مەدەنیانە كاریگەری لەسەر دەسەلات دروستبكات و پانتاییەكەی سنوردار بكات؟ یاخود نەخێر ئەوە دەسەلاتە كە هەژموونی بەسەر پانتایی كۆمەلگەدا كردووە و بە ئارەزووی خۆی مۆبیلیزەیان دەكات؟

بۆ ئەمەش ئەگەر شیكردنەوە بۆ پەیوەندی نێوان كۆمەلگا و دەسەلات بكەین لە هەرێمی كوردستاندا ئەوا سەرەتا دەبێت هێز و گرووپە كۆمەلایەتییەكان بناسین، وە باس لە چۆنیەتی سەرهەلدان و ڕۆلیان بكەین پاشان بۆمان دەردەكەوێت كە ئایا كۆمەلگای ئێمە كۆمەلگایەكی لیبراڵ و پلۆراڵ و كارتێكەرە یان كۆمەلگایەكی جەماوەریی و كارتێكراوە، ئایا ئەوە هێز و گرووپە كۆمەلایەتییەكانن كە حیزب و دەسەلات ساز و مۆبیلیزە دەكەن

---

10.Mohamad zahir akbary,( 8/feb/2021) why democracy is not succecsfull in third world countries,daily outlook Afghanistan, http://www.outlookafghanistan.net/topics.php?post_id=25415.

٢. عەبدول عەلی قەوام،(٢٠٠٩) بەربەستەكانی گەشەسەندنی سیاسی، و.هیوا مەجید خەلیل، چاپخانەی موكریانی، هەولێر، ل١٧٢.

یان بە پێچەوانەوە حیزب کۆمەڵگا مۆبیلیزە دەکات؟

بەشێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵگای ئێمەدا دوو جۆر گرووپ و هێزی کۆمەڵایەتی بوونیان هەیە، یەکەمیان گرووپە (نافەرمی و لکاوەکان) وەکو خێڵ و عەشیرەت و بنەماڵە کە ئەمە تایبەتمەنییەکی هەموو کۆمەڵگایەکی سوننەتی و کلاسیکییە، هەروەها کەمینە نەتەوەکان و کەمینە ئایینییەکان، کە ئەندامبوون تیایدا داخراوە لەسەر بنەمای خوێن و ئینتسابیە، دووەمیان گرووپە فەرمییەکانن وەکو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کە ئەندامبوون تیایدا ئیکتسابیە واتە خۆت دەچیتە ناوی و ئەندامێتی بەدەستدەهێنی.[1] یەکەمیان واتە تیرە و هۆز و خێڵ و عەشیرەتەکان پێکهاتەیەکی گرنگ و بنەڕەتی کۆمەڵگای ئێمەن و کاریگەریشیان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە، بەجۆرێک لە گشت کایەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی ڕەنگیداوەتەوە.[2]

**لە زۆربەی وڵاتە دیموکراسی و پێشکەوتووەکاندا پیاوانی کار و سەرمایەدارەکان و خاوەن کۆمپیانیاکان ڕۆڵ و کاریگەری بەرچاویان هەیە لەسەر سیاسەت و بڕیار بەدەستان.**

لەم سۆنگەشەوە ئەوەی دەبینرێت ئەو گرووپە لکاوە نافەرمییانە پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ هەردوو حیزبی باڵادەست (پ د ک- ی ن ک)* هەیە لە هەر یەک لە دەڤەرەکانیان.ئەم هۆز و تیرە و بنەماڵە و خێڵانە ڕێکخستنێکی تەقلیدیان هەیە وەک هێزێکی کۆمەڵایەتی، بۆئەوەی پارێزگاری لەو هێزەش بکەن کە هەیانە هەمیشە دەچنە پاڵ هەموو دەسەڵاتێک کە حوکمی دەڤەرەکەیان بکات.ئەم هێزە کۆمەڵایەتییانە بەهۆی بوونی بنەما و پێکهاتە تەقلیدییەکانیان هەمیشە دژی گۆڕانی بونیادی کۆمەڵگا و بەرەو

---

١. محەمەد ڕەحمان ئەحمەد،(٢٠٢١/٢/١٧) پەیوەندی نێوان دەسەڵات و هێزەکۆمەڵایەتییەکان لە هەرێمی کوردستاندا، ناوەندی حەمرین بۆ توێژینەوەی ستراتیژی،
http://www.hamrincenter.com/News.aspx?id=77&MapID=11&fbclid=IwAR2PFucdP-GrusKePinPopnb8kOgGkGBfl8CgB0C7-Ujr3DqtYZ1Fidp3g8.

٢. ئەمین فەرەج شەریف،(٢٠١٩) حکومرانی باش لە هەرێمی کوردستاندا توێژینەوەیەک لە پایە و ئاستەنگەکانی، و.لوقمان حاجی قادر، چاپخانەی هێڤ، هەولێر، ل٣١٣.

* پارتی دیموکراتی کوردستان – یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

مەدەنی بوونن، بۆ ئەمەش نەک هەر فشاری گۆڕانکاری لەسەر دەسەڵات ناکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوان بوونەتە بەشێک لە ویستی دەسەڵات، چونکە بوونی ئەم گرووپانە پەیوەستە بە چەقبەستوویی کۆمەڵگا.هەر جۆرە گۆڕانکارییەک و گەشەسەندنێکی کۆمەڵایەتی و کرانەوەیەک دەبێتە هۆی لاوازبوون و لە ناوچوونی ئەم گرووپە داخراو و پارێزگارانە .ئەمانە بە عەقڵیەتێکی کلاسیکییەوە هیچ بەرنامە و پرۆگرامێکیان نیە بۆ ڕەوتی گەشەسەندنی گۆمەڵگا و ناشیانەوێت پێکهاتەی کۆمەڵگا گۆڕانکاری بەسەردا بێت، چونکە هەر بەرەوپێشچوون و گۆڕانکارییەک لە پێکهاتەی کۆمەڵگا یەکسانە بە لاوازبوون و لەناوچوون نەمانی ڕۆڵی ئەوان، هەروەها دەبێتە هۆی نەمانی ئەو پوان و سوودە ماددیانەی کە لە دەسەڵات وەریدەگرن لە بەرامبەر ملکەچی و گوێڕایەڵیان، بۆیە ئەوان هیچ ناڕەزایەتییەک دەرنابڕن بەرامبەر دۆخی هەبووی چەقبەستوو[١].

لەسەر ئەم بنەمایە دەسەڵاتیش نایەوێت هیچ گۆڕانکارییەکی گەشەی کۆمەڵایەتی بێتە کایەو، چونکە ئەو کۆمەڵگایانەی لەسەر پێکهاتەیەکی خێڵەکی وەستاون دەستەمۆکردنیان لەلایەن دەسەڵاتەوە زۆر ئاسان دەبێت.سەرۆکی خێڵ یان عەشیرەت لایەنگیر بکە، ئیتر دەست و پێوەندەکانی خوارەوەش ئۆتۆماتیکی ڕازی دەبن، بەمەش ئەو ئەرکە قورسە لەسەر حیزبی دەسەڵات لادەچێت کە بڕوات یەک یەک تاکەکان ڕازی بکات .هەر بۆ ئەم مەبەستەش ئێستا دەبینین لەکاتی هەڵبژاردندا حیزبی دەسەڵات لە هەموو خێڵ و عەشیرەتێک کاندیدی خۆی هەیە هەم لەپێناو ڕازیکردنیان هەم لەپێناو ڕاکێشان و کۆکردنەوەی دەنگ لێیان.سەرەڕای سوود و دەستکەوتی ماددی وەکو دیوەخانە و چەکدارکردن و دامەزراندنی ئەندامانی خێڵەکە و کاربەڕێکردنیان لە دامەزراوەکان و ...هتد، لە بەرامبەردا ئەوانیش تەواو دەبنە گوێڕایەڵ و پاڵپشت و بەرگریکاری دەسەڵات. بەم پێیەش بۆ دەسەڵات زەحمەت دەبێت کە بتوانێت چاکسازی و گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە ئەنجامبدات، چونکە پێکهاتەی خێڵەکی دژی مەدەنیەت و ملکەچییە لە هەمبەر یاسا .خێڵەکان هەمیشە لەگەڵ ئەوەدان کە بەڕێککەوتن لەگەڵ هێزێک یا حیزبی دەسەڵاتدار پارێزگاری لە هێز و هەژموونی کۆمەڵایەتی خۆیان بکەن و وەکو خەڵکی گشتی یەکسان نەبن لە هەمبەر یاسای مەدەنی، بۆیە تا ئێستاش لە بابەتی شەڕ و کوشتن ددان بە یاسا دانێن و ئامادەنین بچنە دادگا ئیتر خودی دەسەڵات هەندێکجار ناچار دەبێت خۆی ئاشتەوایی کۆمەڵایەتیان بۆ بکات ! بەکورتی لە نێوان خێڵەکان و دەسەڵات بەرژەوەندییەکی ئاڵوگۆڕ هەیە کە بەربەستە لە بەردەم

---

١. محەمەد ڕەحمان ئەحمەد، پەیوەندی نێوان دەسەڵات و هێزەکۆمەڵایەتییەکان لە هەرێمی کوردستاندا.

گەشەسەندنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بە مەدەنیبوونی کۆمەڵگا[1].

لە گرووپە لکاوەکان جۆری دووەمیان بریتین لە کەمایەتییە ئیتنی و نەتەوەیی و ئایینەکان.ئەمانە هەرچەندە گرووپی لکاون، بەڵام توانیویانە خۆیان ڕێکبخەن لە شێوەی ڕێکخستنێکی مۆدێرن و حیزبی سیاسی پێکبهێنن، بەڵام وەکو هێزە لکاوە نەریتیەکانی تر کاریگەرییان نەبووە بەمەبەستی ڕەوتی بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگا و گەشەپێدانی سیاسی، بەڵکو بەهۆی بەرژەوەندی ئاڵوگۆڕیان لەگەڵ دەسەڵات وەکو پاشکۆی دەسەڵاتیان لێهاتووە و هیچ بەرهەڵستکارییەکی وایان نەبووە لە هەمبەر گەندەڵی و نادادیی و پێشێلکارییەکان و یاساشکێنی ...هتد.بەم شێوەیە ئەم گرووپە لکاو نەسەبیانە لەلایەن دەسەڵات دەپارێزرێن و هەندێکجار دەنگیشیان بۆ کۆدەکرێتەوە بەمەش پەیوەندیەکە پێچەوانە دەبێتەوە واتە دەسەڵات کاریگەری لەسەر ئەم گرووپانە دادەنێت و بە ئارەزووی خۆی چۆنی بیەوێت وا ساز و مۆبیلیزەیان دەکات.ئەمەش زۆر بەڕوونی دەبینرێت چ لە پەرلەمان یا لە دەرەوەی پەرلەمان، کە بە هەموو شێوەیەک پاشکۆی ئیرادە و سیاسەتەکانی دەسەڵاتن بە هیچ شێوەیەک بەرهەڵستکاری سیاسەتەکانی حیزبی دەسەڵات ناکەن[2] .

هەروەها ئەو حیزبانەی کە نوێنەراتی کەمینەکان دەکەن و بە سیستەمی کۆتا دەچنە پەرلەمان لەناو خودی کەمینەکانیش ناکۆکی و مشتومڕی لەسەرە، چونکە لەلایەن حیزبی دەسەڵاتدارەوە بەتایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستان دەستێوەردانیان تێدا دەکرێت و دەنگیان بۆ کۆدەکرێتەوە، بەمەش ئەو کەمینانە لە پەرلەمان و لە هەڵوێستی سیاسییان زیاتر وابەستەی سیاسەت و بڕیارەکانی پارتی دیموکراتن و دەنگیان لەپاڵ دەنگی ئەوانە، بەم پێیەش زۆرێک لەو کەمایەتییانە ئیتنی و ئایینی و نەتەوەییانە حیزب و نوێنەرەکانی خۆیان لە پەرلەمان بە نوێنەری ڕاستەقینەی خۆیان نازانن، چونکە پێیانوایە ئەمانە زیاتر بەرجەستەکاری ویست و سیاسەتەکانی حیزبی باڵادەست و دەسەڵاتدارن نەک هی کەمینەکان.[3]

یەکێک لە نموونەکانیش بۆ ئەمە، لە کۆبوونەوەی سەرۆکایەتی هەرێم کە لە ٨ نیسانی ٢٠٢١ بەسترا کە تیایدا باسی ئایندە و یەکڕیزی لایەنەکان و پێکهاتە نەتەوەییەکانیش کرابوو، (ئانۆ جەوهەر) کە وەزیری گواستنەوە و گەیاندنە لە حکومەتی هەرێمی کوردستان و سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانە وەک نوێنەری پێکهاتەی مەسیحیەکان بەشداری

---

١. هەمان سەرچاوە.

٢. هەمان سەرچاوە.

٣. موسلح ئیروانی،(٢٠٢٠) کۆمەڵگەی لێکترازاو: هاوبەندی کۆمەڵایەتی و سیاسەتی شوناس، لەکتێبی سیاسەت و کۆمەڵگە لە باشووری کوردستان، ئامادەکاران: ئیحسان وەڵزی و موسلح ئیروانی، هەولێر ئینستیتووتی سیاسەتی گشتی، ل٨٢-٨٣.

تێدا کردبوو، بەڵام لە بەرامبەردا حیزبی دیموکراتی بەیتولنەهرێن کە حیزبێکی ئاشوورییە ڕایگەیاندن کە ئەو کەسەی بە نوێنەرایەتی ئێمە بەشداری لە کۆبوونەوە کردووە بەهیچ شێوەیەک نوێنەرایەتی ئێمە ناکات نە لەم کۆبوونەوەیە نە لە هیچ شوێنێکی تر.[١]

هەر لەم سۆنگەیەوەشە نەک هەر لەلایەن کەمینەکانەوە، بەڵکو لەلایەن حیزبەکانی تریشەوە بەتایبەتی حیزبە بەرهەڵستکارەکان دژایەتیان دەکرێت و سەرزەنشت دەکرێن، چونکە لەکاتی ململانێکاندا ئەم حیزبە کەمینە و کۆتایانە خۆیان بۆ پارتی یەکلایی دەکەنەوە لە دژی حیزبەکانی تر.[٢]هەروەها لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ (ئایدن مەعروف) کە لێپرسراوی مەکتەبی بەرەی تورکمانییە لە هەرێمی کوردستان هاوکات وەزیری هەرێمە بۆ کاروباری پێکهاتەکان لەسەر پشکی پارتی دیموکراتی کوردستان، لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئاڕاستەی کرابوو، کە ئەو پەرلەمانتارە تورکمانانە بە دەنگی تورکمانەکان دەرچوون یان بە پلان بە هاوڵاتیانی تریش گوتراوە کە دەنگیان پێبدەن؟ لە وەڵامدا نەک هەر ئەمەی ڕەتنەکردۆتەوە، بەڵکو ڕاشیگەیاندووە بەڵێ پارتی دیموکراتی کوردستان دەستێوەردان لە کاروباری تورکمان دەکات.[٣]

جۆری دووەمی گرووپ و هێزە کۆمەڵایەتییەکانی هەرێمی کوردستان کە خۆی بەرجەستە دەکات لە گرووپ و ڕێکخراوە فەرمییەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی.دوای ئازادبوونی هەرێمی کورستان لە ١٩٩١ جموجۆڵی کۆمەڵگەی مەدەنیش هاوشانی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان سەریهەڵدا.ئەوەبوو چەندین ڕێکخراو دەستە و سەندیکا پیشەییەکان و دواتر هەندێک لە ڕێکخراوی تری کۆمەڵگەی مەدەنی سەریانهەڵدا کە گرنگیان بە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری دەدا وەک ڕۆشنبیری سیاسی و یاسایی و دەستووری و مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی و داکۆکیکردن لە مافی ئافرەتان و پرسە کۆمەڵایەتییەکان[٤] .

ئەمانە لە هەر کۆمەڵگایەکی فرەییدا ڕۆڵی بەر چاویان هەیە لە کەمکردنەوەی دەسەڵاتی

---

١. بڵاوکراوەی سایتی درەو میدیا، لە (٢٠٢١/٤/٩)، https://www.facebook.com/drawmedia/posts/947197719442345.

٢. موسڵح ئیروانی، سەرچاوەی پێشوو،ل ٨٢-٨٣.

٣. چاوپێکەوتنی سایتی ئاژانس لەگەڵ ئایدن مەعروف، لە( ٢٠١٩/٣/١٠)، سایتی ئاژانس، ٢٠٢١/٥/١، https://azhans.krd/%D8%B3%D9%87%E2%80%8C%D8%B1%DB%86%D9%83%DB%8C-%D9%81%D8%B1%D8%A7%D9%83%D8%B3%DB%8C%DB%86%D9%86%DB%8C-%D8%A8%D9%87%E2%80%8C%D8%B1%D9%87%E2%80%8C%DB%8C-%D8%AA%D9%88%D8%B1%D9%83%D9%85%D8%A7%D9%86%DB%8C/.

٤. ڕزگار محەمەد قادر،(٢٠٠٧) لەپێناو کوردستانێکی نوێدا، چاپخانەی منارە، هەولێر، ل٢٤٧.

حیزبەکان و پانتایی دەسەڵات لەسەر داڕشتنی سیاسەتی گشتی وڵات و گێڕانی ڕۆڵی پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە لە هەمبەر دەسەڵاتدا و ڕێگریکردن لەوەی دەسەڵات بە ئارەزووی خۆی خەڵک بەلاڕێدا ببات و ئاڕاستەیان بکات ئەویش وەک ئاماژەمان پێدا بەهۆی ئەو کاریگەرییانەی کە لەسەر دەسەڵات دایدەنێن لە ڕێگا و میکانیزمە جۆراوجۆرەکانەوە.بەڵام ئەوەی جێگای ئاماژەیە لە کۆمەڵگای ئێمەدا دیسان پەیوەندییەکە بە پێچەوانەیە.لێرەدا زۆربەی ئەم گرووپ و سەندیکا پیشەیی و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە مەدەنیانە لەلایەن خودی حیزبەکانەوە یاخود بە پاڵپشتی ئەوان دروست دەکرێن، هەر لەلایەن ئەوانیشەوە ئاڕاستە دەکرێن، حیزب و دەسەڵات هەڵدەستێ بە پێدانی و دابینکردنی بودجە و موچەی مانگانەیان پێدەدات بەمەش بێگومان ئەم گرووپە بەناو مەدەنی و کۆمەڵایەتییانە دەکەونە ژێر کاریگەری حیزبی دەسەڵاتدار، ئیتر ناتوانن وەک هێزێکی کۆمەڵایەتی و مەدەنی هیچ فشارێک لەسەر دەسەڵات دروستبکەن.هەروەها نەیانتوانیوە تا ئێستا بەرگێکی مەدەنی بەبەر کۆمەڵگای کوردی بکەن، بەڵکو لەلایەن زۆرێک وەک دوکانێکی بازرگانی وەسف دەکرێن کە تەنها خەریکی مووچە و بودجە وەرگرتنن لە حزب و دەسەڵات.بەمەش دیسان هەر ئەوە حیزب و دەسەڵاتە کە کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا و گرووپەکانی نێویدا دەنێت و چۆنی بیەوێ ئاوا ئاڕاستە و مۆبیلیزەیان دەکات، بەجۆرێک لە جیاتی ببنە نوێنەری ئەو چین و توێژانە و گوزارشت لە خواست و داواکاریەکانیان بکەن کە بەناوی ئەوانەوە کار دەکەن بوونەتە نوێنەری حیزبەکانیان لەنێو ئەو چین توێژانە .[1]

بێگومان یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی لاوازیی و ناچالاکی و وابەستەیی هێزی کۆمەڵگەی مەدەنی لە هەرێمی کوردستان بۆ فراوانبوونی شارەکان و دروستبوونی چینی ناوەند دەگەڕێتەوە، کە پێکهێنەر و داینەمۆی هێزی کۆمەڵگەی مەدەنییە لە ئەنجامی شۆڕشی پیشەسازی و چینە بازرگان و خاوەنکارە سەربەخۆکان نەبووە[2]، بەڵکو زیاتر بەهۆی فراوانبوونی کەرتی گشتی و دامەزراندنەوە بووە لەلایەن دەوڵەت و دەسەڵاتەوە، چونکە عێراق بە هەرێمی کوردستانیشەوە وڵاتێکی دەوڵەمەندی خاوەن نەوتە، تا ئێستاش عێراق  نزیکەی لە ٪۹۳ داهاتی گشتیان پشت بەهەناردەکردنی نەوت دەبەستێت، نرخی نەوتیش ناجێگیرە لە بازاڕە جیهانییەکان، بەمەش لە هەر شۆکێکی ئابووریدا کە داهاتی دەوڵەت کەمبێتەوە ڕاستەوخۆ کاریگەری دەکاتە سەر ژیانی ئەم چینە و بەرەو چینی خوارەوەیان دەبات، بەم پێیەش هەردوو حکەمەتی عێراق و هەرێمی کوردستانیش کە

---

١.  هەمان سەرچاوە.

٢. ئیحسان وەڵزی و موسڵح ئیروانی،(٢٠٢٠) کۆمەڵگەی لێکترازاو: هاوبەندی کۆمەڵایەتی و سیاسەتی شوناس، لە کتێبی سیاسەت و کۆمەڵگە لە باشووری کوردستان، هەولێر ئینستیتوتی سیاسەتی گشتی، ل١١٣.

پشت بە داهاتی نەوت دەبەستن توانای فراوانکردنی کەرتی گشتیان هەبووە ئەمەش وایکردووە چینی ناوەند لەڕووی دارایی و ئابوورییەوە زیاتر وابەستەیی دەسەڵات بێت و نەتوانێت وەک هێزێکی کۆمەڵایەتی سەربەخۆ بەرهەڵستکاری دەسەڵات بکات.[1]

سەرەڕای کۆمەڵگەی مەدەنی و سەندیکا و ڕێکخراوە پیشەییەکان میدیا و دەزگاکانی ڕاگەیاندیش زۆربەیان سەربەخۆنین جا ڕاستەوخۆبێت یان ناڕاستەوخۆ سەر بە حیزبەکانن، ئەمەش دەبێتە ناکارایی ئەو دەزگا و ئامرازانەی ڕاگەیاندن و جوڵاندنی ڕای گشتی و دروستکردنی فشار بۆ سەر دەسەڵات و حکومەت.[2] چونکە زۆربەیان هەڵقوڵاوی هەناوی حیزبن و هەژموونیان بەسەردا کراوە لەلایەن حیزبە دەسەڵاتدارەکانەوە بەتایبەتی (پ د ک- ی ن ک )، ئەوەش بەهۆی هەژموونی ئەو حیزبانەوە بەسەر لایەنی ئابووریی و دارایی گشتیدا، پاشان حیزبەکانی تریش هەوڵیانداوە هەمان ڕێچکەی جووت حیزبی دەسەڵاتدار بگرنەبەر و میدیا و ڕێکخراوی پیشەیی سەر بەخودی خۆیان هەبێت، بەمەش ئەو میدیا و دەزگایانەی ڕاگەیاندن خزمەت بە سیاسەتی حیزبەکان دەکەن و خەریکی ململانێی حیزبایەتی و هەڵدانەوەی فایلی کەسی و سوکایەتی بە یەکترن نەک ڕەخنەگرێکی بێلایەن و سیاسەتێکی بابەتیانە پەیڕەوبکەن لەپێناو هۆشیارکردنەوەی جەماوەر، سەرئەنجام میدیا و دەزگاکانی ڕاگەیاند لەجیاتی دروستکردنی فشار بۆ سەر دەسەڵات دەبنە ئامرازێک بە دەست دەسەڵات و حیزبەکانەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی جەماوەر و بەلاڕێدابردنی پرسە جدییەکان و جەختکردن لەسەر کۆمەڵێک بابەتی لاوەکی و سەرگەرمی.[3]

جگە لەوەش نابێ ڕۆڵ و کارایی کەرتی تایبەت لەبیر بکەین لە بەهێزکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی بەرامبەر بە دەسەڵات، کە لە زۆربەی وڵاتە دیموکراسی و پێشکەوتووەکاندا پیاوانی کار و سەرمایەدارەکان و خاوەن کۆمپیانیاکان ڕۆڵ و کاریگەری بەرچاویان هەیە لەسەر سیاسەت و بڕیار بەدەستان، چونکە ئەمانە ڕۆڵێکی بەرچاویان هەیە لەسەر جوڵەی بازاڕ و ئاستی ئابووری وڵات بەمەش دەسەڵاتداران ناچارن گوێیان بۆ بگرن و بکەونە ژێر کاریگەریان، جگە لەمەش تەنانەت لەکاتی بانگەشە و هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن هەڵدەستن بە پارەدارکردنی کاندیدەکانی حیزب و کاریگەری نواندن لەسەریان.بەڵام هەرچی لە هەرێمی کوردستانە هەست بە ناسەربەخۆیی و ناکارایی زۆر دەکەین لە

---

١. محەمەد حوسێن،(نیسانی ٢٠٢٠) چینی ناوەڕاست لە کوردستاندا: ڕۆڵ و کاریگەری لە گەشەی ئابووری و حوکمڕانی باشدا، ناوەندی کوردستان بۆ توێژینەوە لە ململانێ و قەیرانەکان، سلێمانی- گردی سەرچنار، ل٩.

٢. ئەمین فەرەج شەریف، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٧.

٣. جەبار ئیسماعیل ئەحمەد،(٢٠١٩) چەمکی دەسەڵات لە هزری ڕامیاری میشێل فۆکۆدا و دەرکەوتەکانی لە هەرێمی کوردستان- عێراق، ماستەرنامە، زانکۆی سلێمانی- کۆلێژی زانستە ڕامیارییەکان، سلێمانی، ل ١٧٣-١٧٤.

کەرتی تایبەت، چونکە زۆربەی پڕۆژە ئابوورییە گرنگەکان لەلایەن کۆمپانیاکانی نزیک لە دوو حیزبی دەسەڵاتدار قۆرغکراوە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیاندا.[١]

ئاستی ئەم قۆرخکارییەی کەرتی تایبەتیش بەجۆرێکە تەنانەت زۆرێک پێیانوایە ئەوەی هەیە لە هەرێمی کوردستان کەرتی حیزبیە نەک کەرتی تایبەت، چونکە زۆربەی (پڕۆژە ئابوورییە گەورەکان، کارگە گەورەکان، جادەوبان و پردەکان، پاڵاوگە، هاوردەکردن و بازرگانی دەرمان و ئوتومبێل و جگەرە، کڕینی گازوایل بۆ وێستگەکانی کارەبا...هتد) زۆربەیان سەر بە کۆمپانیاکانی نزیک لە هەردوو حیزبی دەسەڵاتدارن، هەروەها ئەو کۆمپانیایانەی کە لە کەرتی نەوت کار دەکەن وەک لە بوارەکانی( ئاسایش و پاراستنی کێڵگە نەوتییەکان، خزمەتگوزاری، گواستنەوەی نەوتی خاو) لەلایەن کۆمپانیاکانی بەرپرسەکانی هەردوو حیزبەوە قۆرخکراوە.[٢] بەمەش کاتێک حیزبی دەسەڵاتدار هەژموون دەکات بەسەر کەرتی تایبەت و پڕۆژە ئابوورییە گرنگەکان ئەوا ئەم کەرتەش دەکەوێتە ژێر هەژموون و کاریگەری دەسەڵات، کەواتە ئەوە دەسەڵاتە کاریگەری لەسەر دروست دەکات نەک کەرتێکی تایبەتی سەربەخۆ و چالاک کاریگەری لەسەر دەسەڵات دروست بکات.

کەوایە گرووپەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دەتوانن کاریگەری لەسەر دەسەڵات دروستبکەن، بەپێچەوانەوە دەسەڵاتیش دەتوانێت کاریگەریان لەسەر دروست بکات، بەڵام پرسەکە لێرەدا ئەوەیە کە کامە لایەن کۆنترۆڵی ئەویتر دەکات و کاریگەری لەسەر دەنوێنێت، سەرەنجام گەر گرووپ و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بتوانن کاریگەری لەسەر دەسەڵات دروستبکەن ئەوا دەتوانن سنور بۆ دەسەڵات دابنێن و خواست و داواکارییەکانی خۆیانیان بەسەردا بسەپێنن، بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە بوو ئەوا دەسەڵات و پارتە سیاسییەکان خواست و داواکارییەکانی خۆیانیان بەسەردا دەسەپێنن و دەیانکەن بە پاشکۆی خۆیان[٣].

بەم شێوەیە لە هەرێمی کوردستاندا کە لە دۆخێکی ڕاگوزەر و ململانێدایە لە نێوان هێزە نەریتی و هێزە مۆدێرنەکان و تازە پێدەنێتە ناو مۆدێرنیتە بە گوزارشتێکی تر تێکەڵەیەکە لە مۆدێرنە و پێش مۆدێرنە، لەلایەک بونیادێکی جیاکاری کۆمەڵایەتی و ئەرکی هەیە کە خۆی لە چەندین بونیاد و کایەی جیاجیای مۆدێرنە دەبینێتەوە وەک

---

١. ئەمین فەرەج شەریف، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٢.

٢. غالب محەمەد،(٢٠٢١/٢/١٧) سنور میدیا،
https://www.snurmedia.com/all-details.aspx?jimare=16993

٣. پێشڕەو عەلی محەمەدئەمین،(٢٠١٩) کاریگەری حکومڕانی دروست لەسەر کاراکردنی ئەرکەکانی سیستەمی سیاسی، دکتۆرانامە، زانکۆی سلێمانی/ کۆلێژی زانستە ڕامیارییەکان، سلێمانی، ل٤٣.

کایەکانی(ئایین، زانست، پەروەردە، ئابوور، زانکۆ، میدیا، کارگێری، هونەر...هتد)، بەڵام لەلایەکیتر کاریگەریی و دەرکەوتەکانی ئەمانە وەکو کۆمەڵگە مۆدێرنەکان نیە، بەڵکو ئەم کایە جیاجیایانە لە پەیوەندییەکی نا هاوسەنگ و هەرەمی دان لەگەڵ کایەی دەسەڵاتی سیاسی، بە گوزارشتێکی تر کایەی دەسەڵاتی سیاسی هەژموونی بەسەر هەموو ئەم کایە جیاجیانەدا کردووە، ئەمەش وادەکات ئەم کایانە بە پێوەر و لۆژیکی دەسەڵات کاربکەن نەک بە پێوەر و لۆژیکی خۆیان ئەمەش دەبێتە هۆی پاسیڤبوونی ئەم کایانە و دواجار گەشەنەکردن و پێشنەکەوتنیان، بۆ نموونە کاتێک زانکۆ کە ئەرکی بریتییە لە جیاکرنەوەی ڕاست لە ناڕاست و پەرەدان بە توانای خوێندکار و ئاستی زانستی، دەگۆڕێت بۆئەوەی چ شتێک لە بەرژەوەندی دەسەڵاتە چ شتێک زیان بە دەسەڵات دەگەیەنێت، یاخود ئەرکی ئابووری کە بریتییە زیادکردنی قازانجی گشتی و ڕێکخستنەوەی داهات، دەگۆڕێت بۆئەوەی چ سیاسەتێکی ئابووری بۆ دەسەڵات باشە چ سیاسەتێکیش بۆی خراپە، یاخود ئەرکی کایەی ئایین کە لە پێوەرەکانی باڵاییەوە دەگۆڕێت بۆئەوەی چ گوتارێک و فەتوایەک بۆ دەسەڵات باشە کامەشیان خراپە...ئەوا هەموو ئەو کایانە پاسیڤ دەبن و ناتوانن گەشەپێدان ئەنجام بدەن لەناو خۆیاندا.[1]

## ئەنجام

لەم توێژینەوەیەدا دەربارەی (پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی سیاسی و هێزە کۆمەڵایەتییەکان لە هەرێمی کوردستان ) بەم بەرئەنجامەی خوارەوە گەیشتین:

پەیوەندی نێوان دەسەڵات و کۆمەڵگە لە هەرێمی کوردستاندا پەیوەندییەکی ئاسۆیی و دروست نییە، بەجۆرێک کە کۆمەڵگە و هێز و کۆمەڵە و ڕێکخراوە مەدەنییەکان بتوانن کاریگەری لەسەر دەسەڵات دروستبکەن و دەسەڵات ساز و مۆبیلیزە بکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەسەڵات توانیویەتی هەژموون بەسەر زۆرێک کۆمەڵە و ڕێکخراوە پیشەیی و مەدەنییەکان بکات و دواجار ساز و مۆبیلزەیان بکات لەپێناو بەرژەوەندییەکانی خۆی ئاراستەیان بکات بەمەش ئەم هێز و کۆمەڵە و ڕێکخراوانە دەبنە هێزگەلێکی پاسیڤ و ناچالاک ناتوانن کاریگەری لەسەر دەسەڵات بنوێنن و ببنە نوێنەری ئەندامان و کۆمەڵگە، بەڵکو زیاتر نوێنەرایەتی ئیرادەی ئەو حیزبە باڵادەستە دەکەن کە هەژموونی بەسەریاندا هەیە.

---

١. ئیحسان وەڵزی و موسڵح ئیروانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨.

## لیستی سەرچاوەکان


**١.** ئیحسان وەڵزی و موسڵح ئیروانی،(٢٠٢٠) کۆمەڵگەی لێکترازاو: هاوبەندی کۆمەڵایەتی و سیاسەتی شوناس، لە کتێبی سیاسەت و کۆمەڵگە لە باشووری کوردستان، هەولێر، ئینستیتووتی سیاسەتی گشتی.

٢. ئەمین فەرەج شەریف،(٢٠١٩) حوکمڕانی باش لە هەرێمی کوردستاندا- توێژینەوەیەک لە پایە و ئاستەنگەکانی، و.لوقمان حاجی قادر، چاپخانەی هێڤی- هەولێر.

٣. محەمەد حوسێن،(نیسانی٢٠٢٠) چینی ناوەڕاست لە کوردستاندا: ڕۆڵ و کاریگەری لە گەشەی ئابووری و حکومڕانی باشدا، ناوەندی کوردستان بۆ توێژینەوە لە ململانێ و قەیرانەکان، سلێمانی، گردی سەرچنار.

٤. عەبدول عەلی قەوام،(٢٠٠٩) بەربەستەکانی گەشەسەندنی سیاسی، و.هیوا مەجید خەلیل، چاپخانەی موکریانی- هەولێر.

٥. ڕزگار محمد قادر،(٢٠٠٧) لەپێناو کوردستانێکی نوێدا، چاپخانەی منارە، هەولێر.

٦. جەبار ئیسماعیل ئەحمەد،(٢٠١٩) چەمکی دەسەڵات لە هزری ڕامیاری میشێل فۆکۆدا و دەرکەوتەکانی لە هەرێمی کوردستان- عێراق، ماستەرنامە، زانکۆی سلێمانی- کۆلێژی زانستە ڕامیارییەکان، سلێمانی.

٧. پێشڕەو عەلی محەمەدئەمین،(٢٠١٩) کاریگەری حکومڕانی دروست لەسەر کاراکردنی ئەرکەکانی سیستەمی سیاسی، دکتۆرانامە، زانکۆی سلێمانی- کۆلێژی زانستە ڕامیارییەکان، سلێمانی.

8 Mohamad zahir akbary,( 8/feb/2021) why democracy is not succecsfull in third world countries,daily outlook Afghanistan, http://www.outlookafghanistan.net/topics.php?post_id=25415.

٩. محمد ڕحمان احمد،(٢٠٢١/٢/١٧) پەیوەندی نێوان دەسەڵات و هێزەکۆمەڵایەتەکان لە هەرێمی کوردستاندا، ناوەندی حەمرین بۆ توێژینەوەی ستراتیژی

http://www.hamrincenter.com/News.aspx?id=77&MapID=11&fbclid=IwAR2PFuc ، .dP-GrusKePinPopnb8kOgGkGBfl8CgB0C7-Ujr3DqtYZ1Fidp3g8

١٠. بڵاوکراوەی سایتی درەو میدیا، لە (٢٠٢١/٤/٩)،

.https://www.facebook.com/drawmedia/posts/947199719442345

١١. چاوپێکەوتنی سایتی ئاژانس لەگەڵ ئایدن مەعروف، لە (٢٠١٩/٣/١٠)، سایتی ئاژانس،

https://azhans.krd/%D8%B3%D9%87%E2%80%8C%D8%B1%DB%86%D9%،1/5/2021 83%DB%8C-%D9%81%D8%B1%D8%A7%D9%83%D8%B3%DB%8C%DB%86%D9%8 6%DB%8C-%D8%A8%D9%87%E2%80%8C%D8%B1%D9%87%E2%80%8C%DB%8C- ./%D8%AA%D9%88%D8%B1%D9%83%D9%85%D8%A7%D9%86%DB%8C

١٢. غالب موحەمەد، (٢٠٢١/٢/١٧) سنور میدیا،

.https://www.snurmedia.com/all-details.aspx?jimare=16993



# ئەبوبەكر كاروانی:

# بەدرێژایی مێژوو ناسیۆنالیزمی کوردیی هێندەی ئێستا لە قەیراندا نەبووە

**گفتوگۆ: سەڵاح سالار**

**لە ڕابردوویەکی دوور و نزیکدا کورد دەریایەک خوێنی بەخشیی و دەیان هەزار ڕۆڵەی خۆی کردە قوربانیی و ئەوەندەی کارەسات و ڕووداوی نالەبار و خوێناویی بەسەردا هات کە بە دەیان و سەدان ڕۆمان و دراما و فیلمی سینەمایی تۆمار ناکرێت. کورد ئەم هەموو شۆڕشەی کرد بۆئەوەی بە مافی خۆی بگات و کیانێکی نیشتمانیی و نەتەوەیی خۆی هەبێت و لەبری دوژمن و نەیارەکانی خۆی حوکمڕانیی خۆی بکات. ئێستا سێ دەیەیە کورد خۆی حوکمڕانیی خۆی دەکات، کەچی ئەوەی دەسەڵاتدارانی کورد بە کوردیان کردووە، با بە دەواری شڕی نەکردووە، پێویستە ساتمە لەسەر ئەم دۆخە بکرێت و پەنجە لەسەر برینەکان دابنرێت و بزانین بۆچی گەلی کورد پەشیمانە لەو خەباتەی کردوویەتی. لەم دیمانەیەدا نووسەر و ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدار ئەبوبەکر عەلی (کاروانی) شەنوکەوی ئەم نالەبارییەی ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستانمان بۆ دەکات.**

**+ ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێم لە دەستپێکەوە تەندروستبوو، یاخود هەر لە بنەڕەتەوە بە خواریی بنیاتنرا؟**

- بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێت دیدێکی هەمەلایەنەمان هەبێت و ژێرخان و سەرخان و دەستپێکەکە لە یەکدی جیابکەینەوە. ئەگەر ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێم بە توندیی بە هێزە سیاسییەکان و بەتایبەتیش یەکێتی و پارتییەوە گرێدرابێت، هەروەها بەرهەمی قۆناغێکی دوورودرێژی بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستی چەکداریی بێت، تێدەگەین کە هەر لە بنەڕەتەوە کێشەی ئەم هێزانە لەسەر ئاستی ناوخۆیی هەریەکەیان و پەیوەندیی نادروستیان بەیەکەوە ململانێ نانیشتمانییەکەیان بۆماوەی دەیان ساڵ، کە چەندین گەڕی شەڕی ناوخۆی لێکەوتووەتەوە بۆ ناو دامەزراوە بەراییەکانی ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێم گوازراوەتەوە.

بەوەش هەر لە سەرەتاوە، بێ هیچ بەخۆداچوونەوە و گۆڕانکارییەکی جدیی و ڕاستەقینە لە کولتووری سیاسیی و عەقڵیەتی هێز و سەرکردە و نوخبە حیزبییە دەستڕۆیشتووەکە، کێشەی بۆ ئەزموونی حوکمڕانیی دروست کرد. ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێم هەروەک کێشە و ململانێ و شەڕەکانی دوای ئەو دەریانخست، ئاشتبوونەوەیەکی نیشتمانیی ڕاستەقینە نەهاتووەتە کایەوە، کاری بەیەکەوەیی هێزەکان لە فۆرمی بەرەی کوردستانی هێندەی تەقەوەستان و سڕکردنی ململانێ خوێناویی و دواکەوتووەکان بوو بۆ کاتێکی دیاریکراو و دواخستنی هەندێ گەڕی شەڕبوو، ئاماژەنەبوو بۆ بەخۆداچوونەوەیەکی ڕاستەقینە و تێگەیشتن لە ئەرکە نوێکان و قۆناغە تازەکە و پێویستییەکانی و گواستنەوە لە شێوازی کارکردنی عەقڵیەتی شاخ بۆ فۆرمی نوێی کاری حیزبی و کولتووری سیاسیی و بەڕێوەبردنی جیاوازییەکان و ڕوانینە ڕۆڵی هێزەکان لە دۆخێکی جیاوازدا.

هێزەکان (یەکێتی و پارتی) خۆیان بۆ بەرکەوتە و ئەرکەکانی قۆناغە نوێکە و پێنانە ناو ئەزموونێکی دیموکراسیی و کاری بەیەکەوەیی لە سایەی کێبڕکێی مەدەنی ئامادە نەکردبوو، بەڵکو وا سەیری دۆخەکەیان دەکرد، کە ئەوەی بە شەڕ دژ بەیەک بۆیان نەکراوە بە ڕێی هەڵبژاردنەوە بە پشتیوانیی لەشکرە حیزبییەکان بیکەن. بۆیە ئاسان نەبوو بردنەوە و دۆڕان بەرانبەر یەکتر بە واتا دیموکراسییەکەی قەبوڵ بکەن. ئەوەش دۆخی پەنجا بە پەنجای لێکەوتەوە، کە دواتر بوو بە سەرچاوەی ناکاراییی حوکمڕانیی و ململانێی نادروست و لاوازیی دامەزراوەکان و سەرەنجام تەقینەوەی گەڕێکی نوێی شەڕی ناوخۆ.

بەکورتی سەرەتای ئەزموونی حوکمڕانی هەرێم بۆ خەڵکی ئومێدبەخشبوو، چونکە هێشتا هێزەکان لە پێگەی حوکمڕانیدا تاقینەکرابوونەوە. یەکێتییەکی فشەڵی شکڵیی نێوان هێزە چەکدارەکان پێکهاتبوو. بەڵام زۆری نەخایاند ئەم سەرەتا ئومێدبەخشانە بە سەرهەڵدانەوەی جەنگی ناوخۆ، کاڵبوونەوە.

(ئیرادە و ئیدارە و خاک) لە هەرێمدا کەرتبوون، سیستمی حوکمڕانیی بەرەو داڕزان ڕۆیشت، جەنگ بووە هۆی زیندووکردنەوەی هەندێ لە توخمە دواکەوتووە کۆمەڵایەتیی و کولتوورییەکان، وەک پێویستییەکی هاندان، لەوانەش پەرەدان بە تالانی و تۆڵەسەندنەوەی کوێرانە و سەرهەڵدانی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات، لەسەر حسابی ڕەنج و ئازاری هاوولاتی، کە هەر لە بنەڕەتەوە ئابلۆقەی هەژاریی و گرانیی بڕستی لەبەر بڕیبوو.

**+ ئایا دەسەڵاتدارانی هەرێم توانییان لۆژیك و عەقڵی قۆناغی شۆڕش تێپەڕێنن و سەردەمییانە حوکمڕانیی بکەن، یان تۆختریان کردەوە؟**

- بێگومان بەشێوەیەکی گشتی نەخێر، کێشەکەش لەوەدا بوو، کە کێشەی حوکمڕانیی تەنیا عەقڵی شۆڕشگێڕی نەبوو، کە کێشەی قوڵی لەگەڵ لۆژیکی دەوڵەتداریی و سەروەریی یاسادا هەیە، بەڵکو خودی عەقڵیەتی شۆڕشگێڕییەکە، بەهۆی کەرتبوونە حیزبییەکان و جەنگی دەیان ساڵەی ناوخۆ، پاوانکردنی ناوچەی جوگرافی و دابەشکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە لەسەر بناغەی ناوچە و هێز و نفوزی چەکداری، ناوەڕۆکی شۆڕشەکە و ناسیونالیزمی کوردیی شێواندبوو. شۆڕشی نوێی کوردستان یاخود بزووتنەوە چەکدارییەکەی لەدوای نسکۆی ١٩٧٥ و هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلول، بەدەست جۆرەها لاوازیی ستراتیژییەوە دەیناڵاند، بەشێکی بەرچاوی وزە و تواناکانی لە جەنگ و ململانێ لەگەڵ یەکتردا و بە دوژمن دانانی یەکتر بەهەدەر دەدا! فرەهێزیی دەرفەتی بۆ سەرکردایەتی و ستراتیژی هاوبەش نەهێشتبووەوە.

تەنیا ساڵی ١٩٩٦، کە بەهاوکاریی کۆماری ئیسلامیی ئێران دەستکرا بە زەمینەسازکردن بۆ ئاشتەوایی نیشتمانیی و کارکردنی هاوبەش. ئەم فۆرمە لەگەڵ لاوازیی و نەبوونە هۆی دابڕان لە قۆناغی پێشوو ڕۆڵی هەبوو لە قۆستنەوەی دەرفەتی دوای جەنگی کەنداوی یەکەم و ئەنجامدانی ڕاپەڕین. بەڵام هەروەک لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا ئاماژەمان پێکرد، دۆخی نوێ یەکسان نەبوو، بە عەقڵیەتی نوێ و ڕزگاربوون لە کەلەپوور و کەلتووری مێژوویەکی شوم و نەگریس لە یەکتر بە نەفرەتکردن و لەگەڵ یەک جەنگاندن و دوژمن بەخۆخۆشکردن و نائومێدیی بەشێک لە گەلەکەمان بە بزووتنەوە چەکدارییەکە.

عەقڵیەتێکی شۆڕشگێڕیی لە بنەڕەتدا شێواو و بیمار، نەیتوانی ئەو دەرفەتەی لە سایەی گۆڕانکارییەکانی کۆتایی جەنگی سارد و هەڵە ستراتیژیەکەی سەدام بە داگیرکردنی کوێت خولقاندبوو، بقۆزنەوە و بکەونە بیناکردنەوەی توانا و پەیوەندییەکان و دامەزراندنی دامەزراوەی نیشتمانیی بەهێز. هەربۆیە پشتبەستن بە ڕەوایەتی شۆڕشگێڕیی بە ئارایشتێکی دیموکراسییەوە تا ئەم ساتە وەختەش بەردەوامیی هەیە، بوونی هێزی چەکداریی حیزبیی و ناوچەی نفوز و پاشماوەکانی جەنگی ناوخۆش لەم ڕووەوە بەڵگەی حاشاهەڵنەگرن.

**+ هێزە ئیسلامییەکان هەر لە سەرەتاوە بەشداریی ئەم پرۆسەیەیان کرد، ئایا ئەمانە کارێکی باشیان کرد یان دەبوو لە بنەڕەتەوە ئۆپۆزیسیۆن بوونایە؟**

- هێزە ئیسلامییەکان پێوستیان بەوە بوو، لە هەردوو ڕووی فیکریی و مەیدانییەوە خۆیان لەگەڵ دۆخە نوێیەکەی دوای ڕاپەڕین بگونجێنن. بۆ ئەم مەبەستەش پێویستیان بە خۆنوێکردنەوەی فیکریی و سازش هەبوو، چونکە پاشخانی فیکریی ئەوانیش بە ئاستی جیاواز، لەگەڵ ئەزموونێکی دیموکراسیی سازگار نەبوو، ئەو کولتوور و ئایدۆلۆژیایەی ئەوانی لەسەر پێگەیشتبوو، بە سەنتەرکردنی پیادەکردنی شەریعەت، دەوڵەتی ئیسلامی، گێڕانەوەی خەلافەت و دژایەتی دیموکراسیی و فرەیی و نەتەوایەتیی و بەشداریی ژن و زۆر شتی تر بوو. کە هەموو ئەوانەی پێشەوە بەشێکی گرنگی ئەدەبیاتی بزاڤی ئیسلامیی نوێ بوون. هەربۆیە ئیسلامییەکان باشیان کرد، هەروەها پێویست بوو وەک بەشێ لە پرۆسەی خۆگونجاندن لەگەڵ هەلومەرجە نوێیەکە و مەشقکردن لەسەری، بە لیستێکی هاوبەش بەشداریی یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانیان کرد. ئەم سەرەتایە لە دوو ڕووەوە گرنگ بوو:

یەکەم: کاری هاوبەشی نێوان ئیسلامییەکان، کە بە دوو ئاڕاستەی جیاواز کاریان دەکرد. دووەم: پەیام ناردن بۆ دەوروبەر، کە ئیسلامییەکان دەتوانن بەشێک بن لە دۆخە نوێیەکە.

ئیسلامییەکان بە حوکمی ئەوەی تۆمەتباربوون بە دژایەتی دیموکراسیی و نەتەوایەتیی و فۆرمی حوکمڕانیی نوێ و کاری یاسایی و ئاشتیخوازانە و کێبڕکێی مەدەنی، هەروەها هەستیان دەکرد لە ڕووی ئەمنییشەوە پێویستیان بە پارێزبەندیی و پارێزگاریکردن لە خۆیان و (تطبیع)بوون لەگەڵ دۆخە نوێیەکە هەیە، پێویستیانبوو بەشداریی پرۆسە سیاسییەکە ببن و خۆدوور نەگرن، چونکە خۆدوورگرتن و ڕەتکردنەوەی دۆخە نوێیەکە و بە عەقیدەیی مامەڵەکردن لەگەڵیدا، دەبووە هۆی بەئامانجگرتنیان و دابڕان لە جەماوەر و هێندەی تر شێواندنی ناوبانگ و پرۆژەکەیان. ئەو شتەی دواتر بۆ باڵە چەکدارییەکە هاتە پێشەوە و وزە و توانایەکی زۆر و زەوەندی لە تەوژمە ئیسلامییەکە سەرف کرد. دیارە ئیسلامییەکان لە یەکەم کابینەی حکومەتدا بەشدار نەبوون.

دوای ئەوەش شەڕی ناوخۆ دەستیپێکرد، حکومەت و تێکڕای ئەزموونە حوکمڕانییەکە کەوتنە قەیرانێکی قوڵەوە و دۆخەکە چووە ئەودیو باسوخواسی حیزبە حوکمڕانەکان و ئۆپۆزسیۆنەوە. بەحوکمی ئەوەی ئۆپۆزیسیۆن بەواتا مەدەنییەکەی زادەی دۆخی سەقامگیری سیاسیی و ناتوندوتیژیی و ڕێککەوتن لەسەر سیستم و یاساکانی گەمەی سیاسییەکەیە.

ئیسلامییەکان لە قۆناغی شەڕی ناوخۆدا بەسەر دوو ئاڕاستەدا دابەش بوون و ئاسان نییە وەک تەوژمێکی خاوەن دیدی هاوبەش هەڵسەنگاندنیان بۆ بکەین. بەڵام دوای دووکەرتبوونی حکومەتی هەرێم، ئایا باشبوو، ئیسلامییەکان بەشداریی ئیدارەی هەولێر و سلێمانییان کرد، کە لەژێر قورسایی خۆپاراستن و پەیداکردنی سەرچاوەی دارایی و بۆ باڵە چەکدارەکەش ئاساییکردنەوەی بەشێ لە پەیوەندییەکان کران؟

لەگەڵ ڕەوابوونی پاساوەکان، ئیسلامییەکان ئەگەر بیانتوانیایە لەو قۆناغەدا بەشداریی نەکەن باشتر بوو، ئەویش لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: نارەزایی دەربڕین بەرانبەر دۆخی دوولەتبوونی هەرێم.

دووەم: نەبوونی بە بەشێک لە نەریتییەکانی ئەو قۆناغەی ئەزموونە شێواوەکە و شێواندنی وێنایان وەک هێزگەلێک بەدوای بەرژەوەندیی بەرتەسکی حیزبیی خۆیانەوە نین.

**لە هەرێمدا کێشەیەکی زەقی ململانێ و بەیەکدادانی نەتەوەیی، مەزهەبی، خێڵەکی و تەنانەت لە ئێستادا ئایدۆلۆژییشمان نییە. پێکەوەژیانی ئایینی و نەتەوەیی و مەزهەبیی لە ئاستێکی بەرچاودا هەستی پێ دەکرێت.**

لە قۆناغی دوای ڕزگارکردنی عێراق و ڕووخاندنی ڕژێم دەرفەتێکی نوێ و گرنگ بۆ ئیسلامییەکان هاتبووە پێش بۆئەوەی ببنە خاوەنی ڕەوایەتیی چاکسازیی وەک پێویستیی قۆناغەکە و دواتر نوێنەرایەتی نارەزایەتییەکان و ئۆپۆزسیۆنبوون، بۆ ئەوەی ببنە هێزێکی گرنگ و دەستپێشخەری بکەن. کەچی لەبری ئەوە بەشداریی حکومەتیان کرد. ئەوەی واشی لە ئیسلامییەکان کرد نەتوانن ئەو دەرفەتە بقۆزنەوە، کە دواتر بزووتنەوەی گۆڕان ئەو بۆشاییەی پڕکردەوە و بوو بە تەحەدایەک بۆیان، کۆمەڵێ هۆکار بوو، لەوانەش:

١- لاوازیی و نوێنەبوونەوەی فیکریی و شێوازی کار و دەستبەردارنەبوونی فۆرمی (ئیسلامی سیاسی) لەکاتێکدا ئەو ئەرکە لەبەر زیاد لە هۆیەکی پەیوەست بە خەڵک و ئەزموونی ئیسلامیی ناوچەکە و شێواندنی وێنا و ڕوونەبوونی ئایندە و نموونە حوکمڕانییەکەیان و دوژمنایەتی توندی دەوروبەر و نوخبە حوکمڕانەکان بەدی نەدەهات.

٢ ـ لەسەر پێی خۆ نەوەستانی دارایی.

٣ ـ خۆ وا وێناکردن کە ئەوان دەبوا قاچاخ بن.

٤ ـ پرشوبڵاویی ڕیزەکانیان و ناکۆکی نێوانیان و کۆنەبوونەوە بە دەوری ستراتیژێکی هاوبەشدا.

بەشێوەیەکی گشتیی بەشداریکردنی ئیسلامییەکان لە ڕووی چاوکردنەوە و وێناکردن وەک بەشێک لە واقیعە کوردستانییەکە و پەیداکردنی هەندێ شارەزایی بەسوود بوو، بەڵام بەشدارییەکی بێ ستراتیژبوو، لە چوارچێوەی دید و ستراتیژێکی هەمەلایەنەی گەورەتردا نەبوو، بۆ کاری سیاسیی گەشەکردن و ئیدارەکردنی ململانێکان و قۆستنەوەی دەرفەتەکان. هەربۆیە بەشداربوو لە شێواندنی وێنایان و سەیرکردنیان وەک هێزی تەقلیدیی ناکارا و بژاردەنەبوون لە بەردەمی خەڵکدا. هەڵبەت لێرەدا لە ڕوانگەی خودی بەشدارییەکەوە بە تەنها داوەریی ناکرێت، چونکە کات و جۆری بەشدارییەکەش گرنگن و دەبێت حسابیان بۆ بکرێت.

**+ ئیسلامییەکانیش دوو مۆدێل بوون، ئایا بە هەردوو جۆر و ڕەنگەکەوە توانیان بیسەلمێنن ئەمانە بڕوایان بە پێکەوەژیانی سیاسیی هەیە و خزمەتی خەڵك دەکەن، یاخود بوونە بار بەسەر ئەزموونەکەوە؟**

- سەرەتا دەبێت بڵێین: ئیسلامییەکان هێزی سەرەکیی گۆڕەپانەکە نەبوون، بەڵکو هێزێکی تازە سەرهەڵداو و واقیعە کوردییەکە بوون، دەرفەتی نەوەدەکانیان لەدەست دا، کە دەیانتوانی ببنە هێزێکی گەورە و سەرەکیی هەرێم، چونکە دەرفەت بۆ ئەوە گونجاو بوو، بەڵام قەیرانی فیکریی و سەرکردایەتیی و سەرقاڵبوون بە ململانێی ماندووکەر و لاوەکیی و کەوتنە ناو ستراتیژی بەرامبەرەوە، دەرفەتی ئەوەی لێ سەندن.

پرسیارەکەش سێ ڕەهەند لەخۆ دەگرێت:

١ ـ ئایا ئیسلامییەکان بە شەبەنگە جیاوازەکانیانەوە توانیان بیسەلمێنن بڕوایان بەیەکەوەژیانی سیاسیی هەیە؟

لە وەڵامی ئەم بەشە لە پرسیارەکە دەڵێین: بەشە ناچەکدارەکە، کە لە یەکگرتوودا بەرجەستە دەبوو، بەشێوەیەکی گشتیی توانی ئەمە بسەلمێنێت، چونکە توانی بە هەر پاڵنەرێک بێت خۆی لەگەڵ کاری مەدەنی و فرەیی و دیموکراسی و ناسیونالیزمی کوردیدا بگونجێنێت و مامەڵە لەگەڵ هێزە جیاوازەکان بکات و ئایدۆلۆژییانە مامەڵە نەکات.

هەرچی باڵە چەکدارییەکەیە، لەم ڕووەوە لە هەڵکشان و داکشاندا بوو، لەناوخۆشدا یەکگرتوو و تۆکمە و خاوەن دیدێکی هاوبەشی نەبوو، لە ڕووی فیکرییەوە بەشێکی کەوتبووە بەر کاریگەیی جیهادی ئەفغان و تیۆرسینی سەلەفی جیهادی.

ئەم باڵەش هەر لە سەرەتاوە بە بەشداریی لە یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا، بە کردار لە دووتوێی ڕووداوێکدا ئەو سەرەتایەی دەستپێکرد کە ئاماژە بوو بۆ ئاقاری خۆگونجاندن لەگەڵ دۆخە نوێیەکە و هەڵکردن لەگەڵ هێزەکانی تردا. بەڵام ئەمە هێندەی هەڵوێستێکی پراگماتی بوو، بەو ئەندازەیە ڕەنگدانەوەی دیدێکی تۆکمەی فیکریی نەبوو.

چونکە بەردەوام ڕەخنەی لە هێزە ئیسلامییە ناچەکدارەکە دەگرت، بەوەی بڕوای بە جیهادی چەکداریی نییە و کێشەی (عقیدە) و (ولاء و براء)و تێگەیشتنیان لە ئیسلام هەیە و (عیززەتی) ئیسلامیان لەدەست داوە و مامەڵە لەگەڵ واقیعێکی نائیسلامییدا دەکەن.

هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ و تێوەگلانی هێزە چەکدارەکە لە شەڕەکە و ناچاربوون بۆ پاشەکشەکردن لە شارەکان و بۆ کەنارە دوورە دەستەکان، کاریگەریی خراپی لەسەر دیدگا فیکرییەکانی بەجێهێشت. بەتایبەتیش هەندێ لەو ڕەمزانەی فتوای فیکریی و فیقهییان دەدا. ئۆباڵی بنەڕەتی ئەمەش لە ئەستۆی پارتی و یەکێتیدا بوو، کە نەیانهێشت ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێم سەرپێ بکەوێت و کۆمەڵگە و هێزەکان بەشێوەیەکی سروشتیی قۆناغی گواستنەوە بۆ دۆخی دوای ڕەوایەتی شۆڕشگێڕیی و بەکارهێنانی هێزی دژ بەیەک بڕۆن لەم قۆناغە (کە پێشتریش ئەمە دەستپێکردبوو) باسکردن لە بوونی دووبەرەی (کفر) و (ئیمان) و ناونانی جەنگی نێوان خۆیان و بەرانبەرەکان بە (جیهاد) و تەکفیری هەندێ دامەزراوە و بە حەرامدانی بەشداریی لە حکومەت و ژیانی سیاسیی و پۆلێنکردنی عەقیدییانە بۆ گۆڕەپانە سیاسییەکە و زۆر شتی تر لای بەشێک لە سەرکردە و ناوەندەکانی بزووتنەوە چەکدارییەکە پەرەیان سەند.

بەڵام خۆشبەختانە ئەمە نەبووە هۆی ئەوەی هێزەکە بەتەواوی بەرەو سەلەفیەتی جیهادیی و تەکفیر و ڕەتکردنەوەی مامەڵەکردن لەگەڵ بەشداریی سیاسیی بەرێت. گەرچی ئەو بیرکردنەوانە بوون بەهۆی زیانگەیاندنێکی گەورە بە توانا ماددیی و مرۆییەکانی هێزەکە و لەدەستدانی دەستکەوتی دەرفەت و هەلدانەدەست بۆ لێدان و ئابڵوقەدانی.

دژ بە یەکەکانی ناو بزاڤە چەکدارییەکە دواتر زیاد لە کەرتبوونێکی بەدوای خۆیدا هێنا، هەندێ لەوانیش کە دواترینیان (انصار الاسلام) بوو، بەتەواوەتی خۆیان بە ئاقاری سەلەفیەتی جیهادییدا یەکلاکردەوە و تەکفیری بەرامبەریان کرد و واقیعیان ڕەتکردەوە. بەڵام بەدەنەی گشتیی بزاڤەکە بەئەزموون وەرگرتن لە ململانێ و جەنگەکان و ئەو کێشانەی لێیان کەوتەوە و بێسوود بوونی هەندێ لە دروشم و قەناعەتە پێشووەکان لە کاتی هەوڵدان بۆ پراکتیزەکردنیان و هۆکاری تر. بەشداریی حکومەتیان کرد، بەوەش ئیعازێکی تریان خستیانە ڕوو کە دەتوانن دەستبەرداری هەندێ لە دروشم و بۆچوونە ناواقیعییەکەی ڕابردوویان ببن و ببن بە بەشێک لە حکومەتێکی عەلمانی.

هەڵبەت ئەمە بە چاکە بۆیان دەنوسرێت و بە خاڵی لاواز لەسەریان حساب ناکرێت، بزاڤەکەش بە بەراورد لەگەڵ چەندین بزاڤی چەکداریی تری دنیای ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ بوونی (باڵی توندڕەو) لەناویدا بە میانەڕەو دادەنرا.

بە تێپەڕینی ڕۆژگار ئەم بزاڤە توانی بە بەشێک لە قەناعەتەکانیاندا بچێتەوە و زیاتر

دەست و پەنجە لەگەڵ هەندێ بەها و چەمکی فیکری سیاسیی نوێ و فرەیی سیاسیی هەڵبکات و ببێتە بەشێک لە دیمەنە سیاسیی و حوکمڕانییەکەی هەرێم.

٢ ـ خزمەتی خەڵک: ئیسلامییەکان بەشێوەیەکی گشتیی و ئەوەندەی پێیان کرابێت هەوڵیانداوە خزمەتی خەڵکی خۆیان بکەن و نەبن بەبار بەسەریانەوە، ئەوەش لەڕێی هەندێ شێواز و ڕێگەوە، لەوانەش:

أ. هێنانی چەندین ڕێکخراوی ئیسلامیی خێرخوازیی جیهانیی بۆ هەرێمی کوردستان و بەهاناوەچوونی گەلی هەرێمەکە لە سەردەمێکی سەختی وەکو ئابلۆقەی سەپاوی ئابووریی و گرانیی و شەڕی ناوخۆ و نیمچە پەککەوتویی دامەزراوە گشتییەکان، ڕێکخراوە خێرخوازییەکان وەکو: (ڕابیتەی ئیسلامیی کوردی، ئیغاسەی ئیسلامی، نەدوە، سەلام، بزاڤ و..) هتد. توانیان خزمەتێکی گەورە بە خەڵک بکەن و کۆمەکی هەزاران خێزانی بێدەرەتان و بێباوک بکەن و بەشدارییی لە ئاوەدانکردنەوەی کوردستاندا بکەن. لە ئێستاشدا ئەو گیانە خێرخوازیی و بەدەمەوەچوونەی ئیسلامییەکان لەپشت دروستکردنییەوە بوون، لە بەرگی چەندین ناونیشان و ڕێکخراو و چالاکیدا، بەشێوەی جۆراوجۆر لە خزمەتی کۆمەڵگە و بەتایبەتیش توێژە هەژار و کەمدەستەکەی کۆمەڵن.

ب ـ پێگەیاندنی سەدان: زانای ئایینی، ڕۆشنبیر، ڕاگەیەندکار و مرۆڤی پەروەردەکراو و پێشکەشکردنیان بە کۆمەڵگە. کە لەناو ئیسلامییەکان و دەرەوەی ئەوانیشدا بە شێوازی جۆراوجۆر خزمەت دەکەن.

ج ـ ڕێگەگرتن لە سەرهەڵدان و تەشەنەکردنی گرووپی تەکفیریی و جیهادیی توندڕەوی هاوشێوەی (ئەلقاعیدە) و (داعش) بەتایبەتیش دوای سەرهەڵدانی (داعش) و ئەو مەترسییە ئایدۆلۆژیی و سیاسیی و سەربازییەی بۆ سەر ناوچەکە و لەوانەش هەرێم دروستی کرد.

ئیسلامییەکان بەگشتی بەشێک بوون لە وزە نیشتمانییەکە بۆ بەرەنگاربوونەوەی داعش، لەڕێی دارِنینی ڕەوایەتی ئایینی لە داعش و هێرشەکانی، پشتیوانی بەرەکانی، ڕاگەیاندن و زۆر شتی تر، توانییان لە هەلومەرجێکی ناسک بەشدارییی لە پارێزگاری لە گەل و وڵاتەکەیان بکەن بەرانبەر هێزێکی ڕەش و ترسناکی وەکو داعش.

د ـ بەشداریکردنی بەشێک لە ئیسلامییەکان لە هەوڵ و لیژنەکانی ئاشتیی لەکاتی شەڕی ناوخۆدا بەمەبەستی کۆتاییهێنان بە شەڕەکە و گێڕانەوەی ئاشتیی و ئارامیی و پێکەوەژیان بۆ کوردستان و سنووردارکردنیماڵوێرانییەکەی ئەو جەنگە بێهودەیە.

هـ ـ کارکردن لەسەر چاکسازیی کۆمەڵایەتیی و ئەخلاقیی و هەوڵدان بۆ پارێزگاریکردن لە ناسنامەی ئیسلامیی زۆرینەی کۆمەڵگە.

و ـ خزمەتکردن لە پێگەی حکومەت و ئۆپۆزیسیۆن لەگەڵ بوونی کۆمەڵێک هەڵە لە هەردوو بوارەکەدا.

ئەمە تەنیا چەند بوارێک بوون لەو بوارانەی ئیسلامییەکان بە ئاستی جیاواز خزمەتیان تێدا کردوون، کەواتە بەشێوەیەکی گشتیی بار نەبوون بەسەر کۆمەڵگەوە، چونکە سەروەت و سامان و موقەدراتی ئەم وڵاتەیان لەبەردەستدا نەبووە، تەخشانی پێوە بکەن و لە گەندەڵیی گەورەوە بتلێن. خەتا و کەموکووڕی ئەمان بەشێوەیەکی گشتی لە خۆنوێنەکردنەوە و بە قۆستنەوەی هەندێ دەرفەت و ئەنجامنەدانی هەندێ خزمەتی سیاسیی ترە، کە دەکرا ئەنجامی بدەن.

**+ بێینەوە سەر شێوازی حوکمڕانیی ئەم دوو حزبەی کوردستان، ئایا بیری ناسیۆنالیزم و خەباتی کوردایەتییان گەشە پێدا، یان جوانەمەرگیان کرد و بزماریان لە تابووتی دا؟**

ـ سەرەتا دەبێت بڵێین: ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێم، دوای کۆماری کوردستان، دەرفەتێکی دەگمەن و مێژوویی بوو، بۆ گەشەدان بە ناسیۆنالیزمی کوردیی و کوردستانیی و بیناکردنەوەی چەمکی نەتەوە و ڕاستکردنەوەی هەڵە و شێواوییەکانی ڕابردوو، خەمڵاندنی ناسنامەیەکی نیشتمانیی هاوبەش و بەرجەستەکردنێکی سیاسیی و دامەزراوەیی و ئەخلاقیی داوا ڕەواکانی کورد لەسەر ئاستی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا.

دەسەڵاتە کوردییەکەی هەرێم، قوتابخانە، ڕاگەیاندن، پێشمەرگە، فەرمانگە و دامەزراوەکانی کەوتبووە دەست، کە دەیتوانی بە قازانجی پەرەدان بە ناسیونالیزمی کوردیی و پێشکەشکردنی ئەزموونێکی گەشەکردوو بەکاری بهێنێت و بیکاتە سەرچاوەی ئومێد و هەڵسانەوە، نەک هەر بۆ گەلی کوردستانی باشوور، بەڵکو بۆ تێکڕای نەتەوەکەمان لەسەر ئاستی پارچەکانی کوردستاندا. بەڵام بەداخەوە، ڕێک بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوان دەکرا و بە ئەرک و دەرفەتی قۆناغەکە دادەنرا، ئەزموونی حوکمڕانی هەرێم، بووبە هۆی تاقیکردنەوەیەکی نائومێدکەر بۆ ئەم ناسیونالیزمە. تەقینەوەی ناکۆکییەکان لە شێوەی شەڕی ناوخۆدا، دابەشکردنی کوردستان بۆ دوو میرنشینی حیزبی، شوێنگرتنەوەی دەڤەر بۆ نیشتمان، خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات و گەندەڵیی و دەوڵەمەندبوونی نارەوا، درێژەکێشانی ناکۆکییە مێژووییە دارزێنەرەکانی جەستەی ناسیونالیزمی کوردیی لە نێوان یەکێتی و پارتی، ناعەدالەتی و نا یەکسانی لە دابەشکردنی ساماندا، لاوازیی سەروەریی یاسا و بێلایەنی و سەربەخۆیی دادگاکان، نەبوونی هێزێکی نیشتمانیی چەکدار، نەخەمڵینی ناسنامەیەکی نیشتمانیی یەکگرتوو، کەمتوانایی لە چارەسەرکردنی کێشە و قەیرانەکان، لەدەستدانی سەرمەشقی نوخبەی حوکمڕان و متمانەیان لەلایەن زۆرینەی گەلەوە و زۆر شتی تر بوون بە هۆکاری

ئەوەی، نەک هەر ناسیونالیزمی کوردیی لاواز و ناکارا بێت، بەڵکو قەوارەی هەرێمیش بخاتە مەترسییەوە، باسکردن لە هەرێم و کوردستان و پاراستنیان و ناسیونالیزمی کوردیی ببێتە مایەی پەلاماردانی ئەو کەس و لایەنانەی دەیانوروژێنن و باسیان دەکەن. بەجۆرێک ڕەنگە هیچ برگەیەکی مێژوویی بە ئەندازەی ئێستا ناسیونالیزمی کوردی لە قەیراندا نەبووبێت، چونکە بەهێزیی ناسیونالیزمیی مەرجەعیەت و ڕەمز و دامودەزگای نیشتمانیی و سەرمەشقی نوخبەی حوکمڕان و هەست و ئامانج و ستراتیژی هاوبەش و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی دەخوازێت، بەتایبەتیش لە پێگەی حوکمڕانیدا. ناسیونالیزمی کوردیش لە سۆنگەی نەبوونی دەوڵەت و سەربەخۆییەوە لە چەندین هۆکاری بەهێزبوون و گەشەکردن ئەوەش دەیخواست سەرکردە و نوخبە و هێزە خۆ بە ناسیونالیستەکان، لە ئاستێکی لێپرسراوی سیاسیی و نیشتمانیی و ئەخلاقییەوە بەهێزتر بونایە، بۆئەوەی قەرەبووی بۆشایی نەبوونی دەوڵەت بکەنەوە. بەرژەوەندییە نیشتمانییەکان و چاکەی گشتی بخەنە سەر و بەرژەوەندییە تاکە کەسیی و گرووپیی و ناوچەیی و حیزبییەکانەوە تواناکانی وڵات بۆ خۆشگوزەرانی و سەربەرزیی گەلەکەیان بەکار بێنن، لە ڕووی داهات و سامانی گشتییەوە ڕوون و ئەمانەتدار بن.

بەڵام بەداخەوە هیچ یەک لەمانە نەهاتنە دی، بۆیە ناسیونالیزمی کوردیی پیر بووە، گڕەکەی کز بووە، وێنەی لەگەڵ یەکێتی و پارتی و ئەزموونە حوکمڕانیەکە تێکەڵ بووە و باجی هەڵە و خراپییەکانی نوخبەی حوکمڕان دەدات و پێویستی بە بوژاندنەوە و بیناکردن و موتوربەکردن بە هەندێ بەهای گەردوونیی و لەوانەش بەها ئیسلامییەکان لە داهاتوودا چاویان لەو ڕۆڵ و ئەرکە بێت، ناسنامەیەکی نیشتمانیی و هەست و ئامانجی هاوبەشدان بە دیموکراسی و حەکمڕانی باشیش مانایان نامێنێت، بۆیە بەدیلی ناسیونالیزم هەر ناسیونالیزمە، بەڵام ناسیونالیزمی مەدەنیی و نیشتمانیی و کۆک لەگەڵ ناسنامەی ئیسلامیی زۆرینەی کۆمەڵگە.

**+ ئەم دیموکراسیی و عەلمانیەتەی ئەمان چەند لە وڵاتانی دونیا پێشکەوتووترە وەك خۆیان وا بانگەشەی بۆ دەکەن تا ئەزموونەکەیان بگوازنەوە بۆ وڵاتانی تر؟**

ـ ئەگەر هەڵسەنگاندنێکی گشتی بۆ ئەزموونی دیموکراسی هەرێم بکەین، دەتوانین بڵێین: ناتەواو و سنووردارە. ئەمەش هەندێکی ئاسایی دەبوو ئەگەر لەسەر ڕەوتی گەشەکردنی سروشتی خۆی بوایە و ڕۆژبەڕۆژ بەرەو فراوانبوون و پێگەیشتویی زۆرتر بڕوات و ناتەواوییەکانی پڕبکاتەوە. چونکە هیچ ئەزموونێکی دیموکراسیی بە کامڵی لەدایک نابێت، هەرێم کۆمەڵێک ڕووی گەشی هەیە، کە لە بنەڕەتدا ڕەنگدانەوەی کەلتوور و مێژوو و ڕۆحی کۆمەڵگەی کورد و مۆدێلە ئایینی و موسڵمانێتیەکەیەتی. لە هەرێمدا

کێشەیەکی زەقی ململانێ و بەیەکدادانی نەتەوەیی، مەزهەبی، خێڵەکی و تەنانەت لە ئێستادا ئایدۆلۆژییشمان نییە. پێکەوەژیانی ئایینی و نەتەوەیی و مەزهەبیی لە ئاستێکی بەرچاودا هەستی پێ دەکرێت، هەربۆیە کێشەی هەرێم کێشەی ناوماڵی کورد و دانونەکوڵانی سیاسییە. لە ساڵانی ڕابردوودا بەگشتیی ئاسایش لە هەرێمدا بەراورد بە بەشەکانی تری عێراق بەرقەرار بووە، ئازادیی ڕادەربڕین و خۆڕێکخستنی سیاسیی و کۆڕ و کۆبوونەوە لە ئاستێکدا هەن. گەرچی لەم دواییەدا ئازادیی ڕادەربڕین کێشەکانی بەردەمی زۆرتر بوون. ئەزموونی هەرێم بە بەراورد بە دەوروبەر، لەگەڵ پێکهاتەکانی گەلی کوردستاندا کراوەتر و لێبووردەترە، ئیسلامییەکان ئازادییان لە زۆر وڵاتی ناوچەکە زۆرترە.

بەڵام سەرەڕای ئەم ڕواڵەتانە ئەزموونی دیموکراسیی هەرێم بەدەست چەندین کەلێن و ناتەواویی ستراتیژییەوە دەناڵێنێت، بە باشتر دانانیشی لەڕابردوودا بەشێکی پەیوەندیی بە وێرانیی و دۆخی بەغدا و بەشەکەی تری عێراقەوە هەبووە، نەک خودی ئەزموونەکە.

لە هەرێمێکدا کە هێشتا بەدەست: دابەشبوون، ناکۆکی، نادامەزراوەیی هێزی چەکدار و بە حیزبی مانەوەی، نەبوونی دەسەڵاتێکی ناوەندی، گەندەڵیی و ناعەدالەتی تر، لاوازیی سەربەخۆیی و بێلایەنیی دادگا، نەبوونی ناسنامەیەکی نیشتمانیی یەکگرتوو، خەملێنی چەمکی هاووڵاتی و شێواویی ڕەوتی ژیانی حیزبیەوە بناڵێنێت، بێگومان ناتوانین باس لە ئەزموونێکی دیموکراسیی گەشەکردوو و سەقامگیر و دڵخۆشکەر بکەین، چونکە لە دۆخێکی لەو جۆرەدا هەڵبژاردنی ئازاد و پاک و دادپەروەرانە، یەکسانیی دەرفەت، ئاڵوگۆڕی ئاشتییانەی دەسەڵات، حوکمی دامەزراوەکان، کە لە پێشمەرجەکانی دیموکراسیەتن لەئارادا نابن.

بەکورتی ئەگەر ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێم لە قەیراندا بێت، دیموکراسییەکەشی بەو جۆرەیە و توانای کێبڕکێ و گەشەکردن و کامڵبوونی سنووردار دەبێت، مەترسیی گەڕانەوە بۆ دواوەشی لە ئارادا دەبێت.

**+ ئەگەر وەك کلافەیەك ئەم ئەزموونە هەڵوەشێنیتەوە و دروستی بکەیتەوە، چۆن پێکیبهێنیتەوە و کرۆك و ڕواڵەتی بەچی شێوەیەك دادەڕێژیتەوە؟**

- پرسی دووبارە بیناکردنەوەی ئەزموونی هەرێم و زاڵبوون بەسەر قەیران و کەلێن و کەموکورتییە ستراتیژیی و بونیادییەکانی، کە پێویستییەکی ئەزموونی حوکمڕانی هەرێمە، خوازیاری چەندین شتە، لەوانەش:

١- داننانی نوخبەی حوکمڕان بە واقیعی ئێستای ئەزموونی حوکمڕانی هەرێم و کێشە و قەیرانەکانی و پێویستی هەڵوێستە لەسەرکردن و چارەسەرکردن و ئامادەیی بۆ دەستپێشخەری و قوربانی لەو ڕووەوە.

٢- دەستپێکردنی گفتوگۆیەکی نیشتمانیی بە ئامانجی لێکنزیککردنەوەی دیدەکان، دروستکردنەوەی متمانە، ڕاهێنان لەسەر کاری هاوبەش، زەمینەسازکردن بۆ ئاشتبوونەوەیەکی نیشتمانیی و چوونە دۆخێکی ڕاگوزەریی و لێپرسراوێتی لە ئەستۆگرتنی هاوبەش.

٣- گرێدانی گرێبەستێکی نوێی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی بەمەبەستی دووبارە بیناکردنەوەی سیستم لەسەر سازان و لێکتێگەیشتنێکی نوێ و گونجاندنی دۆخ و دامەزراوە و چالاکییەکان لەو چوارچێوەدا، ئەوەش خوازیاری پەسەندکردنی دەستورێکی مەدەنی تەوافوق لەسەرکراوە بۆ دەرچوون لەم دۆخە و ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگە و ژیانی سیاسیی و دابەشکردنی دەسەڵات و دروستکردنی دەزگا ناوبژیوانکەرەکان و سنووردارکردن و لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و دەستنیشانکردنی شێوازی حوکمڕانیی و دەستەبەرکردنی بە دامەزراوەییکردنی هێزەکان، کۆتاییهێنان بە دۆخی ئێستا، هەموو ئەوەش دەکرێت لە ڕێی کۆنگرەیەکی نیشتمانیی گشتگیرەوە زەمینەسازیی بۆ بکرێت.

٤- کۆتاییهێنان بە ناکۆکیی مێژوویی نێوان یەکێتی و پارتی و گەیشتن بە سازانێکی مێژوویی، بەمەبەستی بەدامەزراوەییکردنی هێزەکان، کۆتاییهێنان بە ڕواڵەتەکانی شەڕی ناوخۆ و دابەشبوونی هەرێم و نەبوونی دەسەڵاتێکی ناوەندی، ستراتیژێکی هاوبەشی بەرگریی و پەیوەندییەکان و یەکخستنی تواناکان و بەیەکەوە سەرقاڵنەبوون و دەرچوون لە دۆخی ململانێ بەرەو کێبڕکێی مەدەنی.

٥- ڕێککەوتن لەسەر بەرنامەیەکی نیشتمانیی هەمەلایەنە بۆ چاکسازیی سیاسی، ئابووری، کارگێڕی، قەزایی، سەربازیی و پەروەردەیی و لەپێناو سنووردارکردنی شێرپەنجەی گەندەڵیی و ناعەدالەتیی و دەوڵەمەندبوونی ناڕەوا و بە غەنیمەت سەیرکردنی دەسەڵات.

ئەمە تەنیا چەند سەرە قەڵەم و هێڵێکی گشتیی بوون، سیستم و ئەزموونی حوکمڕانیی لەسەر بناغەیەکی نوێ و گۆڕانکاریی و چاکسازییەکی قووڵ و ڕیشەیی و زاڵبوون بە سەرکێشەکانی هەرێم و گێڕانەوەی ئومێد و متمانە بۆ هاووڵاتیان و زۆرینەی گەلی باشوور، کە ناکۆکی، گەندەڵیی و ناعەدالەتیی و کەمتوانایی نوخبەی حوکمڕان لە چارەسەرکردنی کێشەکان ماندوو و نائومێدیان کردوون و لە دۆخی سەراسیمەیی و نامۆیی سیاسیی و دەروونییدا بەسەر دەبەن. ئەم ئەرکەش ئەرکی هاوبەشی حیزبە حوکمڕانەکان، ئۆپۆزیسیۆن، ناوەندە فیکریی و ئەکادیمییەکە، کۆمەڵگەی مەدەنیی و کۆی خەمخۆرانی نیشتمان و گەلی کوردستان و ئایندەی ئەزموونە حوکمڕانیەکەیە.

شوان سالار

# هەڵسەنگاندنێك بۆ دوا كابینەی حكومەتی هەرێم

كابینەی نۆیەمی حكومەتی هەرێمی كوردستان كە لە ٢٠١٩/٧/١٠ متمانەی لە پەڕلەمان پێدراوە، ئێستا تەمەنی نزیكەی سێ ساڵی تەواوە، لەم كورتە نووسینەدا هەڵسەنگاندنێكی خێرا بۆ ئەو تەمەنە و ٢٩ ساڵ باڵای دەكەین:

**خەسڵەتی کابینەکە:**

١. کابینەکە پێکهاتەکەی حکومەتێکی ئیئتیلافییە و بنکە و سەرۆکایەتییەکەی تەنها بریتییە لە ٣ لایەنی سیاسی و سێ قۆڵییە و لە هەموو گەورە و بچووکێک هەرسێکیان بەرپرسن، کابینەکە لە ٢١ وەزیر پێکهاتووە، بەڵام بە دەرەجە، پارتی خاوەن و یەکێتی شەریک و گۆڕانیش فەرمانبەرە.

٢. کابینەکە فۆرمێکی ئەمنی توندی هەیە و بە تەشکیلەکەیی و گۆڕینی پۆستە ئیدارییەکانیدا دیارە.

٣. کابینەکە دروشمی (کوردستانێکی بەهێز)ی هەیە، بەڵام لە ئێستادا نەک هەر کوردستان بەهێز نییە، چارەنووسی قەوارەکەشی لە نێوان مان و نەماندایە!

٤. لەمێژە دەسەڵاتی جێبەجێکردن هەژموون( هیمنە)ی بەسەر دوو دەسەڵاتەکەی تردا کردووە، بەڵام لەم کابینەیەدا هەژموونەکە بەتەواوی لەسەر دەسەڵاتی دادوەری دیارە، سەبارەت بە دەسەڵاتی یاسادانانیش بەشێوەیەکە لە ئاستی چاوەڕوانییەکان نییە و ئیرادەی لاوازکردنیشی هەمووان دەیزانن.



**پەیوەندییەکانی هەرێم و ناوەند زۆر ئاڵۆز و پڕ کێشەن، بەشێوەیەك ئاسۆی ڕێکەوتنیان زۆر دوورە، ئێستاش کە نرخی نەوت بەرز بووەتەوە ڕێکەوتن نزیکە لە مەحاڵ.**

٥. کابینەکە کارنامەیەکی ٢ لاپەڕەیی A4 ی هەیە، کە نە پۆلێنی زانستی کراوە و نە بە سەقفی زەمەنی بەسترابووەوە، کەس نازانێت ئایا ئەوە وتاری دەستبەکاربوونە یان بەرنامەی حکومی، لەکاتێکدا بەرنامەی حکومەتەکەی عادل عبدالمهدی ١٠٥ لاپەڕە بوو!

٦. کابینەکە میراتێکی لە باش و خراپی کابینەکانی پێشوو بۆ بەجێماوە، کە تیایدا تازەکان بەشدارن لە خراپکردنی ئەوەی ڕابردوو و ئەزمونکراو بوون.

٧. تووشی قەیرانی دارایی و تەندروستی و سیاسی بووە، بەڵام چونکە بۆ قەیران ئامادە نەبووە، وەک ئەو پەندەی بەسەرهات کە دەڵێت: ماڵ لەخۆیا نەبوو میوانیش ڕووی تێکرد.

٨. شەففافیەت لە هەموو سێکتەرەکان زۆر سنوردارە و بەردەست نییە، بەشێک لە پۆستەکانی جێگری وەزیر و سەرۆکی ژمارەیەک دەستە هەروەها یاریدەدەری سەرۆکی حکومەت بۆ چاکسازی کە بۆ گۆڕان دانراوە تا ئێستا دانەنراون!

**سیما ناتەندروستەکانی حکومەتەکە:**

١. هەژموونی دوو حزبەکە بەسەر کۆی دام و دەزگاکانەوە.

٢. هێزی بەرگری هەرێم نیشتیمانی نییە و سەر بە دوو حزبەکەن.

٣. تا ئێستا داواکاری گشتی سەر بە دەسەڵاتی جێبەجێکردنە و ئەدای ئەم دەزگایەش زۆر لاوازە.

٤. بەردەوامی ناشەفافیەتی سەرجەم داهاتەکان.

٥. قۆرخکردنی کەرتی وەبەرهێنان، و دروستبونی سەرمایەداری هەڵتۆقیوو و نەناسراو.

٦. سیاسەتی ئابووری سەربەخۆ تۆمارێک لە شکست و قەیرانی بۆ هەرێم هێنا.

٧. گەندەڵی بەشێوەیەکی ڕێکخراو بەردەوامە.

٨. لاوازی ڕۆڵی چاودێریکردن و هەژموونی حکومەت بەسەر سەرجەم دامەزراوە و دەزگاکانی چاودێریدا.

٩. سەروەری یاسا تەنها دروشمە و دەسەڵاتدار بە ئاسانی یاسا پێشێل دەکات.

١٠. ئۆپۆزیسیۆنی پەرلەمانی لە پرۆژەوە تووشی حاڵەتی پەرتبوون و لاوازبوون بووە.

١١. واتا شەش خەسڵەتەکەی فەرمانڕەوایی چاک (الحكم الرشيد) لە کابینەکەدا ونە، کە ئەوانیش: سەروەربوونی یاسا، جودایی دەسەڵاتەکان، بەرجەستەکردنی دادگەریی و یەکسانی لەهەمبەر هاوڵاتیان، بوونی شەفافیەتی کارگێڕیی و دارایی و سیاسی، دەستاودەستکردنی دەسەڵات، پاراستنی ئارامی و ئاسایش کۆمەڵایەتی هاوڵاتیان.

**ناتەواوییەکانی کابینەکە و جێبەجێ نەکردنی بەرنامەی حکومی کابینەکە:**

١. لە بواری چاکسازیدا ئەوەی کراوە لە دەرچوواندنی یاسایەک بۆ ڕێکخستنەوەی خەرجییەکان لەگەڵ ژمارەیەک بڕیاری سەرۆکی حکومەت و وەزارەتەکان بۆ چاکسازی لە دەروازە سنوورییەکان و باج و بەخشینی گومرگی کە تا ئێستاش جێبەجێ نەکراوە، لەوە زیاتر هیچی تر نەکراوە!!

٣. کە قەیرانی تەندروستی دروستبوو و دواتر قەیرانی ئابووریشی بەدوادا هات، حکومەت کەمترین ئامادەسازی بۆ لێکەوتەکانی کرد.

٤. هیچ هەوڵێکی حکومەت لەئارادا نییە بۆ گێڕانەوەی ناوچە کوردستانیەکانی دەرەوەی هەرێم.

٥. چارەنووسی بەرهەمی ناوخۆیی و پاراستنی نزیکە لە سفرەوە.

٦. یاسایەک هەیە لە هەرێم کە حکومەت پابەند دەکات شوێنی نیشتەجێبوون بە یەکەی خانوو و شوقە دروستبکات و کێشەی کرێنشینی کۆتایی پێ بێنێت، بەڵام هیچ نەکراوە.

٧. کابینەکە ژمارەیەک مووچەی فەرمانبەران قەرزارە لە ماوەی یەک ساڵی تەمەنی.

٨. کەمترین پرۆژەی ستراتیژی ئەنجامدراوە، ئەوەشی هەیە بریتییە لە کۆنەکان و ئێستا تەواو دەبن.

٩. کوا ئەمانە:
- یەکێک لە بڕیارەکانی حکومەت شەفافیەت بوو، کوا؟
- کوا یاسای بودجە؟
- حکومەت لە ماوەی ساڵێکدا چەند پرۆژە یاسای گرنگی بۆ ڕێکخستنی بوارێکی ژیانی هاوڵاتیان بۆ پەرلەمان ناردووە؟
- داهاتەکان چەندن؟ ئەوەندە شاراوەن پەرلەمانتارانیش زانیاری لەبارەیانەوە نییە؟

١٠. سەرۆکی حکومەت لە وتارێکی میدیایی نەک لە بەردەم پەرلەماندا وتی کە :حکومەت ٢٧ ملیار قەرزارە، لە جاری دووەمدا بووە بە ٣١ ملیار، بەشێوەیەک کەس نازانێت ئەم قەرزانە بۆ کێ و لە کێ و بە پشتیوانی چ یاسایەک کراون!!

١١. شەریکەکانی حکومەت زۆر هەست بە (غبن) دەکەن و یەکێتی هەرەشەی هەڵپەساردنی بەشداری لە حکومەت دەکات.

١٢.بەڵێنی حکومەت بوو کە پێشمەرگە ڕێک و یەک بخات، بەڵام ئەگەر ئەم خەونە وەدی هات ئەوا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت!

١٣. پەیکەری سیستم (هیکلە النظام ) لە هەرێم زۆر کۆن و کلاسیکە و حکومەت لە بەرژەوەندی نییە بیگۆڕێت.

١٤. پەیوەندییەکانی هەرێم و ناوەند زۆر ئاڵۆز و پڕ کێشەن، بەشێوەیەک ئاسۆی ڕێکەوتنیان زۆر دورە، ئێستاش کە نرخی نەوت بەرز بووەتەوە ڕێکەوتن نزیکە لە مەحاڵ.

**هەرێم نغرۆ لە قەیراندا:**

زۆرن ئەو قەیرانانەی کە هەرێمی کوردستانیان گرفتارکردووە، تەندرووستی و کۆمەڵایەتییەکان گرنگن، بەڵام ئەو جۆرە قەیرانانەش لە هەناوی قەیرانە سیاسییەکەوە لەدایکبوون و درێژە بە تەمەنی خۆیان دەدەن.

- لە ئێستادا دیارترین قەیرانەکان بریتین لە :

١. قەیرانی حوکمڕانی خراپ و نا ڕەشید.

٢. بڵاوی گەندەڵی سیاسی و ئیداری و دارایی.

٣. قەیرانی ئابووریی و نەمان یان زۆر کەمبوونەوەی مووچەی موچەخۆران، هەروەها لاواز بوونی بازاڕ و بازرگانی.

٤. نەمانی نا هاوسەنگی سیاسی و نەهێشتی ڕۆڵی هێزگەلی ڕاستەقینەی ئۆپۆزسیۆن.

٥. ناشەفافیەت لە هەموو بوارەکان بەتایبەت نەوت و داهاتەکان و سەرچاوەکانی ئابووری هەرێم.

٦. خاکی هەرێم لەلایەن نەیار و دوژمنانەوە بەئاسانی تەجاوز دەکرێت.

٧. بێمتمانەیی لە نێوان هێزە سیاسییەکان و شۆڕبوونەوەی ئەم حاڵەتە بۆ نێو تاکی کوردی.

٨. پەیوەندییەکانی هەرێم و ناوەند لە ئەوپەڕی خراپیدان.
٩. گوزەرانی خەڵک نزیکە لە خنکانەوە.
١٠. دابڕانی خەڵک و دەسەڵات و چاوەڕوانییەکانی تاکی کورد وەدی نایەت.
١١. کاروباری چالاکی حیزبی لە ئێستادا نیمچە وەستاوە.

**جوڵەیەکی پێویست و هەنگاوێك بۆ چارەسەر:**

١. گەڕانەوەی متمانە لە کاری پێکەوەیی و هێنانەوەی شکۆ بۆ مرۆڤی کورد پاشان بۆ دامەزراوەکانی.
٢. پرەنسیپێکی سەرکەوتوو لە کۆمەڵگا فرەییەکاندا، پەیڕەوکردنی (تەوافوق)ە، کە باشترین و گونجاوترینە، ئەگەر داهاتوویەکی باش و کاری پێکەوەییمان دەوێت ئەم پرەنسیپە پەیڕەو بکەن نەک زۆرینە و کەمینە.
٣. ئۆپۆزسیۆنی پەرلەمانی لە ماددە ١١١ی پەیڕەوی ناوخۆی پەرلەماندا دانی پیادانراوە و پارێزراوە، کە پێویست کراوە لەسەر سەرۆکایەتی و کۆی دامەزراوەکە ئازادی کارکردنیان بۆ فەراهەم بکات و ژینگەیەکی گونجاو بۆ کاریان دابین بکات.
٤. کابینەی نۆیەمی حکومەت بەرنامەیەکی حکومی هەبوو، ئەگەرچی بە خشتەیەکی زەمەنی ڕێک نەخرابوو، تا ئێستا بۆ شەقامی کوردی دەسکەوت و وەدیهێنراوەکانی ڕوون نین.
٥. دۆسییەکانی گەندەڵی لە کوردستان، چەند کەس دراوە بە دادگا و چەندیان دادگایی و هەروەها سزا دراون؟
٦. هەنگاوەکانی حکومەت تایبەت بە ڕێکەوتن لەگەڵ بەغداد بەئاقاری پیادەکردنی سیاسەتی (تصفیر)، واتا سفرکردنەوەی ناکۆکییەکانە، بەڵام دەتوانیین ئەنجامەکەی بژمێرین؟
٧. پێویستە حکومەت وەڵامی ئەم پرسیارە جددیان بداتەوە:
- چاکسازی هەمەلایەن لە هەرێم بەکوێ گەیشت؟
- چارەنووسی مووچە پاشەکەوتکراوەکان مووچەی مانگانەی موچەخۆران بەچی گەیشت؟
- تارمایی و ئاسەواری دوو ئیدارەیی چارەسەر بووە؟
٨. قەیرانی دارایی هەرێم ڕیشەدار و لەمێژینەیە، بەڵام بەهۆی پەتای کۆرۆناوە زیاتر دەرکەوت و پێی وتین کە ئێمە تا چ ڕادەییەک نەخۆشین.

کەواتە ئەگەر ئیرادە هەیە بۆ چارەسەر ئەوا پەیڕەوی پرەنسیپی(انقاذ مایمکن انقاذه) بکەن و ئەم هەنگاوانە بهاون:

- فرەیی بکەن لە داهاتی هەرێم، نموونەی وەک کشتوکاڵ بەشێوەیەک کە یاسایەکی نوێ و تۆکمەی هەبێت، و زەویی و بەرهەم و بازاڕ وەک یەک بکەونە چوارچێوەی بایەخ

پێدانەوە و وەبەرهێنان لە کەرتی کشتوکاڵدا بکرێت نەک تەنها بووەستین بەدیار باجی ساڵانەی کیلۆیەک تەماتە و شووتی لەسەر جوتیاری داماو.

- سیستەمی باج لە عێراق وهەرێمی کوردستان یەکە، یەک یاسای هەیە لەگەڵ بوونی ڕێنمایی جودا، بەڵام ئەم سێکتەرە ئەگەر ڕێک نەخرێتەوە وەک ئەوە وایە لە سەدەی (٢١)دا جەنگ بە تاپڕ بکەین!

- کرێنشینی و کرێ لە هەردوو بواری نیشتەجێبوون و بازرگانیدا تووشی گرفتی قوڵ بووە، پێویستە پەرلەمان و حکومەت بە بڕیارێکی تەشریعی لە (٢٥٪) ی کرێی سەرجەم شوێنی نیشتەجێبوون و بازرگانی و پڕۆژەکان(حکومی و تاکەکەسی) کەم بکاتەوە.

- زۆربەی وڵاتان کە تووشی گەندەڵی کارگێڕی و دارایی دەبن دوو هەنگاوی گەورە دەهاون، کە ئەوانیش: یاسایەکی توند بۆ قەڵاچۆکردنی دیاردەکە بەمەرجی جێبەجێکردن دادەنێن، هەروەها سەرکردەیەک یان چەند سەرکردەیەک ئەم خەمە دەگەیەننە پایان.

- هەردوو ڕەوتەکەی ئابووری تاقیکرانەوە، کە ئەوانیش ئابووری گرێدراو بە ناوەند و ئابوری سەربەخۆ بوون، بەڵام خێرمان لە هەردووکیان نەدی، تکایە چارەسەری سێیەم پەیڕەو بکەن، چونکە تاکی کورد شایستەی ژیانێکی شکۆمەندانەیە نەک سوکایەتی وماندووکردن تا دواهەناسە.

- به ئامانجی چەسپاندنی فیدراڵییەتی تەواو لە سیستەمی حکومڕانی لە عێراقدا، پێشنیاز دەکەم کە تەواوی فراکسیۆنە کوردستانییەکان پڕۆژە پێشنیازی (ئەنجومەنی فیدراڵی) پێشکەش بکەن، هەروەک لە دەستوری کۆماری عێراقدا ساڵی ٢٠٠٥ هاتووە و تیایدا پێویستە یاسای بۆ دەربچێت، لەم ڕێیەوە ژمارەیەک پرسی هەڵواسراو چارەسەر دەبێت.



د. عەبدولڕەحمان ئەحمەد وەهاب

# گیرۆدەبوونی پەروەردە بە ڕوانگەی دەوڵەتسازییەوە لە کوردستاندا

سەرەتا:
لەم نووسینەدا تێزێک پێشکەش دەکەم بۆ تێگەیشتن لەچوارچێوە سیاسیی و فەرهەنگی و سیستەماتیکییە گشتییەکەی پرۆسەی پەروەردەی ڕەسمی لە کوردستاندا. سەرەتا گفتوگۆی ئەوە دەکەم کە بوونی میتۆدێکی ڕەخنەیی بۆ باسوخواسە پەروەردەییەکان گرنگە تا ئەوە ڕوون بێت لەسەر چ بنەمایێک باسەکە دامەزراوە و چ ئاڕاستەیەکی هەیە. چوارچێوەی تێزەکە و گفتوگۆی سیاسەتی پەروەردەیی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەم ڕانگەیەوە پرۆسە سیاسیی و فەرهەنگییەکانی مۆدێرنێتی و سیستەمی دەستگا مۆدێرنەکانە، ئەوانیش لە فەزای فیکر و مێژووی خۆنواندنی ناسیۆنالیزمدا مانا دەدەن و نەخش دەگرن. هەر لەم چوارچێوەشدایە باسی سیستەمی پەروەردەی ڕەسمی لە بازنەی دەوڵەتی نەتەوەییدا دەکەم و مامەڵە و فەرهەنگە پەروەردەییەکان پێکەوە گرێ دەدەم. لەکۆتاییدا باسی ئەوەش دەکەم کە بەرەنجامی تێزی ئەم نووسینە دیارکردنی ئاڕاستەی دروستە لە داڕشتنی سیاسەتی پەروەردەییدا و هەنگاونانە بەرەو پێشەوە.

### گرنگیی بوونی میتۆدێکی ڕەخنەیی

زۆرن ئەوانەی بەشێوە و لە ئاستی جۆراوجۆردا ڕەخنە لە پەروەردەی ڕەسمی لە کوردستاندا دەگرن و گازندەیان لێی هەیە، بەڵام ئەم ڕەخنەگرتن و گازندانە پێویستە بە میتۆدێکی ورد و ڕوون بکرێن تا لەلایەک بتوانین ڕەخنەی جیددیی و گلەیی سەرپێیی لێک جودا بکەینەوە، لەلایەکی دیکەوە دڵنیاببینەوە کە ڕەخنەکان لە جێی خۆیاندان. لەڕاستیدا بەشێکی بەرچاوی ڕەخنە و گازندەکان نەیانتوانیوە ئەو هێڵە گشتییانە بدۆزنەوە کە کێشە پەروەردەییەکان پێکەوە گرێ دەدەن. بوونی میتۆد و ڕوانگەیەکی گشتگیر بۆ توێژینەوە و دیتنی مەسەلە پەروەردەییەکان وادەکات لە باسی کێشەکاندا سەرپێیی و توندڕۆ و، لەکاتی پێشنیازکردنی چارەسەریشدا خۆشباوەڕ و پشووکورت نەبین.

ئەو ڕەخنانەی لە ئاستی فیکر و فەلسەفە و سیاسەتی پەروەردەیی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەگیرێن بەشێوەییەکی دیاریکراو زۆرجار بە زەقی بە هەڵەدا چوون و، بەگشتی نەیانتوانیوە بەوردیی و بەفراوانی لە کێشە تێکهەڵکێشراوەکانی پەروەردەی ڕەسمی بڕوانن. ئەمەش بە دیاریکراوی لە بەکارنەبردنی میتۆدێکی ڕەخنەیی لە ناسینی مەسەلە پەروەردەییەکان و فراواننەبوونی مەودای بینینی کێشەکانەوەیە. ئەم ڕایەش شکاندن و ناچیزکردنی ڕەخنەکان نییە، بەڵکە ئاماژەکردنە بە کەمیی توێژینەوەی ڕەخنەیی و گشتگر لە بواری پەروەردەدا لای ڕەخنەگران و نەبوونی بەرچاوڕوونی و بەرفراوانیی ڕوانگەی چاکسازی لای سیاسەتوان و بڕیاربەدەستانی پەروەردەیی. ڕوانگەی گشتگر و ڕەخنەیی لە ناسین و مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکانی پەروەردەدا سەری لە چارەسەری ڕەخنەیی و جیددی و گشتگرەوە دەردەچێت. دەبێت چارەسەری کێشەکانی پەروەردە جۆراوجۆر و فرەلایەن بن، لەهەمانکاتیشدا دەبێت هاوئاهەنگ بن تا سەرلێشێوان و بێئومێدیی و کەسبەکەسی نەیێنە گۆڕێ.

### سیاسەتی پەروەردەیی حکومەتی هەرێمی کوردستان کامەیە؟

لە ئاستی فیکر و فەلسەفە و سیاسەتی پەروەردەیی لە هەرێمی کوردستاندا ڕەخنەی هەرەباو ئەوەیە کە حکومەتی هەرێم فەلسەفەیەکی پەروەردەیی ڕوونی نییە، پلان و ستراتیجیی بۆ پێشخستنی کەرتی پەروەردە نییە، تەواوی پرۆسەی پەروەردەی ڕەسمی لەسەر سیاسەتێکی پەروەردەیی تۆکمە ناڕوات و، چەندین ڕەخنە و گازندەی لەم جۆرە. ئاسانترین هەڵوێست لەم ڕووەوە ئەوەیە کە بڵێین ڕاستە، حکومەتی هەرێمی کوردستان سیاسەتی پەروەردەیی نییە و بەرچاوی ڕوون نییە.

بەڵام، هەر بە ڕاست، ئایا حکومەتی هەرێمی کوردستان فەلسەفە و سیاسەتی پەروەردەیی هەیە؟

میتۆد و ڕوانگەی ڕەخنەیی و گشتگر لە بواری پەروەردەدا بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، جارێ لە سەرەتادا دەپرسێت: ئایا دەکرێت سیستەمێکی پەروەردەیی هیچ فەلسەفە و سیاسەتێکی ڕوونی نەبێت؟ بۆئەوەی بتوانین گفتوگۆی جیددی لەبارەی پرۆسەی پەروەردە و خوێندنی ڕەسمییەوە بکەین، دەبێت بڕیار بدەین کە نەخێر، هیچ پرۆسە و سیستەمێکی پەروەردەیی نییە فەلسەفە و سیاسەتی دیاریکراوی خۆی نەبێت. هەر پرۆسەیەکی پەروەردەیی لەسەر بنەمایەکی فەلسەفی و ڕێڕەوێکی سیاسی کار دەکات. بیهێنە بەرچاوی خۆت: بۆچی لە گشت کونج و سووچێکی ئەم کوردستانەدا خوێندنگەکان لەسەر هەمان بنەما دامەزراون، چاوەڕێ دەکرێت مامۆستایان هەمان ڕێنمایی پەیڕەو بکەن، خوێندکاران هەمان بەرنامەی خوێندنیان هەبێت و بۆ هەمان ئامانج تێبکۆشن؟ بوونی هەمان یاسا و سیستەم و هەمان ئامانج و چاوەڕوانی مانای بوونی هەمان فەلسەفە و سیاسەتی پەروەردەییە.

لێرەوە، دەبێت بپرسین: کامەیە ئەو ڕێڕەوە فیکریی و سیاسییەی کە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە هێشتنەوە و بەڕێوەبردنی پرۆسەی خوێندنی ڕەسمیدا گرتوویەتییە بەر؟ بە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی وردی بەڵگەنامە پەروەردەییە ڕەسمییەکانی حکومەتی هەرێم کە لەماوەی ٣٠ ساڵی ڕابردوودا دەریکردوون، سەرەکیترینی هەوڵەکانی حکومەتی هەرێم دامەزراندن و پتەوکردنی سیستەمێکی مۆدێرنە بۆ پەروەردە تا خزمەتی دامەزراندن و هێشتنەوەی دەوڵەتی مۆدێرن بکات.[1]

## سیستەمی پەروەردەیی مۆدێرن چییە؟

سیستەمی پەروەردەیی مۆدێرن پێکهاتەیەکی سیاسیی بیرۆکراسییە کە لەنێو سیستەمێکی فراوانتری حوکمڕانیی مۆدێرندا مانا دەدات و، پەیوەندیی بە مێژووی سەرهەڵدان و پێشکەوتنە جۆراوجۆرەکانی پرۆسەی مۆدێرنێتییەوە هەیە. بەشێوەیەکی دیکە بڵێم، کارکردن لەپێناوی دامەزراندن و هێشتنەوە و پەرەپێدانی ئەو سیستەمە پەروەردەییەی ئێمە پێی ئاشنایین دەکەوێتە نێو بازنەی دامەزراندن و هێشتنەوە و پەرەپێدانی پێکهاتە بیرۆکراسییەکانی دەوڵەتی مۆدێرنەوە. بنەمای فیکریی دەوڵەتی مۆدێرنیش ناسیۆنالیزمە، بەمانای یەکبوونی زمان و فەرهەنگ و مێژوو و خاک و تەنانەت ڕەگەزیش. پەیوەندیەکی دووجەمسەریش لە نێوان ناسیۆنالیزم و شکڵ و شێوەی دەوڵەت و دەستگاکانیدا هەیە. ئەمە مانای وایە بوونی یان هێنانەئارای یەکبوونی زمان و فەرهەنگ و مێژوو کار دەکاتە سەر شێوازی دامەزراندن و بەڕێوەچوونی دەوڵەت. لەهەمانکاتدا

1. Wahab, A. A. (2017). Education in Kurdistan Region at the Intersection of Nationalism and Democracy (Doctoral dissertation, University of Toronto (Canada)).

میکانیزمەکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەتیش دەبنە هۆی یەکخستنی زمان و فەرهەنگ و مێژوو. مۆدێرنێتی لە ڕێی تۆڕێکی ئاڵۆزی ڕوانگەی فیکریی و ئەخلاقی و هەڵوێست و دەستگا و کار و مامەڵەی دیارکراوەوە خۆی دەنوێنێت. دەوڵەتی مۆدێرن و دەستگاکانی، بەنموونە پەروەردە و خوێندنی ڕەسمی، بەرهەم و بەرهەمهێنەری مۆدێرنێتین. سیستەمی پەروەردەی ڕەسمی پێویستی بەوەیە یەکبوونی زمان و فەرهەنگ و مێژوو هەبێت و، بەشێوەیەکی سەرەکیش هەوڵ دەدات ئەم پێویستییەی خۆی دەستەبەر بکات. یانی، سیستەمی مۆدێرن خۆی خۆی دروست دەکات و پتەو دەکات و مانەوەی خۆی دڵنیا دەکاتەوە. مەبەستیشم لە سیستەمی پەروەردەیی مۆدێرن هەر ئەمەیە کە لەنێو بازنەی فیکریی و سیاسیی دەوڵەتی مۆدێرندا، کە ناسیۆنالیزمە، مانا دەدات و خۆی دەنوێنێ.

پوختەی ئەم باسە تا ئێستە ئەمەیە: سیاسەتی پەروەردەیی حکومەتی هەرێم هەر لە سەرەتاوە بە ئاڕاستەی دامەزراندن و پتەوکردنی دەستگاکانی پەروەردەدا ڕۆیشتووە و دەڕوات. کەوایە، سیاسەتی پەروەردەیی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەگشتی سیاسەتی دامەزراندنی دەستگای پەروەردەیی دەوڵەتی مۆدێرنە. ئەم بنەما سیاسییە کۆمەڵایەتییە مێژووییە دەتوانین بکەینە سەرەتایەک تا باشتر لە وردەکاریی کێشەکانی پرۆسەی پەروەردەی ڕەسمی لە هەرێمی کوردستاندا بگەین، تا بتوانین قووڵتر ڕۆبچینە نێو ئاڵۆزییەکانی سیستەمی پەروەردەی کوردستان و فراوانیی مەوداکانی چارەسەر درک پێ بکەین.

نموونەیەکی سەرەکیی ڕەخنەی ڕەخنەگران لە ئاستی فیکر و سیاسەتی پەروەردەیی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەوەیە کە حکومەت سیاسەتێکی پەروەردەیی بەعسیانەی هەیە، یان لەسەر هەمان سیاسەتی پەروەردەیی حکومەتی دیکتاتۆریی پێشووی عێراقی دەڕوات. ئەوەی ئەم جۆرە گازندەیە ڕوونی ناکاتەوە یان نایناسێتەوە ئەوەیە کە سیاسەتی حکومەتی بەعسی عێراقیش سیاسەتی دەوڵەتی مۆدێرن بووە و هەوڵی پێکهێنانی نەتەوەی داوە لە ڕێی دامەزراندن و تۆکمەکردنی دەستگای گشتگر و مەرکەزییەوە بۆ بەدەستهێنانی یەکبوونی زمان و فەرهەنگ و مێژوو لە چوارچێوەی سنووری سیاسییەکەی دەوڵەتی مۆدێرنی عێراقدا. حکومەتی بەعسی عێراقی حکومەتێکی ناسیۆنالیستی بووە و هیی هەرێمی کوردستانیش بە هەمان شێوەیە، بەمانای ئەوەی بنەما فیکریی و سیاسییەکەی حکومەتی هەرێم و دەستگاکانی لەسەر بنەمای چەمکی نەتەوە دامەزراون. بۆیە مامەڵە یاسایی و ئیدارییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە کەرتی پەروەردەدا لە هیی حکومەتی بەعسی عێراقی دەچن. جیاوازییەکانیش بەهۆی جیاوازیی مێژووی سەرهەڵدان و گەشەسەندن و ئاستەنگ و دەرفەتەکانی بەردەم ناسیۆنالیزمی

کوردی و عەرەبی/بەعسییەوەیە لە عێراقدا. بەڵام هەنگاوە ئیداریی و بیرۆکراسییەکانی سیستەمی پەروەردەیی لە عێراقدا بە هەرێمی کوردستانیشەوە هەنگاو و پرۆسەی تەواو مۆدێرنن. بۆیە ئاساییە لێکچوون لەنێوانیاندا هەبێت.

گرێدانی کێشەکانی پەروەردە لە هەرێمی کوردستاندا بە نەبوونی فەلسەفە و سیاسەتی پەروەردەیییەوە یان بە چواندنێکی سادەی سیستەمەکە بە هیی حکومەتی بەعسی عێراقی دەبنە گازندە و هوتافی حەماسی، بەڵام داننان بەوەی کە بەڵێ، فەلسەفەی پەروەردەکە ڕوونە و سیاسەتەکەشی داهێنراوێکی نوێ نییە و لەمێژینە و تۆکمە و دووبارەیە، دەبێتە سەرەتای ڕەخنە و توێژینەوەی جیددی. ئەم میتۆدەی توێژینەوە لە پرۆسەی پەروەردەدا یارمەتیی ئەوەشمان دەدات باشتر لە کێشەکانی سیستەم و مامەڵە و کارەکانی هەر ئاستێکی پرۆسەی پەروەردە و خوێندن بگەین و ڕێمان لە چارەسەری پەیوەندیدار و جۆراوجۆر بکەوێت.

ناسیۆنالیزم و دەوڵەت: چوارچێوەی سیاسەتی پەروەردەیی هەرێمی کوردستان

بۆ ناسینەوەی چوارچێوەی سیاسەتی پەروەردەیی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ناسینی ناسیۆنالیزم و ئەو دەوڵەتەی ناسیۆنالیزم دەیهێنێتە گۆڕێ گرنگن. با بەڕوونی ئەوەش بڵێم کە دەوڵەتداری ئاڕاستەی سەرەکیی سیاسەتی پەروەردە و خوێندنی ڕەسمییە لە هەرێمی کوردستاندا. مەبەستم لە دەوڵەتداریش فەلسەفە و ماهییەت و پێکهاتە و شێواز و مامەڵەکانی دەوڵەتی مۆدێرنە. بەشێوەیەکی گشتی، دەوڵەتی مۆدێرن لە هەندێک بنەمای سەرەکیدا لە دەوڵەتی پێش مۆدێرن جودایە. دیارترینی ئەم بنەمایانە ئەو پەیوەندییە خۆبەخۆیەی نێوان سنووری سیاسیی و سنووری نەتەوە و فەرهەنگەکەیەتی لە دەوڵەتی مۆدێرندا. ناسیۆنالیزمیش بریتییە لەو گفتوگۆ فەلسەفی و تیۆریی و سیاسییانەی باس لە پەیوەندیی نەتەوە و سنوورە سیاسییەکەی دەکەن و دەبنە کۆمەڵێک ئاکار و هەڵوێست و کرداری سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ هێنانەدیی هاوئاهەنگیی نێوان سنوورە سیاسییەکە لەگەڵ سنوورە فەرهەنگییەکەی نەتەوەدا. بۆیە وا بڕیارە سنووری سیاسیی هەر دەوڵەتێکی مۆدێرن چوارچێوەی سنوورە نەتەوەیی و فەرهەنگییەکە بێت.[1]

ئەوەی لەم پێناسە سنووردارەی ناسیۆنالیزم و دەوڵەتداریی مۆدێرندا گرنگن ئەمانەن:

- جودا لەو بنەما کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسییانەی پێشتر دەوڵەتیان لەسەر بنیات دەنرا، دەوڵەتی مۆدێرن لەسەر بنەمای یەکبوون و لێکچوونی کۆمەڵانی خەڵک لە ناوچەیەکی جوگرافیی دیاریکراودا دادەمەزرێت.

---

1. Gellner, E. (2008). Nations and Nationalism. Cornell University Press.

– گەر دەوڵەتی پێش مۆدێرن لەسەر بنەمای هێزی گرۆیێک بەسەر کۆی خەڵکی نێو سنووری دەوڵەتەکەدا دامەزرابێت و بەهانەی ئەم هێزە ماددی یان مەعنەوی بووبێت، وەک بانگەشەی خوێنپاکیی کەس و نوخبەی دەسەڵاتدار و پەیوەندییان لەگەڵ خوداوەند و بوونێکی باڵادا، یان دەستەڵاتی هێزی بازوو و خۆسەپاندنی سەربازی، ئەوا دەوڵەتی مۆدێرن لەسەر بنەمای مافی دیارکردنی چارەی هەموو خەڵکی نێو سنوورەکە وەک یەکەیەکی لێکچوو و یەکگرتوو و دانەبڕاو لە هاوفەرهەنگی و هاوزمانی و هاومێژوویی دادەمەزرێت.

– ئەو بنەما فەلسەفی و تیۆریی و سیاسییەی دەوڵەتی مۆدێرنی لەسەر دادەمەزرێت ناسیۆنالیزمە، یانی کۆی باسوخواس و کردار و هەڵوێستەکانی پەیوەست بە نەتەوەوە، لە ناویاندا خۆبەنەتەوەزانین.١

–ناسیۆنالیزمیش لە ئەنجامی گۆڕانە مێژوویی و زانستی و فیکرییەکانی سەردەمی ڕێنیسانس و دواتری ئەورووپاییدا هاتە گۆڕێ، بەو مانایەی ئەو گۆڕانکارییانە ڕێیان بۆ بەدەستهاتنی هاوئاهەنگییە فەرهەنگی و زمانی و مێژووییەکان خۆش کرد. بە نموونە، ئاسانبوونی بەریەککەوتنی جڤاک و فەرهەنگە جیاوازەکانی ناوچەیەکی جوگرافی، هەڵبەت زۆرجار بە زۆرەملێ و لە ڕێی داگیرکارییەوە، بەهۆی بەردەستبوونی ئامرازەکانی گواستنەوە یان بەربڵاویی چاپەمەنییەکان وای کرد کە ئەو جڤاک و فەرهەنگانە بەرەو هاوئاهەنگی بچن.

لە ئاشنابوون بە دەرهاوێشتە سیاسییەکانی ناسیۆنالیزمدا ئەوەی گرنگە هێڵیان بەژێردا بهێنین چەمکەکانی (هاوفەرهەنگی، هاوزمانی، هاومێژوویی)ن. بۆئەوەی هێز و گرۆ سیاسییەکانی نەتەوەخواز بتوانن سنوورە سیاسییەکەی دەوڵەت بە دەوری نەتەوەدا بکێشن و ناوی دەوڵەتی لێ بنێن، دەبێت بیسەلمێنن کە هاوئاهەنگی لە فەرهەنگ و زمان و مێژووی ئەو گرۆیەدا هەیە. بەڵام لەڕاستیدا فەرهەنگ و زمان و مێژوو هەروا بە سادەیی خۆیان بە دەستەوە نادەن و لەوە بزێوترن کە بیری ناسیۆنالیستی دەیخوازێت. بۆیە پرۆسەی بنیاتنانی نەتەوە پرۆسەیەکی ئاڵۆزە و سەختە. وەک چۆن لەنێو پرۆسەکەدا چیرۆک و ئەفسانە و مێژووی هاوبەش بۆ خڕکردنەوەی پێکهاتەکانی نەتەوە لەدەوری یەکدی گرنگن، ئاوەهاش پرۆسەی سیاسی و بیرۆکراسی بۆ هێنانەئارا و لەهەمانکاتدا دەربڕینی هاوئاهەنگیی نەتەوەیی گرنگن. دەستگاکانی دەوڵەتی مۆدێرن وا دامەزراون کە لەلایەکەوە گوزارشتی یەکبوونی نەتەوە بکەن و لەلایەکی دیکەوە گەرەنتیی ئەم یەکبوونەش بکەن، زۆرجار بە پەڕوباڵکردنی فەرهەنگ و زمان و مێژوو تا بە چوارچێوە سیاسییەکانی دەوڵەت-نەتەوە بخۆن.

1. Anderson, B. (2006). Imagined Communities: Reflections on the Origin and Spread of Nationalism. Verso Books.

لێرەوە پەیوەندیی خولاو و نەپچڕاوی نێوان نەتەوە و دەستگاکانی دەوڵەت دەبێتە بابەتێکی گرنگی توێژینەوەی پەروەردەیی. هەر ئەم پەیوەندییەیە بۆ ڕوونکردنەوەی ئاڕاستەی سیاسەتی پەروەردەیی لە هەرێمی کوردستاندا دەمەوێت جەختی لێ بکەمەوە.

ئامانجی پەروەردەیی ناسیۆنالیزم دەستلەملانی ئامانجە سیاسییەکەیە

کە جەخت لەوە دەکەمەوە ئامانجی خوێندنی ڕەسمی لە هەرێمی کوردستاندا دامەزراندنی دەوڵەتی مۆدێرنە، مەبەستمە بڵێم کە پرۆسەکە بۆ هێنانەگۆڕێی بنەما فیکریی و سیاسی و فەرهەنگییەکانی ناسیۆنالیزمن بەوشێوەیەی لە دنیای ئێستەماندا بۆ دامەزراندنی دەوڵەت گرنگن. بۆیە ناتوانین ئامانجە پەروەردەییەکانی ناسیۆنالیزم (یەکبوون یان هاوئاهەنگیی نەتەوەیی) لە ئامانجە سیاسییەکە داببڕین کە دامەزراندنی دەوڵەتە. هەروەها ناشتوانین وردەکاریی پرۆسە و دەستگاکانی پەروەردەی مۆدێرن لە پرۆسە بیرۆکراسییەکان و پرس و گۆڕان و ئەولەوییەتە سیاسییەکان دوور بخەینەوە. پەیوەندیی نێوان ناسیۆنالیزم وەک فەلسەفەی دەوڵەتی مۆدێرن لەگەڵ دەستگا و پرۆسە سیاسیی و ئیدارییەکانی دەوڵەتدا پەیوەندیەکی دانەبڕاو و تەواوکارە.

هەڵبەت بەدەستهێنانی هاوئاهەنگیی فەرهەنگی خۆی بەشێوەی جودا دەنوێنێت. لە دامەزراندنی دەستگاکانی پەروەردەدا جەخت لە ناوەندیبوون دەکرێتەوە، جەخت لە تۆکمەیی و توندکردنی یاسا و ڕێساکان دەکرێتەوە، کارێکی بێوێنە دەکرێت بۆ جیاکردنەوەی ئاستەکانی بیرۆکراسی و بەشکردنی ئەرکەکان و چوارچێوەدارکردنی پسپۆڕیی ئیداری و، هتد. سیستەمی پەروەردەی مۆدێرن، کە بەشێکی گرنگی سیستەمی دەوڵەتداریی مۆدێرنە، لەنێو خۆیدا وەک دەستگایەکی میکانیکیی ئاڵۆز کار دەکات بە شێوەیەک هەر پارچەیەکی درشت یان ورد لەگەڵ کۆی پارچە و بەشەکانی دیکەدا هاوئاهەنگ دەبێت. لە دەستگایەکی وادا هەموو پارچەکان پێکەوە مانا بە دەستگاکە دەدەن و بەرەو ئامانجە گشتییەکەی دەبەن. هەربەشێکی نێو ئەم دەستگایە تەنها لەنێو کۆی دەستگاکەدا نرخی هەیە و تەنها لەوەدا کەڵکی هەیە کە هاوئاهەنگیی پرۆسەی دەستگاکە بپارێزێت و جگە لەو ئامانجە هیچی دیکە نەکات، یان دژی ئەو ئامانجە کار نەکات. وەک چۆن لە نێوخۆی دەستگای پەروەردەیی مۆدێرندا گشت پارچەکان دەبێت هاوئاهەنگ بن، بە هەمان شێوەش کۆی دەستگای پەروەردەی ڕەسمی وەک یەکەیەک دەبێت لەگەڵ کۆی پێکهاتەکانی دیکەی دەوڵەتدا هاوئاهەنگ بێت و ڕووگەی دەستگاکە بەدەستهێنان و بەردەوامیدان بە ئامانجەکانی دەوڵەتی مۆدێرن بێت.

دەوڵەتی مۆدێرن پێویستی بە سیستەم و دەستگای بیرۆکراسی و ناوەندییە وەک ئەوەی لە سەرەوە باس کراوە. سیستەم و دەستگای بیرۆکراسیش هاوئاهەنگیی فەرهەنگی

دێننە گۆڕێ بەوشێوەیەی کە سیستەم و دەستگاکە دەیخوازن. بۆیە، بە نموونە، دژیەکییە لەڕووی فیکرییەوە دژی ناسیۆنالیزم بێت، بەڵام لەگەڵ سیستەمی مۆدێرنی بەڕێوەبردنی پەروەردە یان هەر بەشێکی دیکەی کۆمەڵگەدا بێت، بەتایبەتی ئەو جۆرە سیستەمەی کە جەخت لە بەدەستهێنانی هاوئاهەنگی تا ئەندازەی لێکچوون و یەکبوون دەکاتەوە، چونکە ئەم دووانە (سیستەمی دەوڵەتداریی مۆدێرن و ناسیۆنالیزم) یەکدی تەواو دەکەن و بێ یەکدی نایانکرێت. لەوانەیە لەو وڵاتانەی کە مێژووی هاتنەگۆڕێ و پێشڤەچوونی نەتەوەخوازی تێیاندا لەوەی هەرێمی کوردستان جودایە هەندێ جیاوازیی بنەڕەتی یان لاوەکی هەبن، بەتایبەتی کاتێک دەوڵەت چەمکی ناسیۆنالیزمی تەقلیدیی و پێداویستییە ستراتیجییەکانی تێپەڕاندبێت، بەنموونە ئیدی ترسی لە سنوورە نەتەوەییەکەی نەمابێت یان هاوئاهەنگیی سنووری سیاسی و نەتەوەییەکەی تۆکمە و بێکێشە بێت. ئەم بارە زیاتر لەو نەتەوانەدا ڕوونە کە لە پلەی پاشناسیۆنالیزمن یان نەتەوەخوازییەکەیان لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی سیاسییە نەک یەکبوونی فەرهەنگی و ڕەگەزی و ئیتنی. لەم نەتەوانەشدا سیستەمی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و دەستگا بیرۆکراسییەکان هێشتا هەر بنەمایەکی سەرەکیی هاوئاهەنگیی نەتەوەیین، بەڵام دەکرێ جەختی زیاتر لە هاوئاهەنگیی سیاسی و یاسایی بکەن لەسەر بنەمای بەها کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەکان نەک یەکبوونە ڕەگەزی و ئیتنییەکان.

## ڕۆڵی پەروەردە لە دەوڵەتی مۆدێرندا

پرۆسە و دەستگاکانی پەروەردەی ڕەسمی لە دەوڵەتی مۆدێرندا تەواو لە پرۆسەی پەروەردە و دەستگاکانی سەردەمی پێش مۆدێرن جودان. پرۆسەی پەروەردە لە دامەزراندن و بەردەوامیدان بە دەوڵەتی مۆدێرندا پشکی شێری هەیە بەهۆی ئەو ڕۆڵەی پەروەردە لە هێنانەدیی بنەما و ئامانجەکانی دەوڵەی مۆدێرندا هەیەتی، بە تایبەتی بنەما و ئامانجی هاوئاهەنگیی نەتەوەیی. بۆیە سەرەکیترین ئامانجی سیستەمی پەروەردەی مۆدێرن دڵنیاکردنەوە و بەردەوامیدانە بە هاوئاهەنگیی فەرهەنگی و سیاسی و کۆمەڵایەتی. ئەو سیستەمەشی کە بۆ پرۆسەی پەروەردە دادەنرێت دەبێت گوزارشت لەم ئامانجە بکات، ئەگینا لای دەوڵەتی نەتەوەیی ئەرزشی نابێت. دەکرێت لە پەنای ئەم ئامانجەدا ئامانجی دیکەی تەواوکەر یان جوانکەر یان نەخواستراو هەبن، بەڵام لای دەوڵەتی نەتەوەیی و سیاسەتوانانی، هیچ ئامانجێک لە ئامانجی هاوئاهەنگیی نەتەوەیی لەپێشتر نییە. بۆیە بۆ ناسینی فەلسەفە و سیاسەتی پەروەردە و خوێندنی ڕەسمی لە هەرێمی کوردستاندا دەبێت چاومان لەسەر فەلسەفە و سیاسەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان و گوتاری نوخبە سیاسییەکەی بێت. دەبێت باش لە هەنگاو و مامەڵە و

هەڵوێستە سیاسییە کۆمەڵایەتییە ئابوورییەکانی حکومەت بگەین و بزانین چۆن شییان دەکەینەوە تا بتوانین گفتوگۆی ڕاستەقینە لەبارەی ئاڕاستەکانی پەروەردەی ڕەسمییەوە بکەین. هەروەها دەبێت وردودرشتی کاری دەوڵەتی مۆدێرن و بیری نەتەوەخوازی باش بناسین و، بەهۆشیارییەوە هێڵ بەژێر کارکردە بیرۆکراسییەکانی ناسیۆنالیزم لە پەروەردەدا بهێنین.

**بەڵگەنامەکانی سیاسەتی پەروەردەیی حکومەتی هەرێم ئەم تێزە دەسەلمێنن**

لە ماوەی نزیکەی سێ دەیەی تەمەنی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا گۆڕانکاری لە گوتار و دەربڕینی فەلسەفە و سیاسەتی پەروەردەی ڕەسمیدا ڕووی داوە. گۆڕانەکانیش کەمتازۆر ڕەنگدانەوەی گۆڕانە سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکانن. سەرنجڕاکێش ئەوەیە کەمترین گۆڕین لە وردەکاریی و پڕۆسەکانی دەرکردنی یاسا و سیاسەتەکاندا کراون.[1] لە کۆی پێکهاتە و ڕێکارەکانی بەڕێوەبردن و پڕۆسەکانی پەروەردە و خوێندندا زۆرترین جەخت لە توندوتۆڵکردنی هەنگاوە بیرۆکراسییەکان کراوە. یاسا لە دوای یاسا و کۆنفرانس لە دوای کۆنفرانس بڕیاردان لای توێژی سەرەوەی هەرەمی کارگێڕیی پەروەردەییەوە خەستتر بووەتەوە و هەرەمەکە تۆکمەتر بووە. لە بەرانبەر گۆڕانکاری لە زمانی دەربڕین و چەمک و دەستەواژە نووسراوەکانی سەر کاغەزی بەڵگەنامەکانی سیاسەتی پەروەردەییدا، مامەڵە ئیداریی و پەروەردەییەکان وەک تۆکمەترین بەشی سیستەمی پەروەردەیی ماونەتەوە و، بگرە ڕۆژ دوای ڕۆژ توندتر دەکرێنەوە و توێژاڵە بیرۆکراسییەکان ئەستوورتر دەبن. تەنانەت لە هەوڵە زۆر جیدیی و کاریگەرەکانی گۆڕینی ئەم سیستەمە هەرەمییەدا پڕۆسەی ڕیفۆرم وا لێکدەدرێتەوە کە زۆرترین کار بۆ توندوتۆڵکردنی خودی هەرەمەکە بکات و ڕێ لە بێسەروبەری و پەرشبوونی بازنەکانی بڕیاردان و جۆراوجۆری لە بڕیارەکاندا بگرێت. لە بانگەشەکانی چاکسازیدا ئاڕاستەی خواستراو ئەوەیە هەوڵەکانی گۆڕانکاری لە سەرەوە بۆ خوارەوە بن و زۆرترین هێزی سیاسیی و ئیدارییان لە پشتەوە بێت. بەهۆی چوارچێوەداربوونی ڕوانگەی هەڵوێست و کارەکان، ئەو ئاڵۆزییە ئیدارییەی پەروەردەی کوردستان گەیشتووەتە ئاستێک کە ئەو دەرمانەی سیاسەتووان و سەرکردەکانی پەروەردە پێشکەشی دەکەن هەر هەمان دەردەکەیە، بەڵام لە ڕەنگ و سیمایکی دیکەدا. داخۆ ئەمە چیمان پێ دەڵێت؟

لە باسی ئەوەی کە حکومەتی هەرێمی کوردستان سیاسەتی پەروەردەیی هەیە و، لە پەروەردەی ڕەسمیدا فەلسەفەیەکی دیاریکراو پەیڕەو دەکات، وردبوونەوە لە بەڵگەنامەکان

1. Wahab, A. A. (2017). Education in Kurdistan Region at the Intersection of Nationalism and Democracy (Doctoral dissertation, University of Toronto (Canada)).

و شیكردنەوەكان ئەوە ڕوون دەكەنەوە كە سیاسەتەكە تۆكمەكردنی ڕێكارەكانی بەڕێوەبردنە لەسەر بنەما بیرۆكراسییە مۆدێرنەكان، دیارترینیان بەڕێوەبردنی مەركەزی و پلەبەندیی هەرەمی و گشتاندنن. ئەمانەش لە كرۆكدا تەفسیری فەلسەفەی هاوئاهەنگی و لێكچوونی نەتەوەیی و كۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دەكەن كە بنەمای ناسیۆنالیزمن.

ڕاستییەكەی، لە بەڵگەنامەكاندا گۆڕانكاری بەسەر گوتاری ناسیۆنالیستیدا هاتووە، بەڵام ئەو مامەڵە كارگێڕیی و سیاسیی و كۆمەڵایەتییانەی تەفسیری ناسیۆنالیزم لە پەروەردەی ڕەسمیدا دەكەن هیچ گۆڕانكارییەكیان بەسەردا نەهاتووە. هەروەها ئامانجی جوان و پرشنگداری وەك دیمۆكراسی و مافی مرۆڤ و بیركردنەوەی ڕەخنەیی و پێشڤەچوونی كۆمەڵایەتی و زانستی و ئەمانەش لە بەڵگەنامەكاندا هەن. بەڵام هەڵوێستی ڕەسمی و مامەڵەی ئیداریی بەڕێوەبەرانی پەروەردەی ڕەسمی لە كوردستاندا ئەوە دەردەخەن كە بەڕێوەبردن و نیشاندانی تۆكمەیی ڕێكارە كارگێڕییەكان لەپێش هەر ئامانجێكی دیكەوەن. سیاسەتوان و كارگێڕ و كارمەندانی پەروەردە لە هەرێمی كوردستاندا زۆر بە پەرۆشەوە باوەشیان بە سیستەمی بیرۆكراسیی كوردستاندا كردووە و لەگەڵیدا گیرۆدەی خۆشەویستییەكی تاكلایەنە بوون. لە پرۆسەی پەروەردەی ڕەسمیدا هەموو شتێك كراوەتە قوربانی بەڕێوەبردن.

**سیستەمی پەروەردەی ڕەسمی هێندە ڕێكارە بیرۆكراسییەكانی پرۆسەی پەروەردەی لا گرنگە، خودی پەروەردەبوون و ئەنجامە سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابوورییەكانی خوێندنی لا گرنگ نییە.**

بە نموونە، لە كۆی دوازدە ساڵی خوێندنی پێش زانكۆدا تاكە ڕووداو كە زۆرترین جەختی لێ دەكرێتەوە و نیشاندەری سەركەوتنی پرۆسەی خوێندنە تاقیكردنەوە گشتییەكانن، بەتایبەتی تاقیكردنەوەی ویزاری لە كۆتایی پۆلی دوازدەدا. هیچ ڕووداوێك، هیچ كارێك، هیچ سەركەوتنێك یان دۆڕانێك، هیچ ئەنجامێكی پەروەردەیی هێندەی بەڕێوەبردنی تاقیكردنەوەكان نابێتە جێی باس و دڵخۆشی یان دڵتەنگیی كۆمەڵگە، نابێتە نیشاندەری سەركەوتن یان كێشەداربوونی پرۆسەی خوێندن و كاری وەزارەتی پەروەردە. لە بەڕێوەچوونی وەرگرتن لە بەرنامەی تواناسازیی وەزارەتی خوێندنی باڵادا، كارگێڕە گەورە و بچووكەكانی حكومەت و وەزارەت هەر لە سەرەتاوە جاڕی سەركەوتنی

بەرنامەکەیان دا، پێش ئەوەی بەری ئەو ڕەنجە بدروون، چونکە خۆ دیار نەبوو تواناکان چەند سازکراون تا بزانین سەرکەوتوو بوون یان نا. لەڕاستیدا مەبەستەکە سەرکەوتنی بەڕێوەچوونی وەرگرتن و ناردنەکە بوو نەک کۆی پرۆسەی تواناسازی. لەم دوایيانەشدا لە جاڕدانی سەرکەوتنی پرۆسەی وەرگرتن بۆ خوێندنی ماستەر و دکتۆراش لە ناوخۆدا هەر وا بوو. مانای وایە، سیستەمی پەروەردەی ڕەسمی هێندە ڕێکارە بیرۆکراسییەکانی پرۆسەی پەروەردەی لا گرنگە، خودی پەروەردەبوون و ئەنجامە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی خوێندنی لا گرنگ نییە. پەروەردە و فێربوون نەبووەتە پێوەر بۆ پرۆسەی پەروەردە، بەڵکە بەڕێوەبردنی پەروەردەیی، بەوجۆرەی پێی ئاشنایین، بووەتە ئەم پێوەرە.

## پوختەی تێز و هەنگاونان بەرەو پێشەوە

زۆر لەوانەی سەروکاریان لەگەڵ پەروەردەدایە، لە سیاسەتوان و کارگێڕ و توێژەر و ڕەخنەگر و مامۆستا و خوێندکار و دایک و باوکی خوێندکار، ئەگەر لەماوەی سێ دەیەی تەمەنی حکومەتی هەرێمدا بە بەردەوامی ئاماژە بۆ هەمان کۆمەڵە کێشە و گرفتی پەروەردەیی بکەن، مانای وایە سەرچاوەی کێشە و گرفتەکان لەوماوەیەدا هەمان شتە و نەگۆڕاوە. ئەوەی نەگۆڕاوە چوارچێوە سیاسییەکەی پرۆسەی پەروەردەی ڕەسمییە کە هەوڵی دامەزراندن و هێشتنەوە و تۆکمەکردنی پێکهاتەکانی دەوڵەت و سیستەمی حوکمڕانیی مۆدێرن دەدات، لەوانەش پرۆسە و سیستەمی مۆدێرنی پەروەردە.

گرنگیی خوێندنەوەی ڕەخنەگرانەی بەڵگەنامەکانی فەلسەفە و سیاسەتی پەروەردەیی حکومەتی هەرێم لەوەدایە کە تیشک دەخاتە سەر خەسڵەتە نەگۆڕاوەکانی پرۆسەی پەروەردەیی. کە وایە، ئێمە دەگەینە چەند خاڵێکی گرنگ:

- گۆڕانکاری لە زمان و چەمک و داڕشتنی سیاسەتی پەروەردەییدا گرنگە، بەڵام لە خۆیاندا نابنە هۆی گۆڕانی هەڵوێست و کردار و ئەنجامە پەروەردەییەکان. گۆڕانکاریی ڕاستەقینە لەوەدایە کە گۆڕینی گوتار و دەربڕین ڕەنگدانەوە و پشتگری گۆڕینی هەڵوێست و ڕوانگە و کار و مامەڵە پەروەردەییەکان بێت.

- پەیوەندییێکی خولاو لە نێوان سیاسەتی پەروەردەیی وەک بەڵگەنامە لەگەڵ پرۆسەی دەرکردنی بەڵگەنامەکەدا هەیە. بەنموونە، ناکرێت یاسایەک یان هەر بەڵگەنامەیەکی ستراتیجی بۆ پتەوکردنی بنەماکانی دیمۆکراسی و ڕێزگرتن لە گفتوگۆ و جیاوازییەکان لە پرۆسەی پەروەردەدا خۆی لە پرۆسەییێکی چەقبەستوو و نادیموکراتی و داخراودا دەربکرێت. بوونی بەڵگەنامەیەکی لەم جۆرە مەرج نییە هیچ کاریگەرییەکی ئەرێنی لە جێبەجێکردنیدا بهێنێتە گۆڕێ.

– ئەگەر بەڵگەنامەی سیاسەتێکی تۆکمە و ڕێکوپێکی سیستەمێکی پەروەردەیی وڵاتێکی دیموکراتی بهێنینە کوردستان، واقیعی توند و چەقبەستووی سیستەمی بەڕێوەبردن و مامەڵە و فەرهەنگی پەروەردەیی لە کوردستاندا دەبێتە لەمپەر لەپێش جێبەجێکردنی سیاسەتە هێنراوەکەدا.

– کە وایە، بازنەی سیاسەتی پەروەردەیی نابێت تەنها بەڵگەنامە و هەڵوێستە ڕەسمییەکانی دەسەڵاتی پەروەردەیی بگرێتەوە. تەفسیری بەڵگەنامەکانی سیاسەتی پەروەردەیی بەشێکی گرنگی سیاسەتەکە خۆیەتی. واقیعی کارگێڕیی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی هەموو ئەوانەی سیاسەتەکە تەفسیر و جێبەجێ دەکەن (دەسەڵاتداری پەروەردەیی، سیاسەتووانی پەروەردەیی، بەڕێوەبەر، مامۆستا، خوێندکار، دایک و باوک، کۆی کۆمەڵگە) دەبێت بەشێکی دانەبڕاو بن لە پرۆسەی سیاسەتی پەروەردەیی.

حکومەتی هەرێمی کوردستان فەلسەفە و سیاسەتی پەروەردەیی هەیە. ئەمانە لە بەڵگەنامە ڕەسمییەکاندا دیار و ئاشکران. بەڵام فەلسەفە و سیاسەتی پەروەردەیی لە مامەڵە و کاری ڕۆژانە و هەڵوێستی نەنووسراویشدا هەن. لە ماوەی سێ دەیەی تەمەنی حکومەتی هەرێمدا دەستگا پەروەردەییەکان هێندە ئەزموونیان هەیە تا لەوە دڵنیا ببینەوە مامەڵە ڕەسمی و ناڕەسمییەکانی نێو سیستەم و دەستگاکان، هەڵوێستە سیاسیی و ئیدارییەکان، ڕوانگە زانستی و کۆمەڵایەتییەکانی نێو وەزارەت، قوتابخانە، زانکۆ و پۆلی خوێندن دەرخەر و ڕەنگدانەوەی فەلسەفە و سیاسەتە نووسراوەکانن. گوتنی ئەمە ئاسانە، ئەوەی سەختە، بەڵام ئەستەم نییە، شکاندنی ئەو ڕێچکە نەگۆڕەی پرۆسەی پەروەردەیە کە بە بەردەوامی کێشەکان بەرهەم دێنێتەوە.

## سەرچاوەکان

- Wahab, A. A. (2017). Education in Kurdistan Region at the Intersection of Nationalism and Democracy (Doctoral dissertation, University of Toronto (Canada)).
- Gellner, E. (2008). Nations and Nationalism. Cornell University Press.
- Anderson, B. (2006). Imagined Communities: Reflections on the Origin and Spread of Nationalism. Verso Books.



### دکتۆر یوسف محەمەد سادق سەرۆکی پێشووی پەرلەمانی کوردستان:

# ئەم دەسەڵاتدارانەی کوردستان کیانی هەرێمەکەش بە خۆیانەوە دەڕووخێنن

**گفتوگۆ: سەڵاح سالار . ڕەوشت محەمەد**

**هەرێمی کوردستان سێ دەیەی حوکمڕانیی خۆی تێپەڕاند و زۆر قۆناغ و ئاڕاستەی سیاسیی جۆراوجۆری تاقیکردەوە، ئەم کیانەی هەرێمی کوردستان ئەگەرچی لە دەستووری عێراقدا چەسپیوە و شەرعیەتێکی یاسایی و دەستووریی هەیە، سەردەمێک شێوازیی حوکمڕانیی نیمچەسەربەخۆی بەڕێوە دەبرد، بەڵام ماوەیەکە ڕۆژ بە ڕۆژ پێگەی لاواز دەبێت و لەناوخۆش بەهۆی گەندەڵیی و پێشێلکاریی ماف و ئازادییەکانەوە فشەڵ دەبێت. بۆ ئەم مەبەستە ئەم گفتوگۆیەمان لەگەڵ بەڕێز، دکتۆر یوسف محەمەد سادق، سەرۆکی پێشووی پەرلەمانی کوردستان و سەرکردەی پێشووی بزووتنەوەی گۆڕان و پسپۆڕی یاسایی و دەستووری ئەنجام دا.**

**+ له دەستپێکەوە بەرەی کوردستانی حوکمی کوردستانی گرتەدەست و پاشان پەرلەمان و حکومەتی دامەزراند، بەمپێیە سێ ئەزموونی جیاواز کەوتە بەردەستی حزبەکانی کوردستان، بەتایبەت دوو حیزبی حوکمڕان، (ئەزموونی شاخ، ئەزموونی شاری بەرەی کوردستانی، ئەزموونی حوکمڕانی دامەزراوەیی کوردستان) ئەمانە لە کوێدا تەجاوزی ئەزموونی پێشتریان کرد و ئەزموونی نوێیان پەیڕەو کرد و لە کوێشدا هەر ئەزموونی پێشوویان جێبەجێکردەوە؟**

- ڕاستییەکەی ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان لە پاش ساڵی ١٩٩١، دەتوانین بڵێین: ئەزموونێکە کە پاشخانی حوکمڕانیی زۆر نییە، بەدرێژایی سەدەی پێشوو، جگە لە ئەزموونەکەی کۆماری مەهاباد، کە ساڵێک کەمتربوو، پێش ئەویش حکومڕانیی شێخ مەحموود بە پچڕ پچڕیی، کە چەند ناوچەیەکی ئێستای هەرێمی کوردستانی دەگرتەوە. ئەزموونێکی وا دەوڵەمەندمان نییە لەڕووی حوکمڕانییەوە، ڕاستە پێشتر ئەمارەتەکان هەبوون لەچوارچێوەی ولایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا، بەڵام ئەوەی لەچوارچێوەی فۆرمێکی دامەزراوەیی و حکومڕانییدا کاروبار بەڕێوەبەرێت ئەو ئەزموونە نەبووە.

لە شاخ ئەوکاتەی خەباتی شاخ هەبووە لە سەردەمی شەستەکاندا و شۆڕشی ئەیلوول، چی پاش ئەویش لە دوای شکستی شۆڕشی ئەیلوول و سەرهەڵدانەوەی شۆڕش هەندێ جار بەشێک لە ناوچەکانی کوردستان بەدەست هێزی پێشمەرگە و حیزبەکانەوە بوو، کە ئەوەش دیسانەوە ئەزموونێکی ئەوتۆ نییە پشتی پێ ببەستیت بۆ حوکمڕانی.

بۆیە حیزبە حوکمڕانەکان پاش ڕاپەڕینی ١٩٩١ لە شاخەوە دێنە خوارەوە بۆ ناو شارەکان، دەبوو بەشێوەیەکی تر و ڕوانگەیەکی دیکەوە سەیری پرۆسەکە بکەن و هەوڵی ئەوە بدەن ئەو کەسانەی کە شارەزاییان لە حوکمڕانییدا هەیە بیانهێننە ناو کایەی حوکمڕانییەوە و کاروبارەکان ڕادەستی ئەوان بکەن، هاتن وەک بابەتی دابەشکردنی کێکەکە پرۆسەی حوکمڕانیی لە نێوان خۆیان دابەش بکەن و خۆیان بەخاوەنی شەرعیی حوکمڕانیی دەزانی.

لەئەنجامی ئەوە ئەم ئەزموونە هاتە کایەوە کە درێژکراوەی ئەزموونی شاخە، لێرەدا تەنها شتێک زۆر جێگەی سەرنجە کە من نەمدیبوو تا دوای کۆچی دوایی کاک نەوشیروان مستەفا، ئەو دیمەنە ڤیدیۆییەبوو کە بڵاوبووەوە کە کاک نەوشیروان سەردانی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز دەکات، بەڕاستی دیمەنی موفارەقەی نێوان بیری کاک نەوشیروان و هەموو سەرکردەکانی تری کوردستانە، لەو سەردانەدا دەڵێت: ئێمە ناتوانین حوکمڕانیی شار بکەین و پێویستە ڕادەستی کەسانێکی بکەین کە لە حوکمڕانیی شار بزانن، ئەوەبوو لەو ڕوانگەیەوە مامۆستا (جەمال عەبدول)یان هێنا و کردیان بە پارێزگاری سلێمانی، بەڵام مامۆستا جەمال عەبدوول نەیتوانی بەردەوامبێت و ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە و وازیهێنا.

ڕەنگە ئەمە یەکەمجارە من ئەمە باس بکەم، کاک نەوشیروان عەتەبێکی هەبوو لەسەر هەندێ لە خوێندەوارەکانی کورد کە لە بەغدا بوون، وتی: پاش ساڵی ١٩٩١ جوابم بۆ ناردن بەناو ناوی هێنان، وتی: داوام لێکردن بێنەوە و ئەوان حوکمڕانیی کوردستان بگرنە دەست، یەکێ سەرۆکی پەرلەمان بێت و یەکێ سەرۆکی حکومەت بێت، بەڵام نەهاتن.

بەڕاستیی من پێموت: کاک نەوشیروان ئەوە بیرکردنەوەی تۆ بووە تا حوکمڕانیی ڕادەستی ئەوان بکەیت، بیرکردنەوەی دوو حیزبەکە، بە حیزبەکەی خۆشتەوە وا نەبووە و لە هەوڵی ئەوەبوون خۆیان کۆنترۆڵی حوکمڕانیی بکەن، ڕەنگە ئەوانیش بهاتبانەوە وەکو مامۆستا جەمال عەبدوولیان بەسەر دەهات.

جا ئەم حوکمڕانییەی ئێستا هەیە هەر درێژکراوەی ئەو قۆناغەیە، بەڵام لە خوارەوە دەنگی جیاواز هەیە، هێزی تر هەیە دەیانەوێت ئەم حکومڕانییە بەجۆرێکی تر بێت و حوکمی دامەزراوەیی جێگیر ببێت، هێزی تر دێتە کایەوە، هێزەکانی تر نایانەوێ ئەم حکومڕانییە بەمشێوەیە بەردەوام بێت، لەئەنجامدا فشار هەیە بۆئەوەی ئەم حوکمڕانییە گۆڕانکاریی بەسەردا بێت، کە درێژکراوەی سەردەمی شاخ نەبێت و درێژکراوەی سەردەمی شەڕی ناوخۆ نەبێت، هەروەها درێژکراوەی هودنەی دوای شەڕی ناوخۆ نەبێت. حوکمڕانییەکی دامەزراوەیی بێتە کایەوە. ئێستا ئێمە لەم ململانێیەداین دەتوانم بڵێم سەرەتای ئەم ململانێیە بۆ ساڵی ٢٠٠٥ دەگەڕێتەوە، کە ئەوکاتە خۆپیشاندانەکان لە هەرێمی کوردستان دەستیانپێکرد، نارەزایی و خۆپیشاندن لە شار و شارۆچەکەکان دەستیپێکرد، بۆ نموونە لە هەڵەبجە، لە کەلار و سلێمانی، دوایی بزووتنەوە مەدەنییەکان هاتنە کایەوە، پاشان بزووتنەوەی گۆڕان هاتەکایەوە، دوایی ئۆپۆزسیۆن لە پەرلەمانی کوردستان دروستبوو، پاشان پاکێجەکانی چاکسازیی لە هەرێمی کوردستان هاتەکایەوە، دواتر لە یاسای سەرۆکایەتی هەرێم و داخستنی پەرلەمانی کوردستان ئەمە چووە کۆی جومگەکانی حوکمڕانیی لە هەرێمی کوردستان، ئەم دەسەڵاتە ناچاربوو یەکێ لەو دامەزراوانەی کە خۆی دروستیکردووە کە پەرلەمانی کوردستانە دابخات، چونکە دەیزانی ئەم دامەزراوەیە بووە بە فشار لەسەر ئەو شێوازەی حوکمڕانیی لە هەرێمی کوردستان.

کەواتە ئێستا ئێمە لە قۆناغی ململانێین لە نێوان دوو بەرەدا، بەرەیەک کە دەیەوێت ئەو شێوازە لە حوکمڕانیی بەردەوام بێت، بەرەیەکی تر کە دەیەوێت گۆڕانکاریی بەسەردا بێت و دەیەوێت حوکمی دامەزراوەیی لە هەرێمی کوردستاندا جێگیر ببێت. ئەوەی کە ئێستا لە کوردستان هەیە دەرەنجامی ئەو ململانێیە کە باسمکرد، ئەڵبەت فاکتەرێکی تریش ئێستە وردە وردە دێتە ناوەوە کە تا ئێستا ڕۆڵی نەبووە و لە ١٩٩١ بەدواوە زۆرکەم دەستی هەبووە لە هەرێمی کوردستاندا، کە ئەویش حکومەتی عێراقە.

تەبعەن فاکتەری ئیقلیمیی هەمیشە ڕۆڵی هەبووە لەناو هەرێمی کوردستادا بەتایبەت سەردەمی شەڕی ناوخۆ، بەڵام فاکتەری عێراقی ڕۆڵی زۆر کەمبووە، جگە لە ٣١ی ئاب، ڕژێمی پێشووی عێراق بەشداریی کرد لە ململانێ ناوخۆییەکانی هەرێمی کوردستان و هەولێری بۆ پارتی گرتەوە و ئەو ململانێیەی بەسوودی پارتی یەکلاکردەوە.

بەڵام ئەو ئەمری واقیعەی لە دوای ١٩٩١ بەهۆی بڕیاری ٦٨٨ بە حوکمی دیاریکردنی ناوچەی دژەفڕین دروستبوو وردە وردە لاواز دەبێت و وردە وردە دەستوور بەهێز دەبێت و کەم کەم عێراق بەهێز دەبێت و بڕیارەکەی دادگای فیدراڵیی دەربارەی نەوت و غاز زۆر ڕوونبوو، کە ئیتر ئەوان ڕازیی نین بەمجۆرە لە کوردستان حوکمڕانیی بکرێت.

**+ ئەگەر قسە لەسەر خاڵی سەرەتا بکەین، یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان تا چەند دیموکراسیی بوو، یاخود ویستیان کوردستان دابەش بکەن بەسەر خۆیاندا و کاڵای دیموکراسیی بکەن بە باڵای پڕۆژە و پڕۆسەکەدا؟**

- ڕەنگە ئەمە بە لاتانەوە سەیر بێت، بەڵام هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان بۆ یەکەمجار لە ئایاری ١٩٩٢ زۆر بەشێوەیەکی عەرزی هاتە کایەوە، بەهار و هاوینی ١٩٩١ گفتوگۆ هەبوو لەگەڵ ڕژێمی پێشووی عێراق، ڕاجیایی هەبوو لەسەر دەرەنجامی گفتوگۆکە، قسەیەک هاتەکایەوە کە ئەنجامی گفتوگۆکە بخرێتە ڕاپرسییەوە و بخرێتە بەردەم خەڵکی هەرێمی کوردستان، کاک مەسعوود داوای ئەمەی کرد تا بزانن ئایا خەڵک بە دەرەنجامی گفتوگۆکان ڕازیین، یان نا؟

دواتر بۆچوونێکی دیکە هاتە ئاراوە، کە لە جیاتی ئەوەی ڕاپرسی بۆ دەرەنجامی گفتوگۆکان بکرێت، هەڵبژاردن بۆ پەرلەمانی کوردستان بکرێت و لەوێوە بڕیار لەسەر بابەتی گفتوگۆکە بدرێت، یانی ئاوا هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان هاتە ئاراوە، نەک ئەوەی ئەم حزبە سیاسییانەی کوردستان بڕوایان بە هەڵبژاردن و دەستاودەستکردنی دەسەڵات هەبووبێت.

هەڵبژاردنەکەی کوردستان لە ئایاری ١٩٩٢ شتێکی نوعی بوو لەم ناوچەیەدا، کە ئەوکاتە لە تورکیا شێوەیەکی دیموکراسیی هەبوو یان لە ئیسرائیل، دەنا لە وڵاتەکانی تر لەو شێوەیەی هەڵبژاردنی تێدا نەبوو، بەڵام هەڵبژاردنی ١٩٩٢ پڕ لە کێشە و کەموکورتیش بوو، بەتایبەت بابەتی تەزویر، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ بەڵگەنامەکانی ئەوکات، لە هەندێ شار بەتایبەت لە دهۆک نزیکەی لە سەدا سەدوبیستی ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەبوو دەنگیان دابوو، دواتریش ڕێککەوتن پەنجا بە پەنجا ئیدارەی هەرێمی کوردستان بدەن، لەوێوە ئیتر ئەزموونی هەرێمی کوردستان بە چەوتی بە هات. ڕاستە وەکو ئەزموونێک لە ناوچەکە و عێراق بەو هەموو بارودۆخەی هەیبوو شتێکی باشبوو. بەڵام لەوکاتەوە تا ئێستا هەرچی هەڵبژاردنە بەوشێوەیە بەڕێوە چووە و هیچ هەڵبژاردنێکیش لەکاتی

خۆیدا ئەنجام نەدراوە، هیچ هەڵبژاردنێکی هەرێمی کوردستان بە پاکیی نەکراوە، ئەو کەموکوورییانەی لەو هەڵبژاردنەوە دەستیپێکرد تا ئێستا بەردەوامە.

**+ مەبەستم ئەوەیە هەر لە سەرەتاوە بڕیاریاندا هەڵبژاردن بەڕێژەیی بێت و هەر حیزبێک ڕێژەی ٧٠٪ نەهێنێت ناچێتە پەرلەمانەوە، کە پارتی تەنانەت ڤیتۆی بۆ ئەو مەبەستەش بەکارهێنا؟**

ـ لەو بابەتەدا من چوومەتە بنجوبناوانی بابەتەکە، لە سەرەتاوە حیزبەکانی تر پێشنیازیان کرد، ئەوە پێشنیازی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان و ئەوانی دیکە بوو، دواتر پارتی پێداگریی لەسەر کرد و بەوشێوەیە هەڵبژاردنەکە کرایە ڕێژەیی، کە هەر حیزبێک ٧٪ نەهێنێت ناچێتە پەرلەمانی کوردستانەوە و هەرواش کرا.

**+ ئەو یاسایانەی لە کوردستان دەرکراون، تا چەند ڕۆڵی باشیان هەبووە لە پێشکەوتن و تا چەندیش پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتییان ترازاند؟**

ـ دەتوانم بڵێم کۆی پرۆسەی یاسادانان لە هەرێمی کوردستان کاڵوکرچە، ئەوەش دەرەنجامی لاوازیی ئەزموونی تەشریعی ئەندامانی پەرلەمانی کوردستانە بە حوکمی نەبوونی ئەو دامەزراوەیە لە پێشتردا، تۆ سەیری عێراق بکەیت پەرلەمانی هەبووە هەر لە سەردەمی پاشاییەوە و لەوکاتەوە یاسای دەرکردووە، کەواتە ئەزموونێکی دووردرێژیان لە مەسەلەی پەرلەماندا هەیە، بەڵام لە هەرێمی کوردستان زۆر تازەیە.

من بە دەقیقی نازانم مەبەستی تۆ یاساگەلێکن کە تۆ پێتوایە لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتیی ئێمە ناگونجێن، من ناتوانم بەشێوەیکی ڕەها بڕیار بدەم لەسەر کۆی پرۆسەی یاسادانان و بڵێم لەگەڵ باری کۆمەڵایەتیی ئێمەدا ناگونجێن، بەڵام دەتوانم بڵێم ڕاستە کۆی پرۆسەکە کاڵوکرچیی پێوە دیارە، کەمئەزموونیی پێوە دیارە، بەڵام هەندێ یاسا ڕەنگە وەڵامدەرەوەبن بۆ دۆخی کۆمەڵایەتیی هەرێم و ئەو کێشانەی لە کوردستاندا ڕوو دەدەن، هەندێکیشی وەڵامدەرەوەن بۆ بەرژەوەندیی حیزبەکان، ئەو حیزبانە باڵادەستن بەسەر پەرلەماندا و هەمیشە باڵادەستبوون بەسەر پەرلەماندا، ماوەیەکی کەم نەبێت کە هەستیانکرد خەریکە لەدەستیان دەردەچێت ناچاربوون بەرخورد بکەن، دەنا بەدڵنیاییەوە زۆرێک لە یاساکان لە بەرژەوەندیی ئەو حیزبانەیە.

**+ کوردستان تا ئێستاش دەستووری تایبەت بەخۆی نییە، ڕەشنووسێک هەیە ناوبەناو گەرمی دەکەنەوە و دواتر باسوخواسی نامێنێت، ئایا دەکرێت سێ دەیە حوکمڕانیی بەبێ دەستوور؟ پاشان ئەو ڕەشنووسە چەند دیموکراسییە و ڕەچاوی پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردستان دەکات و بۆچی ناوبەناویش باس دەکەن و دواتر ناوی نامێنێت؟**

ـ دەستوور زۆر گرنگە بۆ هێنانەکایەی گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی لە نێوانی خەڵک، دەستوور گرێبەستێکی کۆمەڵایەتییە هەموو خەڵک ناتوانن لە دەسەڵاتدابن، دێن

گرێبەستێک دەنووسنەوە و سوڵتەکان دروست دەکەن و پەیوەندیی ئەم دەسەڵاتە بە خەڵکەوە و پەیوەندی نێوان خەڵک بە دەستوور ڕێک دەخەن، فیکری دەستوور و پرسی دەستوور لە هەرێمی کوردستان بۆ ئەمە نەهاتووەتە ئارا، بەڵکو پرسی دەستوور لە کوردستان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی شەخسی کۆمەڵێک خەڵک هاتووەتە کایەوە، ئەمەی تۆ باسی دەکەیت بۆچی ناوبەناو دەهێنرێتە کایە و دوایی ون دەبێت؟ هەمووی پەیوەندی بەوەوە هەیە، کۆی پرسی دەستوور بەستراوەتەوە بە کەسەکانەوە، نەبەستراوەتەوە بە کۆمەڵگە و ڕێکخستنی ژیانی سیاسیی لەناو کۆمەڵگەدا، بۆ نموونە پاش ڕووخانی ڕژێمی بەعس کاک مەسعوود دەیوست ببێت بە سەرۆکی هەرێم، کە دەسەڵاتێکی بەرفراوانی هەبێت بەتایبەتی کە ئەو کات ئەو سەرۆکی هەرێم بوو هاتن پڕۆژەیەکی دەستووریان نووسییەوە بەباڵای ئەودا، پڕۆژەی دەستوورەکە بۆ کاک مەسعوود نووسرابوو، کە تۆ پرسیاری ئەوەم لێدەکەیت ئایا چەند دیموکراسیی و دەستووریی بوو؟ بەڕاستیی کۆمەڵێک خاڵی تێدا نووسرابووە تۆ دەستوورت نەبێت باشترە لەوەی کە دەستوورێکت هەبێت بەناوی ئەو دەستوورە حوکمێکی دیکتاتۆریی دروست بکەیتەوە بۆ جارێکی تر.

بەڵگەت بۆ بهێنمەوە کە خراپییەکەی چییە، بۆ نموونە کە شۆڕشی بەهاری عەرەبیی ڕوویدا یەکێک لە داخوازییەکانیان لابردنی ئەو دەستوورانەی پێشوو و نووسینەوەی دەستوورێکی نوێ بوو، کەواتە دەستوورێکی خراپت نەبێ باشترە لەوەی دەستوورت هەبێت، چونکە دەستوور گۆڕانکاریکردن تێیدا ئاسان نییە، قانوونەکان دەستکاریکردن تێیدا ئاسانترە تا دەستوور.

لەماوەی ڕابردووش جارێکی تر بۆئەوەی نێچیرڤان بارزانی ڕازیی بێت و نەڕوات بۆ بەغدا و لێرە لە هەرێمی کوردستان بمێنێتەوە، دەیوسیت جارێکی دیکە پرسی دەستوور گەرم بکاتەوە و بۆئەوەی سەلاحیەتی تەواوی هەبێت بەپێی دەستوور لە بەرانبەر سەرۆکی حکومەت کە ئامۆزاکەیەتی. ئەم پرسە لە هەرێمی کوردستان نەبەستراوەتەوە بە پێداویستی بەرەوپێشچوونی پرۆسەی سیاسیی لە هەرێمی کوردستان، بەڵکوو هێنانەپێشەوەی هەموو جارێک پەیوەندیی بە ویست و حەز و ئارەزووی شەخسیی و ویستی دەسەڵاتخوازیی کەسەکانەوەیە.

**+ بەحوکمی پسپۆڕیی خۆت و پاشان بەپێی ئەزموونیش کە پێشتر سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان بوویت، پرۆسەی یاسادەرکردن لە کوردستان چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟**

- ئەگەر بەشێوەیەکی گشتیی باسی بکەین کاڵوکرچیی لە یاساکاندا هەیە، بۆ نموونە: یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان دیاریی کردووە کە دەبێت کەی مەرسوومی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان دەربچێت، بەڵام ئەوەی دیاریی نەکردووە کە دەبێت

چەند پێش کۆتاییهاتنی ماوەی پەرلەمان بێت، یان چەندە بێت پاش ماوەی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان، لە هەندێ لە یاساکاندا دەقە عەرەبییەکەی لەگەڵ دەقە کوردییەکەی جیاوازیی هەیە، کاڵوکرچیی لە دەرکردنی یاساکاندا هەیە وەکو باسیشمکرد پەیوەندیی بە نەبوونی ئەزموونی یاسادانانەوە هەیە، بەڵام لەهەمانکاتدا هەوڵ هەیە لە کوردستان بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان بەشێوەیەکی ڕێکوپێک و باشتر، ڕەنگە لە هەندێ شتدا پێش عێراق کەوتبێت، بۆ نموونە لە بابەتی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژیی خێزانی، یاخود لە مەسەلەی کوشتن بەپاساوی شەرەفپارێزیی، کە ئەمە نە دین قبوڵی دەکات، نە قانوون، هیچ یاسایەکی ئاسمانیی و زەمینی قبوڵی ناکات کەسێک تەنیا گومانێکی لە خێزانەکەی هەیە بیکوژێت.

> **هەڵبژاردنی ١٩٩٢ پڕ لە کێشە و کەموکورتی بوو، بەتایبەت بابەتی تەزویر، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ بەڵگەنامەکانی ئەوکات، لە هەندێ شار بەتایبەت لە دهۆک نزیکەی لە سەدا سەدوبیستی ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەبوو دەنگیان دابوو**

واتا ناتوانیت هێڵی ڕاست و چەپ بەسەر یاساکانی هەرێمی کوردستاندا بێنیت، بەڵام وەک باسمکرد دوو خەلەلی بنەڕەتیی هەیە، یەکەم: لە ڕووی یاسادانانەوە کاڵوکرچی هەیە. دووەم: بەرژەوەندیی ئەو حیزبانەی دەسەڵاتیان بەسەر پەرلەماندا هەیە ڕۆڵ دەبینێت لە دەرکردنی یاساکاندا.

**+ دامەزراوەکانی کوردستان تا چەند تێکەڵوپێکەڵن، ئایا هاوسەنگییان چۆنە و ئەمانە بوونەتە ئاراییشتکردن بۆ یەکدانە لەو دامەزراوانە؟**

- کێشەی بنەڕەتی لە کوردستاندا ئەوەیە کە دەسەڵات لای دامەزراوەکان نییە، دەسەڵات لای دوو حیزبی سەرەکییە لە هەرێمی کوردستان، پارتیی و یەکێتیی لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆ دوو ناوچەی نفووزی خۆیان هەیە، پاشتر دەسەڵات لای کەسەکانە، کە ئەنجومەنی وەزیران دەبینیت ڕاستە هەندێ لە وەزیرەکانی لەناو حیزبەکاندا خاوەنی دەسەڵاتن، بەڵام ئەنجومەنی وەزیران بۆخۆی خاوەنی دەسەڵات نییە، ئەم ئەنجومەنی وەزیرانەی لە هەرێمی کوردستان هەیە، کە دەبێت لەناو کەوانەدا بڵێیت (ئەنجومەنی وەزیران)، چونکە من پێموایە ئەوەی لە کوردستاندا هەیە سوڵتەیە، حوکمی دامەزراوەیی نییە، ئەو ئەنجومەنی وەزیرانە کورتکراوەتەوە لە مەسروور بارزانیی و ستافێک کە خۆی کە هێناویەتی بۆ ناو

ئەنجومەن و دیوانی ئەنجومەنی وەزیران، تەنانەت وەزیرەکان بۆیان نییە موخاتەبەی سەرۆکوەزیران بکەن، دەبێت موخاتەبەی سەرۆکی دیوانی ئەنجومەنی وەزیران بکەن، کە سەرۆکی دیوانی ئەنجومەنی وەزیران لەلایەن پەرلەمانەوە متمانەپێدراو نییە، وەزیر متمانەپێدراوە، سەرۆکی دیوان متمانەپێدراو نییە، بەڵکو فەرمانبەرە وەکو وەزیفە لەوێ دانراوە، بەڵام وەزیر دەبێت بڕوات مخاتەبەی ئەو بکات. ئەمە دەلالەت لەوە دەکات لە کوردستان حوکمی دامەزراوەیی نییە. ئێمە هەنگاوێکمان بڕی ویسمان کار بکەین بۆئەوەی هیچ دەسەڵاتێک لەسەرووی پەرلەمانەوە نەبێت، پەرلەمان خاوەنی بڕیارەکانی خۆی بێت، بەڵام ئەمانە ڕازیی نین دەبێت خۆیان بڕیار بدەن و پەرلەمان جێبەجێی بکات، دەبێت بڕیارەکەی ئەوان پەرلەمان بیسەپێنێت بەسەر پەرلەمانتارەکاندا ئێمە دەمانویست ئەمە پێچەوانە بکەینەوە. ئەمەیان قبوڵ نەکرد و پەرلەمانیان داخست. ئەمەی لە کوردستان هەیە دەسەڵاتی دامەزراوەیی نییە، بەڵکو دەسەڵاتی حزبیی و کەسەکانە.

**+ لە سایەی ئەزموونی هەرێمی کوردستاندا، ئەمانە: (یاسا، دیموکراسی، زمانی کوردی، کولتووری کوردی، مافی مرۆڤ و چارەنووسی کورد) چەندە پێشکەوتن و چەندیش دواکەوتن؟ زیاتر لە کوێدا تێکشان؟**

ـ یاسایەک دەرچوو سەبارەت بە زمانی فەرمیی لە هەرێمی کوردستان، بەڵام نەیتوانی زمانێکی یەکگرتوو بۆ هەرێمی کوردستان دروستبکات. ئەو جیاوازییەی لە نێوانی پارتیی و یەکێتیی هەیە بە قووڵیی چووەتە ناو هەموو جومگەکانی ژیانەوە، ژیانی: سیاسی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیریی لە هەرێمی کوردستان. ئێستا ئێمە ناتوانین بڵێین: زمانێکی یەکگرتوومان هەیە، بڕۆ بۆ پارێزگای دهۆک شێوەزاری بادینی زمانی نووسین و خوێندن و فەرمانگەکان و بەڕێوەبردنی حکومەتە، وەرە بۆ هەولێر و سلێمانی شێوەزارێکی ترە، من کاتی خۆیشی باسی ئەوەم کرد وتم: با ئەمە چارەسەر بکەین، بەڵام جیاوازیی پارتیی و یەکێتیی ڕێگربوو لەوەی چارەی بکەین، بۆیە ناچاربووین بێدەنگیی لەم پرسە بکەین، من وەک سەرۆکی پەرلەمان ئیعترازی خۆم لەسەر نووسیی، بەڵام لیژنەکانی پەرلەمان بێدەنگیان لێکرد.

ئەم ڕاجیاییە بۆ هەموو پرسەکانی تریش هەر وایە، سەبارەت بە چارەنووسی هەرێمی کوردستان یەکێک لەو کارە زۆر گرنگانەی پێشتر پەرلەمان لە ساڵی ١٩٩٢ یەکلای کردەوە مەسەلەی فیدراڵیەت بوو بۆ هەرێمی کوردستان، ئەمە کارێکی باشبوو.

سەبارەت بە بڕیارەکانی تری چارەنووسی هەرێمی کوردستان، بڕیارێک دەرچووە کە دەبێت پەرلەمان مەرجەع بێت بۆ دەرکردنی بڕیارە چارەنووسازەکانی هەرێمی کوردستان ئەمە نەکراوە، وەکو باسم کرد ئەو سوڵتەیە لە دەرەوەی پەرلەمان هەیە حیزبە، ئەو بڕیاری لەسەر ئەو پرسە داوە.

ئەوەی کە دامەزراوەکانی هەرێمی کوردستان بەتایبەتی پەرلەمانی کوردستان ناتوانێ لە دەرەوەی هەژموونی ئەم دوو حزبەی هەرێمی کوردستان، بەتایبەتیش هەژموونی پارتیی بەسەر هەولێری پایتەختەوە ئەمە وایکردووە کە پەرلەمان لە بوارەی ئەرکە سەرەکییەکانی خۆی سەبارەت بە چارەنووسی خەڵکی هەرێمی کوردستان، بوارەکانی: کولتوور، زمان، ڕۆشنبیریی و هەموو بوارەکانی تر نەیتوانی ڕۆڵی خۆی هەبێت. ئەنجا ئەوەش بزانە دەقی جوانمان هەیە، بەڵام سوڵتەکەی هەرێمی کوردستان ئەو دەقانە جێبەجێ ناکات.

**+ دەگوترێت بە بەرنامە سەنگ و ئەرزش و متمانەی بەها باڵاکان دەشکێنرێت، وەک، هەڵبژاردن، ڕاگەیاندن، سەنگی حیزبەکان، تێکشانی کەسایەتییەکان و زۆر شتی دیکە، ئەمە تا چەند ڕاستە و چەندیش دەنگۆی نەیارانی ئەوانە؟**

- لەم ململانێیەی باسمکرد هەندێک دەیانەوێت سوڵتە لای خۆیان بمێنێتەوە و هەندێکی تر دەیەوێت حکومەتی دامەزراوەیی لە کوردستان جێگیر بکرێت، ئەو سوڵتەیەی لە کوردستان وەک ئەمری واقیع هەیە سڵی لە هیچ شتێک نەکردووەتەوە تا پایەکانی حوکمی خۆی جێگری بکات، سڵی نەکردەوە لە تەزویر، لە بەکارهێنانی هێزی چەکدار، لە کوشتنی خەڵک، لە زیندانیکردنی خەڵک، لە تێکدانی شیرازەی کۆمەڵایەتی، تۆ سەیر بکە پارە نییە بۆ مووچەی خەڵک، بەڵام لەولاوە میدیایەکی زەبەلاح کراوەتەوە بۆ (ئینتەرتەیت مێنت) کە من ناوم ناوە تلیاکی کۆمەڵایەتی ئەوەی میدیایەکی بەرفراوان دروستکراوە بۆ شتی تەرفیهی و زۆر ئاست نزم بۆ تێکدانی بیرکردنەوەی گەنجانی هەرێمی کوردستان و دوورخستنەوەیان لە سیاسەت و سەرقاڵکردنیان بە کۆمەڵێ شتی لابەلا، ئەمە تلیاکی کۆمەڵایەتییە کە ئەم سوڵتەیەی هەرێمی کوردستان بە بەرنامە ئیشی لەسەر دەکات، تۆ سەیری سۆشیال میدیا بکە چەندین کەس دەبینی لەوێ ئیش دەکات و بەدوایدا بڕۆ لە دەزگا مخابەراتییەکانەوە کار دەکات دەبینیت ئەمانە خەریکی تێکدانی شیرازەی کۆمەڵایەتین، بۆئەوەی گەنج سەرقاڵ بکەن و بەلاڕێیدا بەرن.

بۆیە ئەم سوڵتەیە لە هەرێمی کوردستانی سڵی لە هیچ شتێک نەکردووەتەوە بۆ جێگیرکردنی جێپێی خۆی و دوورخستنەوەی خەڵک لە سیاسەت، ئێستا کار لەسەر ئەوە دەکەن ئەسڵەن سیاسەت لەبەرچاوی خەڵک ناشیرین بکەن و خەڵک لە هەموو شت نائومێد بکەن، چونکە هەڵبژاردن ناشیرین بکەن خەڵک ناچن بۆ دەنگدان کە خەڵکیش دەنگی نەدا ئەو لەسەر دەسەڵات دەمێنێتەوە، بەڵام ئەمانە نازانن کە جاری وا هەیە (ینقلب السحر علی الساحر) ئەو نارەزاییانە لە بری ئەوەی دەستاودەستی ئاشتییانەی دەسەڵاتی لێبکەوێتەوە، بەپێچەوانەوە پەنگ دەخواتەوە تا وەک لە بەهاری عەرەبیی بینیمان ئەو سوڵتە زۆردارانە چۆن ڕووخان ئەمەش دەبینیت لەساتێکدا چۆن دابڕووخێت.

**+ ئۆپۆزیسیۆن تا کوێ ڕۆڵی ئیجابی گێڕا و لەکوێدا ئەویش نەرێنیی شکایەوە؟**

- لەم بابەتەدا دەبێت دوو فاکتەر لەبەرچاو بگرین، هۆکاری بابەتیی و هۆکاری خودی. گۆڕەپانی سیاسیی هەرێمی کوردستان بۆ کاری ئۆپۆزسیۆن یەکجار سەختە، دەسەڵات بەهەموو جۆرێک هەوڵ دەدات ئۆپۆزسیۆن سەرکەوتوو نەبێت، هەر لەوەوە بیگرە کە ئەندام و لایەنگرانی هێزە ئۆپۆزیسیۆنەکان لەکارەکانیان دوور دەخرێنەوە، مەبەستم لە ئەرکی گشتیی و وەزیفەیە نەک ئەرکی حیزبی، هەروەها بەکارهێنانی هێزی چەکدار بەرانبەر بە حیزبەکانی تر، ترساندن و تۆقاندنی ئەندام و لایەنگرانیان، یەکلاکردنەوەی ململانێکانی کوردستان لە ڕێی هێزی چەکدارەوە، کڕینی ئەندامی هەندێ لە حیزبەکان و کەسی سەرکردەی هەندێ لە حیزبەکان. ئەمانە هەموو هۆکارن بۆئەوەی کاری ئۆپۆزسیۆن لە هەرێمی کوردستان لاواز بێت و خەڵک پێی وابێت هێزە ئۆپۆزسیۆنەکان هیچیان پێ ناکرێت.

> **سەیری سۆشیال میدیا بکە چەندین کەس دەبینی لەوێ ئیش دەکات و بەدوایدا بڕۆ لە دەزگا مخابەراتییەکانەوە کار دەکات دەبینیت ئەمانە خەریکی تێکدانی شیرازەی کۆمەڵایەتین.**

لەهەمانکاتدا هەریەکێ لەم هێزە ئۆپۆزسیۆنانە کێشەی تایبەتی خۆیان هەیە، کە پەیوەندیدارە بە گوتاری، بە چۆنیەتی کۆنتاکتی لەگەڵ خەڵک، پەیوەندییدارە بەو هەڵە سیاسییانەی کە دەیکات، پەیوەندیی هەیە بەو تاکە کەسانەی نوێنەرایەتییان دەکات و جاری وا هەیە ناوئومێدیی دەدەن بە خەڵک. بۆ نموونە: یەکێ لە هەڵە گەورەکانی گۆڕان ئەوەبوو خەڵکی وا تێگەیاند کە گۆڕانکاریی بە ئانوساتێ دێتە کایەوە، بە هەڵبژاردنێ گۆڕانکاریی دروست دەبێت، لەکاتێکدا دەبوو نەفەسێکی دوورمەودا بەخەڵک بدەیت، کە هەموومان کار بۆ گۆڕانکاریی دەکەین، بەڵام بڕینی ئەم ڕێگایە ئاسان نییە و بە شەووڕۆژێ نایەتە کایەوە.

خاڵێکی تر ئەگەر گۆڕان پاش ئۆپۆزسیۆنبوونی یەکسەر نەڕۆشتایەتە دەسەڵاتەوە ڕەنگە خەڵک هێشتا هیوای زۆری هەر بە گۆڕان بمایە، خەڵک چاوەڕێی ئەوەبوو گۆڕان ئەگەر لە دەسەڵات کێشەی بۆ دروستکرا هەنگاوی تر بگرێتەبەر، ئەو ئیحاجە بە خەڵک درابوو کە هەنگاوی تر دەگرێتەبەر، بەڵام کە نەیگرتەبەر ئەمەش دیسانەوە سەرچاوەیەکی

نائومێدیی بوو بۆ خەڵک. لەلایەکی ترە لە پاش وەفاتی کاک ناوشیروان لادان لە مەبادیئە بنەڕەتییەکان کە گۆڕانی لەسەر دروستکرابوو ئەمە وایکرد کە دیسانەوە خەڵک ناوئومێد بێت لە گۆڕان، بەتایبەت لەم خولەی ئێستای کابینەی نۆیەمی حکومەتی هەرێم، دەبینیت وەزیرەکانی: بێ دەسەڵات، بێ هەڵوێست لەئاست بڕینی مووچەی خەڵک، لە ئاستی پێشێلکردنی ماف و ئازادییەکان.

گۆڕان بۆئەوە هاتە کایەوە کە داکۆکیاری سەرسەخت بێت لە ئازادیی ڕادەربڕین، کۆمەڵێ کەس لە بادینان بەبێ گوناح دەستگیرکران نەمانبینی ئەوانەی لەناو دەسەڵات نوێنەرایەتی گۆڕان دەکەن بۆ یەک جاریش نارەزایی دەربڕن. ئەمەی سەبارەت بە گۆڕان باسی دەکەم، سەبارەت بە هێزەکانی تری ئۆپۆزسیۆنیش هەر ڕاستە.

ڕاستە کاری سیاسیی لە گۆڕەپانەکە قورسە، بەڵام هەندێکی پەیوەندیی بە خودی لایەنەکانەوە هەیە، کە هەندێ جار ڕاستگۆ نەبوون بەرانبەر بەو بەڵێنانەی بەخەڵکیان داوە، ئەم هێزانەی ئۆپۆزسیۆن ناچارن بە هەرشێوەیەک بووبێت سەروسەودایان هەر لەگەڵ دوو هێزەکەی دەسەڵاتدا هەبێت، بۆ نموونە خۆیان باس لەوە دەکەن کە جاری وا هەیە پارە لە دوو هێزەکەی دەسەڵات وەردەگرن، یان ئەوە ئاشکرا دەبێت کە لێرەولەوێ پارە وەردەگرن، ئێمە کارمان بۆ ئەوەکرد بودجەی حیزبەکان بە یاسا بکرێت و لە پەرلەمانی کوردستان یاسامان بۆ دەرکرد بۆئەوەی حیزبەکانی کوردستان نانەخۆرەی دەستی یەکێتیی و پارتیی نەبن.

هۆکارە بابەتییەکان زیاتر کێشەیان بۆ ئۆپۆزسیۆن دروستکردووە، تەنانەت کێشە خودییەکانی ناو ئۆپۆزسیۆنیشیان پەرە پێداوە، ئەوەش شاراوە نییە ئەم هێزانەی ئۆپۆزسیۆن بۆخۆیان کۆمەڵێک کێشەی ناوخۆییان هەیە، کە پەیوەندیدارە بە ستراکچەری خۆی، بە گوتاری خۆی، بە چۆنیەتیی پەیوەندیی لەگەڵ خەڵکدا، خۆشباوەڕییان بەخەڵک بەخشیی و لەپێناو هەندێ جار بۆ کۆکردنەوەی دەنگی ناڕازیی چوونە بەرەی خەڵکەوە، نەک بیروباوەڕیان وا بووبێت.

**+ ئەم حاڵەتەی ئێستای کوردستان کە ئەمری واقیعە، چۆن بکرێتە نێودەوڵەتی؟**

- پێش ڕووخانی ڕژێمی بەعس ئێمە دەسەڵاتێکی نیمچەسەربەخۆمان هەبوو، کە هیچ پەیوەندییەکمان لەگەڵ عێراقدا نەمابوو، پاییزی ١٩٩١ کە ڕژێمی عێراق کشایەوە لە سێ پارێزگاکەی کوردستان تا ڕووخانی ڕژێمی پێشوو هیچ پەیوەندییەکمان لەگەڵ ڕژێمی عێراقیدا نەمابوو، تەنانەت لەچوارچێوەی بەرنامەی نەوت بەرانبەر بە خۆراک پشکی کوردستان لە عێراق جیاکرایەوە، دواتر پاش ڕووخانی ڕژێمی پێشوو و نووسینەوەی دەستووری عێراق خۆمان لکاندەوە بە عێراقەوە، بەڵام هەندێ لە دەسەتەڵاتەکان هەر

مانەوە بۆ هەرێمی کوردستان، تەبعەن ئەم سوڵتەیە لەبەرچی بۆ کوردستان دروستکرا؟ لە ئەنجامی ئەو هەموو نەهامەتییەی بەسەر کوردستاندا هاتبوو، ئەو پێشلکردنی ماف و ئازادییانەی خەڵک لەلایەن ڕژێمی پێشووەوە، بەو حسابەی کە ئێمە دەسەڵاتێکی جیاواز پێکدەهێنین و هەڵبژاردن دەکەین و دیموکراسیی جێبەجێ دەکەین و دەستاودەستی دەسەڵات دەکەین، ئەمە وایکرد کە پشتیوانی نێودەوڵەتیی بۆ کوردستان دروست ببێت، ئێستا ئەم پشتیوانییە ڕۆژبەڕۆژ لاواز دەبێت.

سێ هۆکاریش بوونەتە هۆی لاوازبوونی سوڵتەی کوردستان:

یەکەم: مەسەلەی ماف و ئازادییەکان، بەهۆی ئەوەی ئێستا لە کوردستان ماف و ئازادییەکان پێشێل دەکرێن، خەڵک دەخرێتە زیندانەوە، یەکێک لەو تۆمەتانەی بۆ زیندانییە سیاسییەکان دروست دەکرێت ئەوەیە کە تۆ ڕۆشتوویت سەردانی کونسوڵخانەی ئەمریکا و ئەڵمانیا و فەڕەنسات کردووە و داوای بایکۆتی کاڵای وڵاتێکت کردووە، کە خودی ئەم دەوڵەتانە بوونەتە هۆی دروستبوونی کیانی هەرێمی کوردستان و لە بەرانبەر دەوڵەتی عێراقدا بە بەهێزیی بمێنێتەوە، ئێستا تۆ هاتوویت سەردان و پەیوەندیی لەگەڵ کونسوڵخانەی ئەم دەوڵەتانە بەتاوان لەقەڵەم دەدەیت و خەڵکی لەسەر سزا دەدەیت!

دووەم: ئەو گەندەڵییەی لە هەرێمی کوردستاندا هەیە، دیسانەوە کۆمەڵی نێودەوڵەتیی بێزار کردووە لە هەرێمی کوردستان، لەهەمانکاتیشدا یەکنەخستنی هێزی چەکدار و بەرەوپێشنەخستنی پرۆسەی دیموکراسیی. ئەمە هۆکارێکی ترە بۆ لاوازبوونی پێگەی هەرێمی کوردستان، ڕاستە ئێمە ڕاپەڕینمان کرد، بەڵام بیرمان ماوە کە ڕژێمی پێشوو هاتەوە خەڵک هەمووی ئاوارەبوو کۆڕەوی کرد، لە ئەنجامی کۆڕەوەوە بڕیاری ٦٨٨ و پرۆژەی ناوچەی دژەفڕین دەرچوون و ڕژێمی عێراق ناچاربوو لە کوردستان بکشێتەوە، ئەوە وایکرد ئەم هەرێمە بە ئەمری واقیع دروست ببێت.

سێیەم: هۆکارێکی دیکەی لاوازبوونی هەرێمی کوردستان، شکستی ڕیفراندۆم و هەرەسی شازدەی ئۆکتۆبەرە. دەستووری عێراق من لە نووسینەوەیدا نەبووم، بەڵام بەرپرسانی کورد بە کاک مەسعوودەوە وتیان دەستوورێکی باشە، تۆ هاتیت وتت: من بەم دەستوورە لەگەڵ عێراقدا دەژیم، دوایی هاتیت وتت: من جیا دەبمەوە لە عێراق، ڕیفراندۆمێکت کرد کە گوایە جیا بیتەوە لە عێراق، بەڵام نەتتوانی جیابیتەوە، کارتێکت بەدەستەوەبوو کارتەکەت فڕێدا و سووتاندنت، تۆ نەتتوانی ئەو کارتە بەکاربهێنیت، کەواتە تۆ لاوازبوویت کارتێک کە بەدەستەوە بوو نەتتوانی بەکاری بهێنیت و فڕێتدا ئیتر لاواز دەبیت.

١٦ی ئۆکتۆبەریش بەهەمان شێوە تۆ نیوەی خاکی کوردستانت لەدەستدا. پێشتر

له ٢٠٠٨ حکومەتی عێراقی لەشکرکێشیی کرد بۆ هەندێ لە ناوچە جێناکۆکەکانی دیالە ئەمانە ڕۆیشتن (قەرەتەپە) و (جەلەولا) و ئەو ناوچانەیە تەسلیم کردن، وەفدێک بە سەرۆکایەتیی کاک کۆسرەت و ئەندامێتیی فازڵ میرانیی و ئەوانە ڕۆیشتن و لەگەڵ حکومەتی عێراقیی ڕێککەوتن کە خانەقینیشان تەسلیم بکەن، ئێمە وتمان: بەپێی دەستوور حکومەتی فیدراڵ بۆی نییە بەهێزی چەکدار داوای ئەم ناوچانە بکات، حکومەتی فدیراڵ مولزەمە بەپێی مادەی ١٤٠ی دەستووری عێراق چارەنووسی ئەم ناوچانە یەکلا بکاتەوە.

بەڵام ئەمری واقیع چییە دەبێت پارێزراو بێت تا بەپێی مادەی ١٤٠ ئەو بابەتە یەکلا دەبێتەوە، ئەمە قبوڵکرا هەرێم بەکاریهێنا و وەرگیرا، بەڵام تۆ لە ئەنجامی شکستی ڕیفراندۆم ئەو ناوچانەت لەدەستدا.

نەک هەر ناوچانەی لە ٢٠٠٣ وەرگیرابوونەوە، بەڵکو ئەو ناوچانەی لە ٢٠١٥ و ٢٠١٦ گیرانەوە لەلایەن کوردەوە، بەدرێژایی سەد ساڵی ڕابردوو کورد نەیتوانیبوو پێی بگات، هەر هەمووی لەدەستدا. کەواتە مەسەلەی دووەمی لاوازیی هەرێمی کوردستان ئەنجامدانی ڕیفراندۆم و شکستی ڕیفراندۆم و هەرەسی شازدەی ئۆکتۆبەربوو.

سێیەم: خاڵێکی دیکەی لاوازبوونی هەرێمی کوردستان، کە خاڵی هەرە سەرەکییە، ئەویش بابەتی ئابووریی سەربەخۆیە، ئەوەی لە نێوان دوو کەواندا ناویان لێنا (ئابووریی سەربەخۆ)، تۆ ڕۆیشتیت نەوتت فرۆشت، وتت: من ئابووریی سەربەخۆ دروست دەکەم، بەڵام نەوتت فرۆشت نە مایەکەی دیارە نە قازانج! نەوتت فرۆشت نەتتوانی ئابووریی سەربەخۆ دروست بکەیت، بەڵکوو وابەستەییت دروستکرد لە چەند ئاستێک، وابەستەییت دروستکرد بۆ نەوت، وابەستەییت دروستکرد بۆ تورکیا، وابەسەتییت دروستکرد بۆ عێراق، شکستت خوارد لەمەدا.

ئەمانە هەموو هۆکارن بۆئەوەی لەبری ئەوەی واقیعی هەرێمی کوردستان پەرەی پێبدەیت، وردە وردە لاوازت کرد، ئێستا هیچ شتێکی وا نییە ئەم واقیعی هەرێمی کوردستانە بەرەو پێشەوە بەریت و هەموو کارتەکانت سووتاندووە.

ئەوەی کە دەتوانێت هەرێمی کوردستان بەهێز بکاتەوە دروستکردنی حوکمڕانییەکی بەهێزە لە هەرێم، ڕێککەوتنە لەگەڵ حکومەتی فیدراڵی عێراق لەسەر مەسەلەی نەوت و غاز، بەرەوپێشبردنی دیموکراسییە، وازهێنانە لە کپکردنی دەنگی ناڕازی. من پێموایە تازە ناتوانرێت بەر بەو مەترسییانەی داهاتوو بگیرێت کە مەترسیی قورستر بۆ هەرێمی کوردستان لە ئارادان، بەم هەنگاوانەی دەسەڵاتدارانی هەرێم دەیگرنە بەر و دوایین بڕیاری دادگای باڵای فیدراڵی عێراق، ئەم دەسەڵاتدارانەی هەرێمی کوردستان، قەوارەی هەرێمی کوردستان بەخۆیانەوە دەڕووخێنن.

به عینادیکردن لەگەڵ دادگای باڵای فیدراڵی نابێت، بڕیاری دروست ئەوەیە بڕۆن لەگەڵ حکومەتی فیدراڵی ڕێک بکەون ئەگەر ئەوە نەکەن دوو سیناریۆ لە بەردەم هەرێمی کوردستاندایە: ئەوانیش:

یەکەم: شتێکی وەکو ڕێکەوتننامەی جەزائیری ١٩٧٥ کە لە نێوان عێراق و ئێراندا ڕێککەوتننامەی جەزائیر کرا، دوور نییە لە نێوان عێراق و تورکیا ڕێککەوتننامەیەکی وا دروست بکرێت.

دووەم: شتێکی هاوشێوەی ٣١ی ئاب پارتیی ناچار بێت دەستی تورکیا بگرێت و بیهێنێتە ناوخۆی ململانێکانی عێراق و هەرێمی کوردستان، کە ئەمە زۆر قورس دەشکێتەوە و عێراقی ئێستا عێراقی ڕابردوو نییە و بەئاسانیی قووت ناچێت و دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان هەرەس دەهێنێت. بە هەردوو بارەکەدا ئەگەر دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان لەم حاڵەتەی ئێستا بەردەوامبن دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان هەرەس دەهێنێت.

**+ هەڵسەنگاندنی تۆ وەک کەسێکی پسپۆڕی یاسایی و دەستووری بۆ کۆی حوکمڕانیی هەرێم چۆنە و چی قۆناغێکی پەسەند دەکەیت، واتا دەرد و دەرمانی چۆن دەستیشان دەکەیت؟**

- پیشتر کەمێک ڕوونمان کردەوە، ئەمەی ئێستا بەمشێوە هەیە باوەڕ ناکەم بەردەوامبێت، ئەگەر دەمانەوێت هەرێمی کوردستان بپارێزین و بمێنێتەوە دەبێت کۆتایی بەم شێوازی حوکمڕانییەی ئێستای هەرێمی کوردستان بهێنین، پێویستمان بە گەڕانەوەیە بۆ دەنگ و ڕای خەڵک، پێویستمان بە ئابوورییەکی شەفاف و پاک هەیە کە دوور بێت لە گەندەڵی، پێویستمان بەوەیە هێزی چەکداری پیشەیی و بێلایەن لە هەرێمی کوردستاندا هەبێت، پێویستمان بە یەکلاکردنەوەی ململانێ سیاسییەکان بەشێوەی ئاشتییانە و لەڕێی سندووقەکانی دەنگدانەوە، بەر لە هەموو شتیش پێویستمان بەوەیە ئەم دەسەڵاتدارانەی ئێستای هەرێمی کوردستان دان بە فەشەلی خۆیاندا بنێن، کە نەک هەر فەشەلیان هێنا، بەڵکو هەرێمی کوردستانیان دووچاری مەترسیی کردووەتەوە، ڕاستە هەمیشە مەترسیی دەرەکیمان لەسەر هەبووە و هەیە، بەڵام بە قەناعەتەوە دەڵێم گەورەترین مەترسی لەسەر هەرێمی کوردستان دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستانە، بەڕۆشتنی ئەم دەسەڵاتدارانە ڕەنگە بتوانرێت شێوەکی تری حوکمڕانیی بهێنرێتە کایەوە کە هەرێمی کوردستان لە بەرانبەر دەرەوەی خۆی بەهێزتر بێت، بەڵام بەم حوکمڕانییەی ئەم دەسەڵاتدارانەی هەرێمی کوردستان وەکوو چۆن دەیانبینین شێری ماڵەوە و ڕێوی دەرەوەن هەرێمیان والێکردووە لە بەرانبەر دەرەوەدا زۆر زۆر لاواز بێت، هێندەی تر بەرانبەر دەرەوە لاواز دەبێت.



ئەحمەدی حاجی ڕەشید

# ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێمی کوردستان هەڵسەنگاندن یان بەراورد

ئاشکرایە لای هەمووان ئەزموونی حوکمڕانی لای کوردانی باشوور بەتایبەت (هەرێمی کوردستانی عێراق) تازە نییە چ وەك شۆڕشگێڕ و خاوەنی ناوچەیەکی دیاریکراو یان وەك دەسەڵاتداری فەرمی و خاوەنی حکومەتی هەرێم، بەتایبەت ئەزموونی حکومەتداری لە هەرێمی کوردستاندا کە زیاتر لە (٣٠) ساڵی تێپەڕاندووە، ڕەنگە لۆژیکی نەبێت ئەم جۆرە هەڵسەنگاندن و بەراوردە، چونکە هەڵسەنگاندن دەبێت کۆمەڵە پێوانەیەکی (معیار) دیاریکراو هەبێت تا هەڵسەنگاندنی زانستی بێت لە ئاست ئەو پێوەرانە.

سەبارەت بە بەراوردکردنیش دەبێت لێکچوویەکی وەک حکومەتی هەرێک هەبێت تا بەراوردەکە بکەین و ستەم لە هیچ لایەک نەکەین.
بەڵام لەبەرئەوەی حکومەتی هەرێم یان ڕاستترە بڵێین دەسەڵاتی هەرێم، ئەوەندەی لە دەسەڵاتێکی دیفاکتۆ دەچێت ئەوەندە لە حکومەت ناچێت و پرەنسیپی حکومەتێکی دامەزراوی بەسەردا ناچەسپێت، بەڵام لەڕووی مامەڵەکردنی حکومەتی هەرێم لەگەڵ دەوروبەریی و لەگەڵ هاوڵاتیانی نیشتەجێی هەرێم لە ساڵی ١٩٩١ و جۆرێک لە سەربەخۆیی بەخۆیەوە بینیوە پاش ساڵی ٢٠٠٥ دەقەکانی دەستووریش تا ئەندازەیەک دەسەڵاتی زۆر فراوانیان بە هەرێم بەخشیوە و لەوەش گرنگتر و بە حوکمی دیفاکتۆ هەرێم وەک حکومەتێکی نیمچە سەربەخۆ مامەڵەی کردووە و لە هیچ بابەتێک نەگەڕاوەتەوە بۆ حکومەتی فیدراڵی، ڕاستتریش بڵێین حکومەتی فیدراڵی لە هەندێ باردا پەنای بۆ حکومەتی هەرێم بردووە.
ڕنگە نالۆژیکییەکەی لەوەدا بێت کە هەردوو حکومەتەکە جیاوازی زۆریان هەبێت لەڕووی پێگەکەیانەوە لەسەر ئاستی دیپلۆماسی یان ئیداری یان ئابووریی و پاشانیش سیاسی، چونکە لە سادەترین پێناسەدا: حکومەتی هەرێم بەشێکە لە حکومەتی عێراقی فیدراڵ، هەربۆیە شوبهاندن یان بەراورد لە نێوان دوو وێکچوودا دەکرێت، نەک لە نێوان بەش لەگەڵ هەموو (کل). هەربۆیە بەراوردەکە لەسەر بنەمای چوارچێوە گشتییەکەی حکومەتداری دەکەین و لەسەر ئاستی چەند تەوەرێک بەراوردەکە ئەنجام دەدەین تا نەخشەی بەراوردکردنەکەمان ڕوون بێت و خوێنەر سوودمەند بێت لێیان.

### تەوەری یەکەم: ڕەوشی سیاسیی

ئەم ڕەوشە لە خراپترین دۆخیایەتی، کاتێک باسی ڕەوشی سیاسەت دەکەین واتە باسی پرۆسەی سەروەری یاسا و دەستاودەستکردنی دەسەڵات و ڕۆڵی پەرلەمان و باڵادەستی دادگاکان و باری دارایی و گرنگیدان بە پەروەردە و پێگەیاندن و ئاستی تەندروستی و قۆرخی بازاڕ و دۆخی مافی مرۆڤ و کۆچی گەنجان.... هتد.
ئەگەر لە خۆمان و لە دەسەڵاتی هەرێم بپرسین کام لەو بابەتانە لە ئاستێکی باشدان، بێگومان هیچیان، زۆرترین نموونە لەسەر خراپی دۆخی ئەو بابەتانە بەکورتی ئەوەیە، یاسا بۆتە داوێک ئازادیخوازی پێ زیندان دەکرێت و دەستاودەست کردنی دەسەڵات تەنها لە نێوان ئامۆزاکاندا دەکرێت چ لەسەر ئاستی حکومەت یان لەسەر ئاستی حیزب و پەرلەمان بووەتە لاوەکیترین دامەزراوەی ئەم هەرێمە و حیزب دەتوانێت دەرگاکەی قوفڵ بدات ئەگەر ویستی یاسایەک دەربکات لە بەرژەوەندی ئەو نەبێت و دادوەر دەبێت

تەزکییەی حیزبی هەبێت بۆئەوەی پلەی وەزیفی بەرز بکرێتەوە، هەرچی دۆخی دارایی هەیە، ئەوا مووچە بۆتە هەواڵی بەپەلە و مانگ بووەتە (٤٥) ڕۆژ و بازاڕ قۆرخ کراوە بۆ دوو هێزی سیاسیی یان نزیک لەو دوو هێزە.

ئەگەر بەراوردێک بکەین لە نێوان حکومەتی فیدراڵ و حکومەتی هەرێم لەو بوارانەی ئاماژەمان پێ دان ئەوا دەتوانین زۆر بە ڕاشکاوی بڵێین:

لەبەرئەوەی زیاتر لە پێکهاتەیەک و زیاتر لە هێزێکی سیاسی لە عێراقدا هەن ئەوا پرۆسەی سیاسی جۆرێک لە کێبڕکێی پێوە دیارە و جموجوڵێکی سیاسی و موبادەرە و مناوەرەی خستووەتە نێو گۆڕەپانی سیاسی عێراقەوە کە ئەو چەقبەستوویەی هەرێم لە نێوان دوو هێزی قۆرخکاری تێپەڕاندووە، سیاسەت لە عێراقدا بە ڕۆحێکی دیکەوە ئەنجام دەدرێت، لەنێوخۆشدا هێزە سیاسییەکان ساڵانە و چوار ساڵ جارێک کۆنگرەی خۆیان دەبەستن و ڕاستە زۆرجار هەمان دەموچاو دووبارە دەبنەوە لە مەشهەدی سیاسیدا، بەڵام لە کوردستان کۆنگرە بۆ شەرعیەتدانە بەوەی لەوەوپێش هەبووە، بۆ هەندێ هێز چەند ساڵ تێپەڕیووە بەسەر کۆنگرەدا و لە حاڵەتی کردنیشی گۆڕانکارییەکان ڕواڵەتین.

لە دیوێکی دیکەوە خاڵی جیاکەرەوەی هەرێم لە حکومەتی فیدراڵ ئەوەیە هەرچۆنێک هەبێت لە بەغدا لەنێو هێزە سیاسییەکان و حکومەتیش دەستوور حەکەمە و کەس بۆی نیە چەن و چوون بکات، بڕیاری کۆتایی دەستوور و دادگای فیدراڵی دەیدەن، هەرچەندە هەندێ جار تەئویلی ناجۆر و شکاندنەوەی بەرژەوەندی سیاسی دەبنە لێکدانەوە دەستوورییەکان لەلایەن دادگای باڵای فیدراڵییەوە، بەڵام لە هەرێم سەرۆکی حیزب بووەتە دەستوور و حیزب بووەتە دادگای فیدراڵ، هەرێم گەشتووەتە ئاستێک ئیدعای نادەستووری بڕیارەکانی دادگای فیدراڵیش ڕادەگەیەنێت و ملکەچیان نابێت.

خۆ ئەگەر بێینە سەر شێوازی دامەزراوەکانی هەردوولا بەدڵنیاییەوە دامەزراوەکانی حکومەتی فیدراڵ بەهێزتر و کاریگەرترن لەوانەی هەرێم بە نموونە دیوانی چاودێری لە هەرێم ئەگەر بڵێم هیچ ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەهێشتووەتەوە زیادەڕەوی نیە، دەزگای ئەستۆپاکی تەنها بۆ فەرمانبەری پلە نزمە، بەڵام بەپێچەوانەوە دەزگای ئەستۆپاکی لە عێراق و فیدراڵدا لە ئاستە بەرزەکان و پلە باڵاکان ملکەچ دەکات بۆ لێپێچینەوە و دیوانی چاودێری بە دەیان و بگرە بە سەدان پلە باڵای حکومەتی فیدراڵیان ڕاپێچی دادگاکان کردووە، و پەرلەمانی هەرێم لە ماوەی (٣٠) ساڵی تەمەنیدا نەیتوانیوە لێپێچینەوە لە وەزیرێک بکات و متمانەی لێوەبگرێتەوە، بەپێچەوانەوە لە پەرلەمانی فیدراڵیدا وەزیر پرساندنی بۆ کرا و متمانەشی لێ وەرگیراوە، ڕووبەڕووی دادگاش کراوەتەوە.

سەبارەت بە دۆخی حیزبایەتی لە هەرێم و بەغدا گرفتێکی بونیەوی هەیە، ئەویش ئەوەیە

حیزبەکانی کوردستان ئێستەشی لەگەڵ بێت مانەوەیان لەسەر بنەمای شۆڕشگێڕێتی شاخ بنیاتناوە و خاوەنی هێزی چەکدار و دەزگای موخابەرات و بودجەی زەبەلاحن، بەڵام لە بەغدا و شوێنەکانی تر هێزە مێژووییەکان بەرەو کۆتایی دەڕۆن، هەریەکەیان چەندجار پەرت بوون، ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەماوە، بۆیە هێزی نوێ و کەسی نوێ خەریکە لە جێگایان دروست دەبن. بۆیە هێزەکانی کوردستان هێزگەلێکی ئایدۆلۆجی چوارچێوە ئاسنن و توانای گۆڕانکارییان نەماوە، بەپێچەوانەوە هێزەکانی گۆڕەپانی سیاسی لە عێراق زیاتر لە گۆڕانکاریدان.

**حیزبەکانی کوردستان ئێستەشی لەگەڵ بێت مانەوەیان لەسەر بنەمای شۆڕشگێڕێتی شاخ بنیاتناوە و خاوەنی هێزی چەکدار و دەزگای موخابەرات و بودجەی زەبەلاحن.**

ئەگەر باس لە دیموکراسی بکرێت وەک فاکتەری دەستاودەست کردن، ئەوا دەتوانین بڵێین قۆناغەکانی دیموکراسی بریتین لە ڕۆشنبیریی و بوونی دامەزراوەی ڕەسەن و یاسای پێشکەوتوو کە هەر سێ بنەماکەی دیموکراسی لە بەغدا بوونیان زیاترە تا هەرێمی کوردستان، هەرچەندە دیموکراسیەت لە تەواوی عێراق بە هەرێمی کوردستانیشەوە تەنها ناوێکە و ناوەرۆکی تێدا بەدی ناکرێت. سەبارەت بە هەڵبژاردن و دەستاودەستکردنی دەسەڵات ئەوەندە بەسە کە بڵێین هەرێم لە ماوەی ئەو (٣٠) ساڵەدا نیوەی تەنها یەک کەس سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بووە، لەکاتێکدا لە عێراق و حکومەتەکەی زیاتر لە (٦) سەرۆک وەزیران گۆڕاوە و تەنها یەک کەس دوو خوول سەرۆک وەزیران بووە.

کۆتا بەراورد، دۆخی دارایی و بوونی گەندەڵییە لە هەردوو حکومەتدا، بە بڕوای من هەرێم و عێراق کێشەی نەبوونی ماڵ و داراییان نییە بەو ئەندازەی کێشەی ئیدارەدانی ماڵ و داراییان و هەیە، بۆیە مانگانە داهاتێکی زەبەلاح دێتە هەرێم و بەغدا، بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەم داهاتە بە شەفافی کۆناکرێتەوە و سەرف ناکرێت، هەربۆیە گەندەڵی تەواوی جومگەکانی هەردوو حکومەتی هەرێم و حکومەتی عێراقی گرتووەتەوە، بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە کە گەندەڵی لە هەرێمدا لە پێش ئەوەی داهاتەکان بچنە وەزارەتەکان ئەنجام دەدرێن، ئەگینا وەزارەتەکانی هەرێم گەندەڵییان زۆر بە ئاستێکی کەم تێدا دەکرێت، بۆ

نموونە داهاتی نەوت پێش ئەوەی بگاتە وەزارەتی دارایی دیار نامێنێت، چ بە پێدانی بە کۆمپانیاکانی بواری نەوت، یاخود نەگەڕاندنەوەی بۆ وەزارەتی دارایی.

سەبارەت بە گومرگ لە هەرێمدا بەهۆی بە ئەلیکترۆنی کردنی دەروازەکان، گەندەڵی زۆر کەم بووەتەوە لە دەروازەکاندا، بەڵام لە پشت دەروازەکان لە ڕێگە تایبەتەکانەوە بە قاچاخ کاڵا و کەلوپەل هاوردە دەکرێت بە خاڵی گومرگیدا تێپەڕ ناکات، بۆیە داهاتە گشتییەکانی هەرێم پێش تۆمارکردنیان وەک داهات دیار نامێنێت یان نایەتەوە ناو خەزێنەی حکومەتەوە.

هەرچی حکومەتی عێراقیشە لە فرۆشتنی نەوتدا ئاستی شەفافیەت زۆر بەرزە و بڕو داهاتی دیارە، تەنها ناشەفافیەتێک کە دەکرێت ئەو نەوتە خاوەیە کە دەکرێت بە پاڵاوگەکانی عێراق، کە بە قسەی زۆرێک لە شارەزایان نزیکەی (٢٠٠٠٠٠) دوو سەد هەزار بەرمیل نەوت ڕۆژانە لە نێوان پاڵاوگە و بیرەکاندا دیار نامێنێت.

سەبارەت بە دەروازە سنووریەکانیش لەبەرئەوە تا ئێستا بە ئەلیکترۆنی نەکراون، بۆیە گەندەڵییەکی زۆری تێدا دەکرێت، بە قسەی بەرپرسی خاڵە سنوورییەکانی عێراق لە پاش نیوەڕۆوە زۆرێک لە دەروازەگانی ناوەڕاست و خوارووی عێراق لە دەست دەوڵەتدا نامێنێت و کۆمەڵێک میلیشیای چەکدار بەڕێوەی دەبەن. هەربۆیە ئەو داهاتەی لە گومرگەکانەوە دەچێتە خەزێنەی دەوڵەت زۆر کەمە و لە ئاست ئەو ئاڵوگۆڕە بازرگانییەدا نییە.

گەندەڵی لە حکومەتی عێراقدا لە دوای گەڕانەوەی داهاتەکانەوە دەستپێدەکات و وەزارەتەکانی حکومەتی عێراق بەتەواوی مانا زۆرترین گەندەڵییان تێدا دەکرێت و هەرئەوەشە وایکردووە کە وەزارەتەکان بە سەرچاوەی داهاتی پارتە سیاسییەکان هەژمار بکرێن و کێبڕکێی تەواو هەیە لە نێوان هێزە سیاسییەکاندا لەسەر وەزارەتە خزمەتگوزارییەکان، ئەوەش وایکردووە هیچ هێزێکی عێراق ئامادە نەبێت ببێتە ئۆپۆزسیۆن، چونکە سەرچاوەی داهاتەکانی لەدەست دەدات.

### تەوەری دووەم: دۆخی کۆمەڵایەتی و دەروونی هاوڵاتیان:

ڕەنگە موبالەغە نەبێت ئەگەر بڵێین هەرگیز دۆخی کۆمەڵایەتی و باری دەروونی هاوڵاتیان ئەوەندە خراپ و ئاڵۆز نەبووبێت، ئەگەر سەیری ئامارەکانی باری کۆمەڵایەتی و دەروونی بکەین ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە لە پێکهێنانی هەر سێ خێزان دانەیەکیان هەڵدەوەشێتەوە لە ماوەی ساڵێکدا، کۆچی گەنجان باشترین بەڵگەیە کە ڕازییە بەو هەموو ڕەزالەت و نەهامەتی و ترسناکییە و ڕێگەی هات و نەهات دەگرێتەبەر، بڵاوبوونەوەی مادەی هۆشبەر بە فراوانی، کە ساڵی پار بۆ یەکەم جار لە مێژووی

عێراقدا یەکەم نەخۆشخانەی چارەسەرکردنی مادده هۆشبەرەکان کرایەوە لە پارێزگای بەسرە، کارەساتێکی دیکە بەرێوەیە کە سەرەتاکانی دەرکەوتوون ئەویش بێ مەیلی (عزوف)ی گەنجانە بۆ چوونە ناو پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە، کە سەردەکێشێت بۆ بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی و کۆمەڵێک نەخۆشی کۆمەڵایەتی کە جاران نەبینراون و نەبیسراو بوون، خۆ ئەگەر بەراوردێک بکەین لە نێوان پارێزگاکانی هەرێم و ناوەڕاست و خواروو، ئەوە دەبینین حاڵی ئەوان لە حاڵی هەرێم باشتر نییە، تەنها لە کۆچی گەنجاندا نەبێت کە لە هەرێم لاسایی کردنەوەیەکی زۆر نەشاز هەیە لە کۆچدا، شیرازەی کۆمەڵگە بەتەواوی بەرەو هەڵدێر دەڕوات.

تەوەری سێیەم: ڕۆڵی ئایین و پێگە و کاریگەرییەکانی لەسەر هاوڵاتیان و ڕۆڵی حکومەت

پابەندییەکی شەعبی هەیە بە ئایینەوە لە سەرجەم ناوچەکانی عێراقدا بە جیاوازی ئەوەی هێزە ئیسلامییەکان لە کوردستان و ناوچەی سوننەنشین لە دەسەڵاتدا نین و پێگەشیان لاوازە، بەڵام خەڵک تا ئەندازەیەک باوەشی بۆ ئیسلام و ڕێنمایەکانی کردووەتەوە، بەڵام دەسەڵات بە بەرنامە لە هەوڵی لاوازکردنی پێگەی ئایندایە لەناو کۆمەڵگە و دەیان و سەدان لەمپەر دروست دەکات لە بەردەم هێزە سیاسییە ئیسلامیەکان و بانگخواز و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، دەیان و بگرە سەدان ملیار دینار سەرف دەکات بەمەبەستی لادانی گەنجەکان لە پابەندبوونیان بە ئایین و ئیسلامەوە، بەشێوەیەکی بەربڵاو مۆڵەت دەداتە یانە شەوانەکان و حەفەلاتی تیکەڵ و سەرف کردنی پارەی خەیاڵی لە ئاهەنگەکانی سەری ساڵ و هتد...

بە پێچەوانەی هەریم و ناوچە سوننەنشینەکان، هێزە ئیسلامییەکان لە ناوەڕاست و خواروو دەسەڵات بەدەستن و هێزیان هەیە و سەرمایەی خەیاڵی دیتە بەردەستیان، بەڵام لەبەرئەوەی نەیانتوانیوە خزمەت بە خەڵک بکەن، بۆیە وەک پەرچەکردار لە ئێستەدا مەدێکی بێباوەری (ئیلحاد) لە تەشەنەیەکی ترسناکدایە و ڕۆژ بە ڕۆژ هێزە ئیسلامییەمان بەرەو پووکانەوە و پارچە پارچە بوون دەڕۆن.

بە بڕوای من ئەزموونی هەرێمی کوردستان بەتەواوی شکستی هێناوە تەنها بێ بەدیلی مانەوەی داخستووە، هەرچی عێراقی ناوەڕاست و خواروویشە خەریکە خەڵک دەگات ئەو دروشمەی کە کاتی خۆی دوای رووخانی شای ئێران بە ساڵێک لە شەقامەکانی تاراندا دەیانوتەوە (مرگ بر ما کە گفتین مرگ بر شاه). واتە مردن بۆ ئێمە کە گوتمان بمرێت شا.



د.ئیبراهیم محەمەد عەزیز

# چەقبەستوویی پرۆسەی سیاسی هەرێم و ئایندەیەکی نادیار

پرۆسەی سیاسی هەرێم بە چەندین قۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوە و لایەنە پۆزەتیف و نێگەتیڤەکانی لەکاتی خۆیدا باسوخواسی لەسەر کراوە و لە ئێستاشدا ئەو بابەتانە بوونەتە بەشێک لە مێژووی سیاسی هەرێمی کوردستان. لە بارودۆخی ئێستادا پرۆسەی سیاسی تووشی چەقبەستووییەکی تەواو بووە بەجۆرێک ئاسۆیەکی ڕوون بەدی ناکرێت لە داهاتوویەکی نزیکدا. گرنگە بارودۆخی سیاسی هەرێم بە ڕەهەندە جیاوازەکانییەوە شیکار بکرێت و ئەگەری بوونی چارەسەر بخرێتە ڕوو. بۆ ئەو مەبەستە و لەچوارچێوەی ئەم بابەتەدا هەوڵدەدەم چەند ڕەهەندێکی کێشەزای هەرێم و ئەو قەیرانانەی بەرۆکی پرۆسەی سیاسی گرتووە بخەمە ڕوو، پاشان وەک گریمانەی چارەسەر لێکدانەوەیەک بۆ ئەگەرەکانی داهاتوو بخەمەڕوو. بۆیە ئەم بابەتە ڕوویەکی ڕەخنەگرانەیە بۆ بارودۆخێک کە کاریگەری لەسەر تاک تاکی هەرێم و ئایندەکەی هەیە کە ئامانجەکان بەئاڕاستەی ئەرێنی نییە.

## تەوەری یەکەم: حیزب خۆرەی دەسەڵات

یەکێک لەو قەیرانانەی کە کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر هەرێم هەبووە بریتییە لە جۆری حیزبایەتی کە مامەڵەیەکی ناتەندروستی کردووە و دەکات  لە کۆی کایە سیاسییەکانیدا. حیزب ئامرازێکی سیاسییە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی سیاسی کە تیایدا دامەزراوە سیاسییەکانی تێدا بینا بکرێت و ڕۆڵی حەقیقی خۆیان ببینن. لەو کۆمەڵگایانەی کە حیزب بوونێکی پۆزەتیڤی هەیە توانراوە دامەزراوە سیاسییە فەرمییەکان بینایەکی بەهێزیان هەبێت و ڕۆڵی هەریەک لە حیزب و حکومەت دیاربێت بەبێ تێکەڵبوونێک یان زاڵبوونی لایەک بەلایەکی تردا. پرسیار لێرەدا ئەوەیە ئایا حیزب لە هەرێمی کوردستان ڕۆڵی خۆی بینیوە؟ ئایا حکومەت بووەتە قوربانی حیزب؟ بەداخەوە لە هەرێمی کوردستان سەرەتای کێشەکان زاڵبوون و تێکەڵکردنی ڕۆڵی حیزب و حکومەتە کە بووەتە سەرچاوەی کێشەکان و تائێستاش زاڵبوونی حیزب بەسەر حکومەتدا حاشا هەڵنەگرە. حیزب لە هەرێم تەنها لەناو حکومەت نییە، بەڵکو لە دەرەوەی حکومەت ڕۆڵی حکومەتیش دەبینێت و لەو ناوەندەدا دەتوانین بڵێین هەرێمی کوردستان حکومەتداری نەبینیوە بەواتا زانستییەکەی، بەڵکو ئەوە حیزب بووە و بەرگێکی بەناو حکومەتی لەبەرکردووە.

گرفتی سەرەکی ئەم جۆرە لە پراکتیزە هەڵەیە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە کاراکتەرەکان عەقڵییەتی حکومەتداریان نییە و ئەو دیسکۆرسەی کاری لەسەر دەکەن سەرچاوەی گرتووە لە زاڵبوونی حیزب لە هەموو کایەکان و پێدانی ڕۆڵێکی ناتەندروستە بە حزبایەتی، بۆیە نە ئەزموونێکی حزبایەتی تەندروست بوونی هەبووە نە ئەدایەکی ڕاست و دروستی حکومەت.

ئەوەی دەگوزەرێت نەبوونی دامەزراوەییە لە بەناو چوارچێوە حکومییەکەدا بەو هەمووە کابینەیەی کە هەبووە کە ژمارەیان ٩ کابینەی یەک لەدوای یەک بووە نەتوانراوە دامەزراوە دروست بکرێت. زۆنی زەرد و سەوز بەتەواوەتی ڕەنگی حکومەتیان گۆڕیوە بەجۆرێک حیزبەکەی سنووری زەرد دەسەڵاتی بەسەر کاروباری سنوری سەوزدا نییە و بەهەمان شێوە ڕاستە بۆ یەکێتی لە سنووری زەرددا. ئەگەر حکومەت حکومەتی دامەزراوەیی بێت دەبێت هەمان ئەو دەسەڵاتەی لە ناوەندا هەیەتی لە شوێنەکانی تری قەڵەمڕەوییەکەیدا هەی بێت بەهەمان ئاست و هێز. ناکرێت هێز و دەسەڵاتێک لە ناوەندەکەدا بوونی هەبێت و حکومەتداری خۆی بکات، بەڵام لە ناوچەکانی تردا فۆرمێکی تری دەسەڵات بوونی هەبێت کە زۆر جیاوازبێت لەوەی کە لە پایتەختەکەدا هەیە کە هەولێرە. نەک حیزبێک لەملا و ئەویتر لەولا کۆنترۆڵی هەموو شتێک بکەن و هیچ ڕۆڵێک بۆ دامەزراوەکان نەهێڵنەوە. ئەوە کەی بەوە دەگوترێت حکومەت لە دوای ٣١ ساڵ

کێشەی کۆکردنەوەی داهاتی هەبێت لە زۆنەکان و گرفت بۆ مووچەخۆران دروستبکات. ئەوە چ جۆرە دەسەڵاتێکە حکومەت هێزی بەرگری نەبێت و پێشمەرگە هی حیزب بێت و کۆنترۆڵ نەکرابێت لەلایەن حکومەتەوە و یەک هێزی یەکگرتووی نەبێت. هێزی ٧٠ و ٨٠ی هەردوولا تەنانەت لیوا هاوبەشەکانیش ناتوانن لە زۆنەکان بەبێ پرسی حیزبی باڵادەست نەک حکومەت ڕۆڵ بگێڕن.

ئەمانە و چەندین نموونەی تریش دەرخەری ئەوەن ئەوەی هەیە تەنها ناوە پێی دەوترێت حکومەت، ئەگەرنا نەیتوانیوە ڕۆڵی حکومەت بگێڕێت. ئەوەی جێگەی پرسیارە بۆ بێدەنگی هەیە بەرامبەر بەمە؟ هەردوو حیزبی زۆنی زەرد و سەوز بەهێزی خۆیان لەو جۆرە مامەڵەیەدا دەبیننەوە و بەرژەوەندی حیزبی هاوبەشیان هەیە لەو بوارەدا. ئەوەش ڕاستی و دروستی بێباک بوون بە لاوازی دامەزراوەکان و هەمیشە لێکجیانەکردنەوەی حیزب و حکومەتە بەبێ بوونی هەستی بەرپرسیارێتی دەوڵەتمەداری.

گرفتەکە لەوەدایە وەک پرۆسە پێنج خولی هەڵبژاردن کراوە لە ٣١ ساڵدا کە بەلای کەمەوە دەبوو ٧ خولی پەرلەمانیمان هەبوایە، لەو پێنج خولەشدا کە هەڵبژاردن کراوە هێندە پرۆسەکە ناشەفاف و گزیی و ساختەکاری تێدا کراوە نەتوانراوە نموونەیەکی جوانی تێدا بەدی بکرێت ببێتە مایەی دڵخۆشی و ئومێد بۆ گەل و نیشتمان. لەلایەکی ترەوە واهەست ناکرێت بووبێتەمایەی بەرەوپێش بردنی پرۆسەی سیاسی و بەرزکردنەوەی ئاستی پرۆسەی هەڵبژاردن، ئەویش بەهۆکاری ئەوەی حیزبی باڵادەست هەمیشە لە بەرژەوەندی خۆی لە زۆنی خۆی بارودۆخەکەی یەکلا کردووەتەوە. ئەوەش ئاشکرایە ئەگەر لێکۆڵینەوە بکەیت لە دەنگەکانی یەکێتی لە زۆنی زەرد لەگەڵ دەنگی حیزبەکانی تری دەرەوەی دەسەڵات دەنگەکانی یەکێتی لەو زۆنە کەمتر نەبێت زیاتر نییە، بەهەمان شێوە دەنگەکانی پارتی لە زۆنی زەرد لە دەنگی حیزبەکانی دەرەوەی دەسەڵات کەمترە. ئەمەش بۆ دوو هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە:

١. گزیی و ساختەکاری هەریەکە لە پارتی و یەکێتی لەو زۆنەی کە دەسەڵاتی بەسەریدا زاڵە.

٢. بەکارهێنانی فشاری جۆراوجۆر بۆ ناچارکردنی بەشێک لە دەنگدەران بۆئەوەی دەنگ بە لیستی دەسەڵاتی زۆنەکە بدەن.

ئەمە ئەوەمان پێدەڵێت کە زۆنەکانی سەوز و زەرد بەهۆی سەپاندنی دەسەڵاتەوە خۆیان ڕاگرتووە ئەگەرنا ئەو هەژموونەیان نییە و دەنگەکانیان ساختەیە، ئەگەرنا لە هەڵبژاردنێکی پاک و بێ گەردا ئەو هەمووە دەنگە ناهێنن.

ئەم بارودۆخە و شتی تریش سەرەڕای بێ ئومێد لەناو جەماوەر وایکردووە کە بێ

متمانەیی لەناو پارتە سیاسییەکانشدا دروست بێت و نەتوانرێت سنورێک بۆ پاوانخوازی قۆرخکاری دابنرێت. ئەمەش دوای چەندین هەوڵی جیا جیا بۆ سنوردارکردن و دروستکردنی هیوا، بەڵام شکستی هێنا. لە ئێستادا دابەشبوونێکی قوڵ لە نێوان لایەنەکاندا دروست بووە و تەنانەت کۆبوونەوەشیان لەسەر یەک مێز نابینرێت. گرفت و قەیرانی نەگەیشتن بە ڕێکەوتن لەسەر پرسە گرنگەکان و دروستکردنی ژینگەیەکی لەبار بۆ کاری سیاسی بەردەوامی هەیە بەشیوازێک خاڵە هاوبەشەکانی لایەنەکان ڕۆژ بەڕۆژ کەمتردەبێتەوە و گەلیش زیاتر بێ هیوا دەبێ. بۆیە لە بارودۆخێکی وەهادا باسی دەستاودەست کردنی دەسەلات نەک تەنها ئەگەرێکی دوورە، بەڵکو مەحاڵە. مەحاڵە لەبەرئەوەی هەموو هێزی خۆیان لە دەستگرتن بەدەسەلاتەوە دەبینینەوە و بەبێ بوونی ئەو دەسەلاتە دەچنەوە حاڵەتی سروشتی خۆیان کە بوونی هەریەکێکیانە لە سنورەکەی ئەویتریان و هێزی سەربازیشیان هەیە کە بەکاری دەهێنن بۆ مانەوە لەو دەسەلاتە وەک کاتی خۆی مەلا بەختیار گووتی: ئەگەر تەنها یەک کورسیش بهێنین جێی ناهێڵین. بۆیە ناتوانن لەم قۆناغەدا سنوری زۆنی زەرد و سەوز تێپەڕێنن و بگەنە باسی حکومەتداریی و دەوڵەتداری. لەبەرئەوە هێشتا هەرێم بەشێوەیەکی بابەتیانە لە قۆناغی پێش حکومەتیدایە و لەچاچێوەی پراکتیزەکردنێکی ناتەندروستی حزبایەتیدایە.

### تەوەری دووەم: ململانێی ئەو دیو سنور

لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ وە کاتێک کە بەغدا لاواز بوو هەرێم زۆر هەلی زێرینی لەدەستدا کە دەیتوانی سوودی ستراتیجیان لێوەربگرێت، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەو قۆناغەش بەبێ سوود لێوەرگرتن تێپەڕی. یەکێک لەو خاڵانەی کە لە هاوکێشەی نێوان هەرێم و بەغدا هەبووە ئەوەیە کاتێک بەغداد لاوازبووە هەرێم بە بەهێزی دەرکەوتووە وبەپێچەوانەشەوە، لە دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس بەغدا هێندە لاوز بوو نەیاندەتوانی هەنگاوەکانیان بەبێ کورد بنێن، بەڵام کورد عەقڵیەتی ستراتیجیی و سیاسییان هێندە لاواز بوو بە دوو دەستی بەتاڵ لێی دەرچوون لەڕووی ستراتیجییەوە و یارییەکەیان دۆڕاند. خاڵی سەرەکی ئەم دۆڕانەش وەرگرتنی پۆستی کارتۆنی کە بێباکبوون بەرامبەر ئامانجە سەرەکی و ستراتیجییەکەی کورد و لەدەستیش چوو.

تەنانەت ئەو پۆستە باڵایانەشی کە لە ماوەی ١٨ ساڵدا لە بەغدا وەریانگرت نەیانتوانی سوودی ستراتیجی لێوەرگرن، هەرێم بەردەوام گرفتی دارایی هەیە و دوو جار وەزیری دارایی لای کورد بووە، بەڵام نەیانتوانی چارەسەری کێشەی دارایی بکەن. کورد لە بواری دەرەکی و نوێنەرایەتی کێشەی هەیە و ٣ جار وەزیری دەرەوەی عێراق لای

کورد بووە کەچی نەیانتوانی کێشەکانی کورد لەڕووی دیپلۆماسی و پەیوەندییەکانەوە ببەنە قۆناغیکی باڵا. لەسەرو ئەمانەوە بەردەوام سەرۆک کۆمار هی کوردە و کوردیش بەردەوام لە قەیراندایە لەگەڵ بەغدا. ئەمانە پیمان دەڵێن کورد بێ ستراتیج و پلان بووە، بۆیە ئێستا ڕووبەرووی کۆمەڵێک کێشە دەبێتەوە کە دەبوو لە سەرەتای ٢٠٠٣ وە هەتا نووسینەوەی دەستوور چارەسەریان کردبایە.

یەکێک لەو بوارانەی کە ئێستا کورد بەدەستییەوە دەناڵێنێت کێشەی نەوت و غازە لەڕووی دەرهێنان و ناردنە دەرەوەی بۆ بازاڕەکانی جیهان. بینیمان چۆن دادگای باڵای فیدراڵی لە ٢٠٢٢/٢/١٥ ئەو بابەتەی بەنایاسای ناساند و هەرێم ڕووبەڕووی گرفتی یاسای دەبێتەوە لەو بوارەدا. ئەم بابەتە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر هەرێم دروست دەکات و ئەوە دەردەخات کە ناوەند دەتوانێت بە کۆمەڵێک ڕێوشوێنی یاسایی مەترسی دروستبکات بۆ سەر هەرێم. ئەمە دەرخەری ئەوەیە هەرێم تەنانەت نەیتوانیوە لەڕووی یاسای و دەستوری گرنتی نەبوونی مەترسی بۆ سەر قەوارەکەی دەستەبەر بکات. لەسەروو ئەمانەشەوە هێزە سیاسییەکانی دەسەڵات لە ناوەند بوون بەدوو بەشی دژ بەیەک لە پرۆسەی سیاسیدا و نەیانتوانیوە لەو دیو سنوری هەرێمەوە ناکۆکییەکانیان وەلا بنێن بۆ بەرژەوەندی کورد، بەڵکو لەسەر ئەو پۆستە بێ بەرهەمانە بۆ کورد بەتایبەتی سەرۆک کۆمار بە دوو ئەجێندا و بەدوو سیاسەتەوە لە بەغدا شەڕیانە.

کورد لە دوای ساڵی ٢٠٠٣وە سەرەڕای ناکۆکییەکانی ناوخۆ زۆر چانسی گەورەیان بە جووت حیزبی دەسەڵاتدا هەتا بتوانن یەک هەڵوێست بن لە بەرامبەر بەغدا، بەڵام دوای ١٨ ساڵ هێزە سیاسییەکان دابەشبوونێکی قوڵیان دروستکردووە و هەریەکێک لە پارتی و یەکێتی بۆ بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆک کۆمار بوون بە بەشێک لە ئەجێندای شیعەو سوونە و بەتایبەت قوڵکردنەوەی کێشەکانی ناوماڵی شیعە. سەیر لەوەدایە ئەو کوردەی کە دەبوو بەیەک دەنگی ببونایە بەهۆکاری چارەسەر ئێستا بوون بەبەشێک لە گرفت. کۆبوونەوەی ٢٠٢٢/٣/٢٦ی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق دەرخەری ئەوەبوو کە پارتی و یەکێتی هەریەکەیان سەر بە بەرەیەکی جودای بەرژەوەندیخوازن. پارتی لە بەرەی سێ قۆڵی و یەکێتیش لەبەرەی چوارچێوەی هەماهەنگی خۆی دەبینێتەوە. ئەمانەش بۆ بەرژەوەندی کورد نیە، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی حیزبی و لەناو حزبیشدا لە بەرژەوەندی تاکەکەسێک. ئەم دابەشبوونە ئەوە دەردەخات کە هەرێم لەلاوازییەکی تەواودایە و گرفتی ناوخۆی هەرێمی بردۆتە ئەو دیو سنوور و شەڕەکەشیان لە مەیدانێکی تردا گەرمە.

ئەم جۆرە لە سیاسەتیش لێکەوتەی هەرێمی لێکەوتووەتەوە و هەرێمی کردۆتە ئامانجی دەوڵەتانی بەرژەوەندیخواز. بەئامانج گرتنی هەولێر و ئاڕاستەکردنی مووشەک

جارێک بۆ سەر ئەمریکییەکان و جارێک بۆ سەر بەرژەوەندی دەوڵەتێکی تر، سەرەڕای ئەوەی هەڵگری پەیامی گرنگن بۆ هەرێم لەهەمانکاتدا نیشاندەری ئەوەشن کە هەرێم بووەتە گۆڕەپانی ململانێکانی ئەوانی تر و نەیتوانیوە لەو یاریکردنەدا جۆرێک مامەڵە بکات کە خۆی بەدوور بگرێت لە بەئامانج گرتن. کاتێک دەبیتە بەشێک لە دابەشکاری قوڵی نیومالّی شیعە بێگومان ئەوە لەلایەن ئێران و پرۆکسیەکانەوە قبوڵکراو نییە. بۆیە هەرێم بە بەردەوامی لە بەردەم مەترسی ئەو موشەکانەدایە و هیچیشی پێناکرێت، وەک ڕێگری کردن یان بەرپەرچدانەوە، بەڵکو بەبێ هیچ ئیجرائاتێک تێدەپەڕێت. ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە نەک نەتوانراوە سوود لە جیۆسیاسی هەرێم وەربگیرێت بۆ بەهێزبوونی هەرێم، بەپێچەوانەوە بووەتە کێشە و مەیدانی ئەوانی تر.

### تەوەری سێیەم: ئەگەری چارەسەر

هەرێم بە قۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوە، بۆ گۆڕینی مامەڵەکردن و هەوڵدانی گۆڕانکاری کە خۆی بینیوەتەوە لە شەڕی ناوخۆ و بەردەوامی شەڕی ڕاگەیاندن و جوڵاندنی شەقام و هاوکات ململانێی قوڵی هەڵبژاردن. هەموو ئەمانە نەک نەیانتوانی سلوکی دەسەڵات بگۆڕن، بەڵکو بوونە هۆی بەهێزبوونی زیاتری ئەمانە و کۆکردنەوەی زیاتری پارە و پول بە گەندەڵی و قۆرخکاری زیاتری دەسەڵات. ئەم قۆناغە ٣١ ساڵییە نەک نەبووە هۆی گۆڕینی دنیابینی و سیاسەت و عەقڵییەتی ئەمانە، بەپێچەوانەوە موکوڕتری کردوون لەسەر هەڵەکانیان و دەستگرتنی زیاتریان بە دەسەڵات و حساب نەکردن بۆ ڕای گشتی جەماوەر، چونکە ئەمانە هەرچییەکیان کردبێت ئیرادەی گۆڕین و باشترکردنیان لە لا گەڵاڵە نەبووە و نییە.

### بەگشتی دوو ڕێگا و شێواز هەیە بۆ ئەگەری هێنانەکایەی بارودۆخی نوێ:

### ١. لەسەرەوە بۆ خوارەوە Top-Down

لە بارودۆخی هەرێمی کوردستاندا لەسەرەوە هیچ ئومێدێک نییە بۆ هێنانەکایەی باروخێکی نوێ، کە تیایدا سەلمێنەری ئەوەبێت کە مامەڵە و سلوکی سیاسی بەرپرسەکان گۆڕانکاری دەکەن و وەرچەرخانێک دێتە کایەوە و پاشان ئەو بارودۆخە نوێیە ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر بەشەکانی خوارەوە. هەرچەندە هەوڵی جودا جودا دراوە لەلایەن هێزی سیاسییەوە لە ماوەی ڕابردوودا بۆ هێنانەکایەی شێوازێکی نوێی مامەڵە کردن، بەڵام بەداخەوە بێ ئەنجام بووە و نەتوانراوە هیوایەکی نوێ بێتەبوون.

بۆیە لەئێستادا نەک هەوڵ بەڵکو هیچ ئەگەر و تروسکاییەک نییە لەسەرەوە بارودۆخ

بگۆڕدرێت و هیچ پرۆژەیەکیش لە مەیدانەکەدا نییە بۆ ئەو مەبەستە. ئەمەش وایکردووە بێ ئومێدییەکی زۆر بڵاوببێتەوە، هاوڵاتیانیش چاوەڕوانییەکی وایان نیە لەو دەستەبژێرە سیاسییەی کە دەسەڵاتی قۆرخ کردووە و لە ئەوانیش تریش، کە بتوانرێت گۆڕانکاری لەسەرەوە بۆ خوارەوەی دەسەڵات ئەنجام بدەن.

### ٢. لە خوارەوە بۆ سەرەوە Bottom-up

ئەم جۆرە لە گۆڕانکاری گۆڕانکارییە لە کۆمەڵگە و دەستپێکردنە لە تاکەکان و جەماوەر کە دواتر ڕەنگدانەوەی هەبێت لەسەر دەستەبژێری سیاسیی و هێنانەکایەی بارودۆخێک کە خوازیاری ئەو جەماوەرەبێت کە خەباتی لەپێناودا کردووە. لە هەرێمی کوردستان نە هەڵبژاردن و نە خۆپیشاندان و مانگرتن ئەنجامێکی وای لێ نەکەوتەوە کە بتوانرێت قۆرخکارەکانی دەسەڵات بهەژێنێت و مل بۆ داخوازییەکانی هاوڵاتیان کەچ بکەن، بەڵکو زیاتر دەستیان بە دەسەڵاتەوە گرت و بەردەوامیانداوە بە گەندەڵییەکانیان و ناشەفافیان لە پرۆسەکەدا. کەواتە ئەو شێوازانەی ڕابردوو نەیانتوانیوە کاریگەری پۆزەتیڤیان هەبێت لەسەر بارودۆخەکە و نائومێدی قوڵ هاتووەتە کایەوە. ئەوەی کە لە ئاستی خوارەوە مابێتەوە و نەکرابێت بریتییە لە ڕاپەڕینی جەماوەری، کە یەکێکە لەو ئەگەرانەی کە لە حاڵەتی بەردەوامی گەندەڵی و قۆرغکاریی و بێباکی دەسەڵات بەرامبەر خواستە ڕەواکانی هاوڵاتیان هاتنەکایە و سەرهەڵدانی دەبێتە ئەمری واقیع. بۆیە باشترە بۆ دەسەڵات بەرلەوەی بگەنە بەردەم واقیعێک کە گەڕانەوەی نەبێت خۆیان وەک ئاستی یەکەم لەسەرەوە بۆ خوارە دەست بە چاکسازی و باشترکردنی بارودۆخەکە بکەن.

لەکۆتاییدا گرنگ ئەوەیە بزانن، کە پرۆژەی گۆڕانکاری و چاکسازیی و وەرچەرخان لەسەر گۆڕەپانەکە بوونی نیە و لە ئێستادا ئەوەی دەبینرێت بێ ئومێدبوونەێکی قوڵە بە دەسەڵات و دەستەبژێرە گەندەڵەکەی کە هیچ شێوازێک و ڕێگایەکی داخوازی و داواکاری جەماوەری کاریگەری نەبووە لەسەریان بۆئەوەی بەهۆش خۆیاندا بێنەوە. لە بارودۆخێکی خراپ و سەختی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی ...هتد دوای ٣١ ساڵ قورسە هیوایەکت بەم دەسەڵاتە بمێنێت لەکاتێکدا جەماوەر خۆشویستنی گەل و نیشتمان و خاکەکەی لەبەردەمیدا بەربەستە بۆ دەستبردن بۆ شێوازێک کە هەمووی تیایدا زەرەر مەند بێت، بەڵام دەسەڵات بێباکە و لەپێناو مانەوەی خۆیی و بەردەوامی دان بەگەندەڵییەکانی سڵ لە هیچ شتێک ناکاتەوە. لەدەستدانی زیاتر لە سەدا ٥١ خاکی کوردستان و پەلکێش کردنی بەعس بۆ خاکی کوردستان بەڵگەی حاشا هەڵنەگرە و نموونەیەکن لەدەیانی تر. بۆیە لە بارودۆخێکی ناسەقامگیری سیاسیی و ئابووری کە تووشی هەرێم بووە ئاڕاستەی ڕووداوەکان بەرەو ئایندەیەکی نادیار هەنگاو دەنێت.



د.ناسیح مەلا کەریم

# بەقەیرانبوونی هەرێم

**دەسپێك:**

**(بەقیرانبوونی هەرێم) لەدایکبووی ئەمڕۆ نیە و دەرەنجامی چەندین پاڵنەری مەنهەجی، پەروەردەیی و دەروونی، کەسایەتی، سەرکردەیی، سیاسی و یاسایی، دروستبووە و کۆمەڵێ دەرهاویشتە و لێکەوتەی مەترسیداری بەدوای خۆیدا هێناوە، کە کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر باری دەروونی تاکی کوردیی و کەسایەتی و ئاشتی کۆمەڵایەتی و ئاسایشی نەتەوەیی و سامانی گشتی و ئایندەی هەرێم دروستکردووە!!**

**ناساندن:**

قەیران(Crisis) یەکێکە لەو چەمکانەی زۆرترین مشتومڕی لەسەرە و مێژوویەکی دورودرێژی لەگەڵ مرۆڤایەتی هەیە. بەگەڕانەوەش بۆ فەرهەنگەکانی زمانەوانی و کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی و بواری نێودوڵەتی، ڕێمان دەکەوێ لە چەندین پێناسەی ئەم چەمکە، کە سەرجەمیان ترسناکیی و هەڕەشەکانی قەیران وێنا دەکەن، و هەڵقولاوی منداڵدانی قەیرانن وەک حاڵەتێکی نائاسایی و ناسروشتی و ناتەبا لەگەڵ حاڵەتە ئاساییەکە لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵگە و دەوڵەت.

**لەم لێکۆڵینەوەیەدا چەند پێناسەیەکی قەیران دەخەینەڕوو، لەوانە:**

- لە پسپۆڕییە کارگێڕییەکاندا قەیران بەمشێوەیە پێناسە کراوە: حاڵەتیکی ناجێگیری و پاشاگەردانییە کە ڕووبەڕووی دەزگاکان دەبێتەوە و جۆرێک لە بێسەروبەریی و نائارامی دەخولقێنی و کاریگەری ڕاستەوخۆی دەبێت لەسەر پلانەکانی دەزگاکان و دامەزراوەکان و ستراتیژیەتی مانەوەیان و پەیوەندییان بە جەماوەرەوە. ((السید سعید: ٢٠٠٦:٣١))

- لە فەرهەنگی سیاسیشدا قەیران بریتیە لە: هەڵویستێکی لەناکاو، کە هەڕەشە دەکات بە گۆڕان و گواستنەوەی ڕیشەیی لەو هەلومەرجەی ئێستا هەیە و سیاسەتمەدارانی بڕیار بەدەست ڕووبەڕووی واقیعێک دەبنەوە کە مەترسی گەورەی لەخۆگرتووە و دڵنیانین لەوەی چی ڕوودەدات ؟. (الرویلی ٢٠١١: ٤).

- لە ڕوانگەی داراییشەوە (قەیران) بریتییە لە: دارمانی سیستمی دارایی شانبەشانی شکستخواردوویی و هەرەسهێنانی زۆرێک لە دەزگا دارایی و ناداراییەکان و گرژبوونەوە و چوونەوەیەکی (انکماش) تیژ و مەترسیدار لە بواری ئابوریدا بەشێوەیەکی گشتی. (کورتل ورزیق، د ت: ١٠).

**لە سیما و دەرەنجامەکانی قەیران:**

- قەیران حاڵەتێکی شلۆقی و لەناکاو و کوتوپڕی پێشبینینەکراوە. یاخود پێشبینیکردنی چەند ساتێکی کەم پێش ڕووداوەکەیە کە ماوەی ئەوە نادات هیچ ڕێ و شوێنێکی چارەسەریی بگیرێتەبەر.
- قەیران دەبێتە هۆی هەرەسی سیستەمی کارپێکراو (دەوڵەتی، ئۆرگانی، کۆمەڵایەتی)، یان لەدەستدانی ئامانجە چاوەڕواکراوەکان.
- زیانی دارایی و مرۆیی و دەروونی بەدوای خۆیدا دەهێنێ.
- حاڵەتێکی پشێویە کە هەڕەشە لە بڕیارسازان و بڕیاربەدەستان دەکات.
- چەند ساتێکی تەنگی – یەکلاکەرەوە- چارەنوسسازە.

- پێوەرەکانی حومکڕانی ڕاست و دروست  الحكم الرشيد):
شارەزایان و پسپۆڕان، چەند پێوەرێکیان کردووەتە سەنگی مەحەک بۆ دروستی هەرجۆرە حومڕانییەک، گرنگترینیان ئەمانەن:
- ڕادەی تەموومژاویی و شەفافیەت لە مامەڵە و ڕێکەوتن و پەیوەندییە سیاسیی و ئابوورییەکاندا.
- ڕادەی پابەندبوون بە ڕێکار و پرنسیپە زانستیی و یاسایی و ئیدارییەکان لە دامەزراندن و بەڕێوەبردن و دانانی کەسی شیاو لە شوێنی شیاو.
- ڕادەی ئەکتیڤی و لێهاتوویی و پسپۆڕی – پرۆفیشناڵی- سەرکردەکان لە چالاکیی و لەو ئەرکەی لە ئەستۆیان گرتووە و لەو پۆستەی پێیان دراوە.
- ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ) ئازادی، خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان، ئاسایشی  فەردی و کۆمەڵایەتی).
- ئازادی ڕادەربڕین. - سەربەخۆیی دادگاکان
ئەوەی ئامانجی ئێمەیە لێرەدا بیخەینە بەردەست خوێنەری بەڕێز، خستنەڕوی پاڵنەرەکانی (بەقەیرانیبوون هەرێمی کوردستان)ە.
سەرەتاش دەپرسین:
- ئایا شتێک هەیە لە هەرێمی کوردستان بەناوی قەیرانەوە؟
- دەسترۆشتووانی هەرێم تا چەندە پیادەی پرنسیپەکانی حوکمڕانی ڕاست و دروست – الحكم الرشيد-یان کردووە لە سی ساڵی تەمەنی حوکمڕانی کوردی ١٩٩٢-٢٠٢٢؟
- پرۆسەی (زەلیلۆکراسی) و چەمکی (مۆبۆکراسی) تا چەندە لە ڕەفتارەکانی دەسترۆشتووانی هەرێم ڕەنگیداوەتەوە؟
- دروستتر نییە کە بڵێین (بەقیرانبوونی هەرێم) لەبری (قەیرانەکانی هەرێم)؟
- دوای ٣١ ساڵ لە سەربەخۆیی ئیداریی و (نیمچە سیاسی)، هەرێمی کوردستان بەرەو کوێ مل دەنێ؟
- فاکتەرەکانی شکستی دەسترۆشتووانی هەرێم چین؟
- ئایا دەسترۆشتووانی هەرێم چ ڕۆڵێکیان هەبووە لە هەرەسی ناسیۆنالیستی کوردیی و پەرتەوازەکردنی کۆمەڵگەی کوردی و لەباربردنی شوناس و ئینتیما؟ پێویستە ئەوەش بڵێین: ئەوەی ئەمڕۆ لە باشووری کوردستان دەگوزەرێت جێی سەرسوڕمان نیە و شتێکی چاوەڕوانکراو بووە، چونکە بەشێوەیەک لە شێوەکان سێکوچکەی کۆمەڵگەیی سەقەتە؛ چ سیستمی سیاسی، چ سیستمە پەروەردەیی و چ سیستمی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی. کەواتە، فەلسەفەی پەروەردەیی سەقەت  + سیستمی سیاسی سەقەت + سیستمی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی سەقەت = بە پشێوی، گەندەڵی، بێسەروبەری، پاوانخوازی، زاڵبوونی عەقڵیەتی سیاسی دۆگمایی، ناعەدالەتی.

## پاڵنەرەکانی بەقەیرانبوونی هەرێمی کوردستان

باگگراوندێکی مێژوویی:

ئەگەر زۆر نەچینە قوڵایی ململانێ مێژووییەکانی هەردوو باڵی دەستڕۆشتووی ئێستای هەرێم و گوزەرێکی خێرا بە لاپەڕەی پەیوەندییەکانی ئەم دوو باڵە (جەلالی و مەلایی دوێنێ) و (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) و (پارتی دیموکراتی کوردستان)ی ئەمڕۆدا بکەین، ئەوا بێ دوو دڵی دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بەقەیرانبوونی هەرێمی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، بەتایبەت پاش جیابوونەوەی (باڵی مەکتەبی سیاسی) لە پارتی لە ساڵی ١٩٦٤. ئەمە ڕاستییەکە و بڕوا ناکەم خەڵکی بەویژدانی ئەو دوو حزبە نکوڵی لێ بکەن.

پاش ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ و ئەنجامدانی یەکەمین هەڵبژاردنیش لە ١٩٩٢/٥/١٩ لە هەرێمی کوردستان، یەکێک لە دەرەنجام و دەرهاویشتە مەترسیدارەکانی ئەو هەڵبژاردنە پیادەکردنی سیاسەتی (پەنجا بە پەنجا) بوو، کە دەتوانین بێ دوودڵی بڵێین: ئەو سیاسەتە زەنگی (بەقەیرانبوونی هەرێم)ی لێداو، لەو ڕۆژەوە سەرباری چەندین دەستکەوت کە ناکرێ نکوڵییان لێ بکەین، هەرێمی کوردستان زیاتر مۆرکی بەقەیرانبوونی پێوە دیارە و پریشکی ئەو بەقەیرانبوونە سەرجەم سێکتەرەکانی کۆمەڵگەی گرتووەتەوە بێهەلاوێردن.

هاولاتیان لە باشووری کوردستان لە ساڵی ١٩٩١ توانیان ڕژێمێکی دیکتاتۆریی و خوێنمژ بڕوخێنن و لەناوی بەرن.. بەڵام لەبری گۆڕینی (سیستەمی ستەم و زوڵمکردن) تەنها دەموچاوەکان و زمانی زاڵمەکان و پۆشاکیان گۆڕیی و ستەمی نەتەوەیی زیادی کرد. دەرەنجامی ئەمەش ڕاپەڕین لەبری دەسەبەرکردنی ژیانێکی خۆش و دادپەروەریی و دوور لە ناعەدالەتی، بە بڕوای ئێمە دوو قۆناغی مەترسیداری بەدوای خۆیدا هێنا:

قۆناغی یەکەم: قۆناغی گەندەڵی و تالانی و سەرلە نوێ کۆلۆنیاکردنی کوردستان. ١٩٩١–٢٠٠٠.

قۆناغی دووەم: قۆناغی(پۆست گەندەڵی) ٢٠٠٠–٢٠٢٢ لە دەرەنجامە هەڕەشەئامێزەکانی ئەم قۆناغە:

بێهیواکردنی تاکی کوردی، تێکشاندنی کەسایەتی و سایکۆلۆژی ئەو تاکە، کەرامەت شکاندن، چینایەتی، کارکردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگەی کوردی، هەوڵدان بۆ لەناوبردنی (بەها باڵاکانی)، کوشتنی گیانی نیشتمانی، خنکاندنی شوناس، لەباربردنی ئینتیما، کارکردن بۆ پەروەردە و پێگەیاندنی نەوەیەک دژ بە خوا، دژ بە ئایین، دژ بە مزگەوت و کڵێسا و پەرستگا و دژ بە کلتوور، دژ بە زانست و زانیاری، نامۆ بە مێژووی نەتەوەیی، یاخیکراو لەخاک... هتد.

بەکورتی، ئەگەر پانۆرامای ٣١ ساڵ حوکمی ناسیۆنالیستی کوردی شەنوکەو بکەین، لەڕووی ئەرێنی و نەرێنییەوە، ئەوا زیاتر لە چەند لێکۆڵینەوەیەکمان پێویست دەبێت.

بە بڕوای ئێمە، سەرجەم پاڵنەرەکانی بەقەیرانبوونی هەرێمی کوردستان لە یەک خاڵی جەوهەرییەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەویش ڕەتکردنەوەی شەریعەت و نەبوونی قەدەغەکاری ـ وازع ـی ئایینیە لەلایەن دەسترۆشتووانی هەرێمەوە. ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە تیشک بخەینە سەر گرنگترین پاڵنەرەکانی بەقەیرانبوونی هەرێم و ئەو پاڵنەرانە بۆ چەند گرووپێک دابەش بکەین:

**گرووپی یەکەم – پاڵنەرە سیاسییەکان:**

پاڵنەرە سیاسییەکان دادەنرێن بە لوتکەی هەرەمی قەیرانەکان؛ چونکە مانای ئەم پاڵنەرانە واتە: گۆڕینی ڕێڕەو و نەخشەڕێگای سیاسەتکردن و دەوڵەتداری لەو ئامانجەی کە خەبات و سیاسەتی لەپێناودا کراوە، بۆ ئامانجگەلێ جیاواز لەو ئامانجانە، کە هەندێ جاریش پێچەوانەی خواستی نیشتیمانی و بەرژەوەندی باڵای خەڵک و خاکن. مەترسییەکانی ئەم گرووپە پاڵنەرانە (پاڵنەرە سیاسییەکانی بەقەیرانبوونی هەرێمی کوردستان) لەوەدایە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە هەرەمی دەسەڵاتەوە هەیە.

**لە گرنگترین پاڵنەرە سیاسییەکانیش:**

– باڵادەستی سیستمی (مۆبۆکراسی): مۆبۆکراسی بەوجۆرە وڵاتانە دەوترێت کەسانی ناشارەزا و نەزان و بێ توانا وڵات بەڕێوەدەبەن. یاخود ئەم دۆخە کاتێک دێتە پێش بەهۆی بوونی گێژاوی سیاسیی و یاسایی لەم وڵاتەدا. لێرەدا پایەکانی دەوڵەت بەرەو لەناوچوون دەچن. لێرەوە خەڵک تووشی دۆخێکی ناهەموار و دژوار دەبن، ئەم دۆخە کاتێک دروست دەبێت وڵات بە دروشم دیموکراسی و بە کردار وڵاتێکی دیکتاتۆرییە و خەڵک هەست بەبوونی نادادی کۆمەڵایەتی و نایەکسانی دەکەن لە ئەرک و ماف دا. (فەرهەنگی جیهانی سێیەم October ٦, ٢٠١٦ ٠)

– تاکڕەوی لە دەسەڵاتدا و وەلانانی ڕاوێژکاریی و بەشداری پێنەکردنی هاوڵاتیانی هەرێم لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت یان لانیکەم لە مەسەلە چارەنوسسازەکاندا.

– نەبوونی سیستمێکی هەڵبژاردنی ئازاد و دوور لە فشار و هەژموونی حزبی و کڕینی ویژدان.

– نائارامی و بەشبەشێنەی سیاسی؛ لە ڕواڵەتەکانی ئەم جۆرە نائارامییەش: نەبوونی یاسا و ڕێسا و پێوەرە کارپێکراوەکانی پەیوەست بە دەوڵەتداری، باڵادەستی ڕەفتاری لادەرانە، جەنگی نێوان لایەنە ناکۆکەکان، دووبەرەکی و دەستێوەردانی دەرەکی، (یارییە سیاسییە چەواشەکارییەکان)... هتد.

– سستی و لاوازی ئەدای دەزگاكان: ئەمەش پاش ئەوە دێت وەک لەماوەی ئەم چەند ساڵە بینیمان، دامودەزگاكان لە لوتكەی هەرەمی جێبەجێكردنەوە تا شۆڕ دەبێتەوە بۆ نزمترین ئاستی دەسەڵات، پڕكراونەتەوە لە خەڵكانی ناشایستە و نەشارەزا و بێئاگا لە پرنسیپەكانی بەڕێوەبردن و ئەخلاقیاتی ئۆرگانی و دامودەزگایی. نكۆڵیش لەوە ناكرێ كە ئەم دەزگایانە هەزاران كەسی شایستە و كارامە و لێهاتوو لەخۆدەگرن، بەڵام یان گۆشەگیركراون یان ڕێنادرێ وەک پێویست كارامەیی و لێهاتووی خۆیان بخەنەگەڕ.

– لەدایكبوونی ناسروشتی حكومەت: ڕاستە دامەزاندنی یەكەمین كابینەی حكومەتی هەرێم لە ساڵی ١٩٩٢ ئەزموونێكی نوێ بوو لە مێژووی كورددا، بەڵام دەبێت ئەو ڕاستییەش قەبوڵ بكەین كە ئەم لەدایكبوونە هەم لەڕووی (كات) و هەم لەڕووی (شوێن)ەوە ناسروشتی بوو، چونكە زۆرینەی هەرەزۆری ئەوانەی بڕیار بەدەستبوون لەوماوەیەدا – كاتی نووسینی ئەم چەند دێڕەشی لەگەڵ بێت – خەڵكانێكی هەڵقوڵاو و پەروەردەكراوی دەوڵەتداری نەبوون، بەڵكو دەستنیشانكراو(تعیین) بوون و لە سیناریۆییەكی دوای ڕێكەوتنە سیاسییەكان كراونەتە كاربەدەست و فەرمانڕەوای هەرێم، بێ گوێدانە شایستەبوون و ناشایستە بوون. كە ئەمەیان (واتە لەدایكبوونی ناسروشتی حكومەت) گرێكوێرەی گرێكانە و قەیرانی قەیرانەكانی حكومەتی باشووری كوردستانە!!

– نەبوونی شەفافیەت و لێپێچینەوە و لێپرسینەوە: ئەمەش پاش ئەوە دێت كە زۆربەی دەسەڵاتەكان لە دەستی چەند كەسێكدا كۆكراوەتەوە و دەیان دۆسییەی گرنگ و خزمەتگوزار و دەوڵەتی – نیشتمانی- (دۆسیەكانی نەوت و غاز و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكان وەک نموونە) چەند كەسێكی دەستڕۆشتوو نەبێ، كەس لێی ئاگادار نییە – بە زۆرینەی وەزیرەكانیشەوە –.

– لاوازی وشیاری سیاسی: ئەم پاڵنەرەش دادەنرێت بە پاڵنەرێكی گرنگ لە سەرهەڵدانی قەیرانەكان و لەبارچوونی پرۆسەكانی گەشەپێدان. هەروەها ناوشیاریی و بێ ئاگایی هاوڵاتی لە مافە سیاسییەكانی و نەبوونی زانست و زانیاری پێویست و پەیوەست بە میكانیزمەكانی مومارەسەی دەسەڵات، ڕێخۆشكەرن بۆ سەرهەڵدانی قەیرانەكان، لەسەروو هەموویانەوە، قەیرانە سیاسییەكان و قەیرانە ئابوورییەكان.

بەكورتی، زیادەڕۆیی نییە گەر بڵێین: كرۆكی بەقەیرانبوونی هەرێم لە )سیستمی حومكڕانی)دا خۆی دەبینێتەوە، بۆیە پێش قسەكردن لەسەر هەر پاڵنەرێک لە پاڵنەرەكانی بەقەیرانبوونی هەرێم ئەبێت ئەو ڕاستییە بزانین كە لە ڕۆژی پێكهێنانی یەكەمین كابینەی حكومەتی هەرێم لە ساڵی١٩٩٢وە سیستمی حوكمڕانی ئیفلیجە و لەسەر بنەمای (هێز+ دەستەگەرایی+ بەرژەوەندی حزبی) پێكهێنراوە، ئیتر لەو ساتەوە حكومەتی هەرێمی

کوردستان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە پاشەکشەدایە و کابینە یەک لە دوای یەکەکانیش هێندەی سیمای (حیزبیبوون)و (بەشبەشێنەیی سیاسی یان پێوە دیار بووە، هێندە نەتەوەیی و نیشتمانی نەبوون، دامودەزگاکانی حکومەت هێندەی بنەماڵەیی و حیزبی بووە و پەرۆشی پاراستنی ئاسایشی حیزب بووە، هێندە دەزگاگەلێکی خۆماڵی و زانستی و ئیداری نەبووە و لە خەمی هاوڵاتیانی خۆی نەبووە.

پەیوەندییەکی بتەو هەیە لە نێوان سیستمی سیاسی و سیستمی کارگێری (حوکمڕانی). چونکە حکومەت لە هەر شوێنێکی ئەم دونیایە بێت دوو ئەرکی بنەڕەتی زۆر گرنگی لە ئەستۆدایە: یەکەم، سیاسەت، واتە پلاندانان و پرۆژەسازیی و بەرنامەی سیاسی و سیاسەتی گشتیی. دووەم، بەڕێوەبردن، واتە جێبەجێکردنی ئەو پلان و پرۆژانەو بەگەڕخستنی سیستمی سیاسی و پراکتیزەکردنی پرۆژە پێشنیازکراو و بڕیار لەسەر دراوەکان.

**گرووپی دووەم - پاڵنەرە ئابورییەکان: لە گرنگترینی ئەم پاڵنەرانەش:**

- قەیرانە ئابوورییەکان. بەتایبەت وەک دەبینین زۆرێک - ئەگەر نەڵێین هەموویان - لەو قەیرانانە دروستکراون، بەئامانج پلانیان بۆ دادەنرێت.

- کەمی کرێ و مووچە لە کەرتی حکومی بە بەراورد لەگەڵ کەرتی تایبەت.

- قۆرخکردنی ناوەندی بڕیارە ئابورییەکان لەلایەن کەمینەیەکی دەسەڵاتەوە. کە هەندێ جار ئەو کەمینەیە ژمارەیان لە پەنجەکانی یەک دەست تێپەڕ ناکات.

- ئەنجامدانی پرۆژەی هاوبەشی بەرهەمهێنان لەگەڵ کۆمپانیا بیانییە زەبەلاحەکان و هەڵاویردنی ئەو کۆمپانیانە لە یاسای باج و لێپێچینەوە.

**- گرووپی سێیەم - پاڵنەرە کارگێڕی و یاساییەکان، لەوانەش:**

- سەربەخۆنەبوونی دادگاکان.
- فرەیی دەزگا یاسایی و ئیدارییەکان.
- نەبوونی هۆشیاریی بەڕێوەبردن.
- هەتاهەتایی پۆست و پلە وەزیفییەکان.
- پشتبەستن بە کەسانی ناشایستە.
- لێنەپرسینەوە و سزانەدانی سەرپێچیکاران.

ماوەتەوە بڵێین:

زاڵبوون بەسەر پاڵنەرەکانی (بەقەیرانبوونی هەرێم)دا و دەربازبوون لەم گێژاوەی دروستکراوە، بەڕای ئێمە لە یەک خاڵی وەرچەرخانەوە دەستپێدەکات، ئەویش چارەسەری (قەیرانی سەرکردە)یە و کلیلی چارەسەرکان - پاش فەزڵی خوای گەورە و گەڕانەوە بۆ ڕێبازی ئەو زاتە- لێرەوە دەبێت.

## سەرچاوەکان

- جابر: عبد الرؤف، دراسات قانونية مقارنة في قوانين هيئات الرقابة العليا - منشورات الحلبي الحقوقية - بيروت، ط ١، ٢٠٠٤ /٢١٢.

- جون: سليفان الكسندر شكولنكوف، مكافحة الفساد، منظورات وحلول القطاع الخاص / ١٩.

- رزيق: كمال و فريد كورتل، الازمة المالية، مجلة كلية بغداد للعلوم الاقتصادية الجامعة – العدد ٢٠أ. ص ٨.

- روز أكرمان: سوزان، الفساد والحكم، ترجمة: فؤاد سروجى، الأهلية للنشر والتوزيع. عمان - ط العربية الأولى، ٢٠٠٣. /٦٠.

- الرويلي: علي بن هلهول، الأزمات تعريفها – أبعادها – أسبابها د. جامعة نايف العربية للعلوم الأمنية-

الرياض١٤٣٢ ./ ، ص٤.

- سعيد: السيد، استراتيجيات إدارة الأزمات والكوارث. دار العلوم للنشر القاهرة ط١، ٢٠٠٦ ص٣١.

- شتا: السيد علي، الفساد الإداري و مجتمع المستقبل، المكتبة المصرية، القاهرة/ ٢٠٠٣، ص ٢٧.

- عبدالله: سرور محمد،الفساد و أداء النظام السياسي - رسالة ماجستير – غير منشورة،جامعة النهرين، كلية العلوم السياسية،بغداد، ٢٠٠٧،/ ٢٩.

- عبيد: نهاد عبدالحليم، الوقاية من الجريمة في ضوء السنة النبوية،مجلة الأحمدية - العدد الثالث عشر -محرم ١٤٢٤ هـ - مارس ٢٠٠٣م، دبي / ٦٦.

- محمود: صلاح الدين فهمي، الفساد الإداري كمعوق لعمليت التنمية الأجتماعية و الأقتصادية /١٤٥- ١٤٧.



د.محەمەد عەلی باپیر

# گوزەر بەرەو دیموکراسی و رۆڵی پارتی سیاسی

دیموکراسی وەک سیستەمێکی سیاسی، بریتییە لە سیستەمێک کە تێیدا هەموو هاوڵاتیان بواریان هەیە کە بەشداربن لە دروستکردنی بڕیاردا و ماف و ئازادادییەکانیان پارێزراوبن (هوگینز ٢٠٠٥: ل ١٦٧). لە بنەمادا دیموکراسی واتە یەکسانی لە هەلی بەشداریکردن لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاردا؛ یەک کەس و یەک دەنگ. ڕێکاری ئەم بەشداریکردنەش بۆ کۆی دانیشتوان (ئەوانەی کە لەڕووی یاساییەوە مافی دەنگدانیان هەیە) بریتییە لە نوێنەرایەتی کردن. کەواتە، دیموکراسی سیاسی سەردەم، سیستەمێکی فەرمانڕواییکردنە کە تێیدا کاربەدەستان لە ئەدای کاریاندا دەخرێنە بەر لێ پرسینەوەی پەیکەرە کۆمەڵایەتییەکان، لە ڕێگەی ئەوانەی کە هەڵیان بژاردوون و نوێنەرایەتیان دەکەن (شمیتەر و کارڵ ١٩٩٦؛ ل ٥٠).

ماکس ویبەری کۆمەڵناس، سەبارەت بە سپاردنی دەسەڵات بۆچوونی وایە کاتێک کەسێک دەسەڵاتی بڕیاردانی پێ سپێردرابێ، دەبێ ئازادی پێویستیش هەبێ و بواری بدرێ لە جیاتی ئەوانەی هەڵیانبژاردووە بەشێوەیەکەی بەرپرسانە مامەڵەبکات (پاری ١٩٦٩؛ ل ١٤٥). جۆزێف شەمپەتەر دیموکراسی وەک میتۆدێک پێناسە دەکات، وەک ڕێکارێک بۆ بەرهەمهێنانی دەسەڵاتێکی متمانەپێکراو، ئەوەی کە ئەو ناوی ناوە فەرمانڕەوایی سیاسییەکان (شەمپیتەر ١٩٤٢؛ ل ٢٦٩). شەمپتەر پێناسی میتۆدی دیموکراسی دەکا وەک؛ ڕێکخستنی دامەزراوەکان بۆ گەیشتن بە بڕیاری سیاسی، کە تێیدا کەسەکان لە ڕێگەی کێبڕکێ کردنیانەوە بۆ دەنگی خەڵک دەسەڵاتی بڕیاردان وەردەگرن (شەمپتەر ١٩٥٦؛ ل ٢٥). ئەم جۆرە لە ماناکردنی دیموکراسی دوو بنەمای هەیە، یەکەم، ڕێکخستنی کۆمەڵێک دامەزراوە کە بڕیاری سیاسی دروستبکەن؛ دووەم، هەبوونی دەستەبژێرێکی سیاسی کە ئەزموونی دەسەڵات بکەن. هەر لەوبارەوە ڕۆبێرت داڵ، دەڵێ، دەستەبژێری سیاسی کۆمەڵێک کەرەستەیان لەبەردەستن کە دەتوانن وا لە دامەزراوە سیاسییەکان بکەن کارابن؛ بەواتایەکی دی، دەستەبژێری سیاسی ڕۆڵیان هەیە لە ئاڕاستەکردنی ڕووداوە سیاسییەکان (داڵ ١٩٧١؛ ل ١٢٨). من لەم پوختە-توژینەوەیەدا مەبەستم لە دامەزراوە، پارتی سیاسییە و مەبەستیشم لە دەستەبژێری سیاسی، ئەندامانی پارتی سیاسین.

قۆناغی ڕاگوزەر و گوزەر بەرەو دیموکراسی؛ مەبەست لێی گۆڕانی سیستەمی نادیموراتیکە بۆ سیستەمی دیموکراتیک، پرۆسەکە پێی دەگوترێ بەدیموکراسیبوون. لە باسی قۆناغی ڕاگوزەردا سێ خاڵ دەبێ ئاماژەیان بۆ بکرێ؛ کات، شوێن، جۆر. یەکەم، کات، هانتینگتۆن ئاماژەی بەسێ شەپۆلی بەدیموکراسییبون کردووە، یەکەم شەپۆل لە ساڵانی ١٨٢٠ بوو تا ١٩٢٠؛ دووەم شەپۆل ساڵانی ١٩٤٠ بۆ ١٩٥٠ و شەپۆلی سێیەمیش لە ساڵانی هەفتاکان تا نەوەدەکانی سەدەدی ڕابردووەوە دەستیپێکردووە و تا ئێستاش بەردەوامە (هاتینگتۆن ١٩٩٦؛ ل ٣). شەپۆلی بەدیموکراسیبوون بەو واتایەی کە لەسەر ئاستی جیهان کۆمەڵێک وڵات سیستەمە سیاسیەکانیان دەبن بە سیستەمی دیموکراتیک. کەواتە ئەم نووسینە کورتەباسێک لەمەڕ ڕۆلی پارتی سیاسی لە شەپۆلی سێیەمی بەدیموکراسییبوندا. دووەم، شوێن، ئەو شوێنەی کە سێیەم شەپۆلی پرۆسەی بە دیموکراسیبوون تێدا ڕوودەدا، ئەو وڵاتانەن کە لە پرۆسەی پێشکەوتندان، (وڵاتانی جیهانی سێیەم). سێیەم، جۆر، ئەو فۆرمەی دیموکراسی کە باسی لێوە دەکەم، دیموکراسیی لیبڕاڵە؛ فرانسیس فۆکۆیاما یەکێک لە بانگەشەکارانی دیموکراسی لیبراڵ بۆچوونی وایە کە ئەم فۆرمەی دیموکراسی دوا خاڵی پەرەسەندنی ئایدیۆلۆژیی مرۆڤی

سەردەمە و دواهەمین فۆرمی پەیکەرەی دەسەڵاتی مرۆڤە (فوکویاما ١٩٨٩؛ ل ٣).

قۆناغی ڕاگوزەر ئەو ماوەیەیە کە تێیدا سیستەمێکی سیاسی هەم بنەمای دیموکراسی و هەم بنەمای نادیموکراسی هەن. ئەندریێس شێدلەر بەو سیستەمانە دەڵێ سیستەمی هەڵبژاردنە-دیموکراسی، سیستەمێک کە دەتوانێ هەڵبژاردن ئەنجام بدا و تێیدا پارتەکان کێبڕکێ بکەن، بەڵام ناتوانێ ماف و ئازادییە سیاسیەکان بچەسپێنێ (شێدلەر ٢٠٠١؛ ل ١٥١). بۆ تێپەڕاندنی قۆناغی ڕاگوزەر سیستەمی سیاسی پێویستە، لەگەڵ سەقامگیری سیاسیی و ئابووری، ماف و ئازادییەکانیش لە فۆرمی سیاسیاندا دەستەبەربکات. لەوبارەوە فۆکۆیاما لەوباوەڕەدایە کە قۆناغی ڕاگوزەر هەستیارترین قۆناغە، چونکە لەوماوەیەدا سەقامگیری ئابووری بە سانایی دەستەبەر نابێ و دامەزراوە دیموکراسییەکان بەئاسانی دروست ناکرێن (فۆکۆیاما ٢٠٠١؛ ل ٢٧).

بەهەمان شێوە، شمیتەر باسی چەند گرفتێکی قۆناغی ڕاگوزەر دەکات وەک گرفتە دەرەکییەکانی دیموکراسی سەردەم. گرفتە دەرەکییەکان ئاماژەن بۆ گونجان یا نەگونجانی بنەماکانی دیموکراسی لەگەڵ پەیکەرە کۆمەڵاتیی و کلتووریی و ئابوورییەکانی ئەو وڵاتەی کە لە گوزەردایە بەرەوە ئاواکردنی سیستەمێکی دیموکراسی. وەک تیشک خستنە سەر بەربەستە دەرەکییەکانی دیموکراسی، ئەو پێیوایە کە تەنانەت باشترین نمونەی دیموکراسی ڕۆژئاواش ناتوانرێ بەتەواوی بگوازرێتەوە بۆ وڵاتێکی دی (شمیتەر ١٩٩٦؛ ل ٨٣). بە بۆچوونی من بەربەستە دەرەکییەکانی دیموکراسی لە خودی فۆرمی دیموکراسی لیبراڵەوە سەرچاوە دەگرن. دیموکراسی لیبراڵ بوونناسی و جیهانبینی تایبەت بە خۆی هەن، کۆدی مۆراڵی، بنەمای سیاسیی و ئابووری هەن کە دەکرێ یەکانگیر نەبن لەگەڵ بوونناسی و جیهانبینی و نۆرم و ئەزموونەکانی کۆمەڵگە و وڵاتێکی دی – ئەو وڵاتەی کە لە گوزەردایە بەرەوە ئاواکردنی دیموکراسی. بەواتایەکی دی، پرۆسەی دیموکراسی، واتە بنیاتنانی پەیکەرەی دەسەڵاتی نوێ، ئابوورییەکی نوێ (بازاڕی ئازاد) کۆمەڵێک بەها و پرەنسیپی نوێ بەشێوەیەک ببنە جێگرەوەی ئەوانەی کە لەو کۆمەڵگەیەدا چەسپاون.

بەدەر لە بەربەستە دەرەکییەکان چەند ئاستەنگێکی خودیش هەن (واتە خودی پرینسیپە دیموکراتیکەکان) کە دەببە ڕێگر لەبەردەم گوزەر بەرەو دیموکراسی. لەوبارەوە، لاری دایمۆند ئاماژە بەچەند دژیەکییەک دەکات وەک بەربەستێک بۆ پرۆسەی بەدیموکراسیکردن. لەوانە، یەکەم، دژیەکی نێوان کێشە و کۆدەنگی (دایمۆند ١٩٩٦؛ ل١١٩)، ئەمەش کاتێک دێتەئاراوە کە هانی خەڵک بدرێ کێشەکانیان لە ڕێگەی گەیشتن بە کۆدەنگییەک چارەسەر بکەن، ئەمە زۆرجار گرفتە، چونکە ئەوانەی کە

بۆچوونەکانیان پێچەوانەیە چارەسەریشیان بۆ کێشەکان جیاوازە. دووەم، دژیەکی نوێنەرایەتیکردن و فەرمانڕەواییکردن (١٩٩٦؛ ل ١١٦) ئەمەش لە ئەزمونی دیموکراسیدا خۆی بەرجەستە دەکات، چونکە لە نوێنەرایەتی کردندا خەڵک ئامادەییەکی ئەوتۆیان نیە؛ نوێنەرەکان لە جیاتی خەڵک بڕیار دەدەن، ئەوەی کە بڕیار دەدا و کاریگەری لەسەر بڕیاری سیاسی دروست دەکات، خەڵک نیە بەڵکو نوێنەرەکانیانن – ئەمە ڕوونتر دەبێتەوە کاتێک باسی ڕۆڵی پارتی سیاسی دەکەم، بە ئامادەیی پارتی سیاسی، خەڵک هەنگاوێکی دیش لە دروستکردنی بڕیار دوور دەکەونەوە، چونکە ئەوانەی بڕیار دروست دەکەن نوێنەری پارتێکی سیاسی دەکەن نەک دەنگی خەڵک. بە بۆچوونی من، یەکێکی دی لە دژیەکییەکان، ئەوەیەکە لیبراڵیزم وەک ئایدیۆلۆژیا جەخت دەکاتەوە لە سەروەری تاکەکەس و ئازادییەکانی، لەکاتێکدا دیموکراسی وەک ئایدیا سەروکاری زیاتر لەگەڵ یەکسانی و ڕەخساندنی هەلی یەکسانە. لە دیموکراسی لیبراڵدا، ئایدیولۆژیا شکڵ دەداتە ئایدیا و زاڵە، و بەرهەمەکەی دەرەنجامێکی نایەکسانە، ئەم نایەکسانییە سەرەتا لە ڕەهەندی ئابووریدا خۆی بەرجەستە دەکات، بەڵام دواتر ڕەهەندی سیاسیش دەگرێتەوە بەتایبەت کاتێک کە دامەزراوە فەرمییەکان کارا نەبن. ناکارایی دامەزراوە فەرمییەکان یەکێکە لە جیاکەرەوەکانی قۆناغی ڕاگوزەر، کەواتە لەکاتی نەبووی دامەزراوەی کارا نەک تەنها لەڕووی ئابوورییەوە، بەڵکو لەڕووی سیاسیشەوە، بانگەشەی ڕەخساندنی هەلی یەکسان سەری لە چەسپاندنی ژیانێکی نایەکسانەوە دەردەچێ.

دەیڤید سپیتز ڕەخنەیەکی بنەڕەتی هەیە گوزەر بەرەو دیموکراسی، ڕەخنەکەی دوو ڕەهەندە، ئەو دەڵێ، ویست بۆ بنیاتنانی دیموکراسی زۆرجار لاواز دەبێ لەبەر ناڕەزایی لە دەرەنجامەکانی دیموکراسی، هەروەها بۆچوونی وایە کە دیموکراسی بیرۆکەیەکی ئاستەمە، چونکە ئەو تیۆرییەی کە دەڵێ هاوڵاتیان، وەک کەسانی سیاسی یەکسان، دەتوانن پێکەوە ئاراستەی دروستکردنی بڕیار بکەن و ئەزمونی دەسەڵات بکەن، لە قۆناغی ڕاگوزەردا ڕاست نیە (سپیتز ١٩٤٩؛ ل ١١٤). واتە، کاتێک هاوڵاتیان بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە ناتوانن لەڕێی دەنگدانەوە دەسەڵات لەوانە وەربگرنەوە کە ئەدایەکی باشیان نەبووە، لە بەشداری سیاسیان نائومێد دەبن – چونکە، بەشداری سیاسی بۆ ئەزمونکردنی دەسەڵاتە، کە زانیان دەسەڵاتیان کەمە بەو ئەندازەیە بەشداریان لاواز دەبێ. ئەمەش بنەڕەتیترین بەربەستە بۆ پرۆسەی گوزەر بەرەو دیموکراسی، چونکە بەبێ بەشداری خەڵک و زۆرینە، کەمینەیەک بڕیار دەدا و ئەزموونی دەسەڵات دەکا، ئەمەش پێچەوانە دەگوڕێ لەگەڵ دیموکراسی.

## ڕۆڵی پارتی سیاسی لە پرۆسەی بەدیموکراسیکردندا

بۆئەوەی دیموکراسی لە قۆناغی ڕاگوزەردا خۆی بگرێ، خەڵک دەبێ بەشداری هەبێ و ئەو بەشدارییەشیان دەبێ ڕێکبخرێت (لاپالۆمبار ١٩٦٦؛ ل ٣). بۆ ئەم مەبەستەش پارتە سیاسییەکان گرنگترین دامەزراوەی هاندانی سیاسی و بەشداری پێکردنی خەڵکن. بەبێ بەشداریی سیاسی دیموکراسی ئەستەمە. پارتی سیاسی ڕۆڵێکی ناوەندی هەیە لە چەسپاندنی بەشداری سیاسی، بە ئەندازەیەک کە نوێنەرایەتی کردن وەک کاری سەرەکی پارتە سیاسییەکان دەبینرێ، تا ئاستێک کە هەندێک لە توێژەران بڕوایان وایە کە کۆمەڵگە ئاڵۆزەکانی سەردەم بەڕێوەنابرێن بەبێ ئامادەیی پارتە سیاسییەکان (هاتینگتۆن ١٩٦٨؛ هەیوود ٢٠٠٥؛ ل ٢٧٩). لە قۆناغی ڕاگوزەردا پارتە سیاسییەکان دەتوانن دوو بنەمای دیموکراسی بچەسپێنن؛ بەشداریکردن و نوێنەرایەتیکردن. هانتینگتۆن لەو باوەڕەدایە کە سەقامگیری سیستەمی سیاسی پەیوەستە بە بەهێزی پارتە سیاسییەکانەوە، و پارتێکی سیاسی بەهێزە بەو ئەندازەیەی کە دەتوانێ بەشداری جەماوەر بە دامەزراوە بکات – هانی بەشداری سیاسی بدات (هاتینگتۆن ١٩٦٨؛ ل ٤٠٨). ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە سەرکەوتوویی قۆناغی گوزەر بەرەو دیموکراسی بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەستە بە ئامادەیی پارتی بەدامەزراوەکراو و سیستەمی پارتی سیاسی (سمیت ٢٠٠٩؛ ل ١٢١).

پارتە سیاسییەکان نیشانەی جیاکەرەوەی حکومەتەکانی سەردەمن، بەوتەی ڕۆسکین پارتە سیاسییەکان دیموکراسیان دروستکردووە و، ئەستەمە دیموکراسی سەردەم بپارێزرێ بەبێ بوونی پارتە سیاسییەکان (رۆسکین ٢٠٠٦؛ ل ١٩٣). لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا، پارتە سیاسییەکان کۆمەڵێک ڕۆڵیان هەیە، لەوانە، دەستەبەرکردنی ڕەوایەتی، دروستکردنی پشتیوانی جەماوەری، پێشکەشکردنی پرۆژە، هاندانی خەڵک بۆ بەشداری سیاسی و ئابووری، هاندانی گفتگۆی سیاسی و، ڕۆڵی خاوەنداریێتی کردن (کۆماک و پوول ٢٠٠٢؛ ل ٩٨-١٠٢). واتە، پارتی سیاسی بەتایبەت پارتی دەسەڵات خۆی لە کۆی پرۆسە و ئەزموونی سیاسی بەخاوەن دەکا – لە کۆتایی ئەم نوسینەدا ئاماژەیەکی بۆ دەکەم.

لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە لە پرۆسەی ڕاگوزەردان، پارتەکان پارتی جەماوەرین و ئامانجیان بردنەوەی هەڵبژاردنە، و سەرکەوتنیان پەیوەستە بەوەوە کە تاچەند دەتوانن خەڵک هانبدەن بەشداری سیاسییان هەبێ و ببنە ئەندام و لایەنگری پارتەکەیان (گەنتەر و دیامنۆد ٢٠٠٦؛ ل ٣٢٣). لەم قۆناغی ڕاگوزەردا، پارت دەیەوێ زۆرینەی ڕەهەندەکانی ژیان بگرێتەوە، هەربۆیەش کۆی ئاڕاستەی گوزەر بەرەو دیموکراسی پەیوەستە بە ئەدای پارتەوە – کە ئایا بەرەو دیموکراسی کۆمەڵگە ئاڕاستە دەکا یا بەرەو سیستەمێکی نادیموکراسی. لە پرۆسەی بە دیموکراسیکردندا، پارت ڕۆڵێکی ناوەندی

هەیە لە دروستکردنی هەماهەنگی لە نێوان کاربەدەستان لەلایەک و لە نێوان هاوڵاتیان و ویستە سیاسییەکانیان و نێوان هاوڵاتیان و کاربەدەستانیان لەلایەکی دییەوە (کاتز ٢٠٠٨؛ ل ٣٠١). هەربۆیە، ئەوە دروستە کە دەگوترێ پارتەکان ڕۆڵێکی ناوەندیان هەیە لەوەدا کە دەتوانن ببن بە هاوکار لە پرۆسەی بە دیموکراسیکردندا، بەڵام ئەم ڕاستییە ئەوەش دەچەسپێنێ کە پارتەکان دەگونجێ ڕۆڵێکی ناوەندیان هەبێ لە بوون بە بەربەست لە بەردەم پرۆسەی بەدیموکراسیکردندا- واتە پارت دەتوانێ ببێتە ئاستەنگێکی سەرەکی لەبەردەم گوزەر بەرەو دیموکراسی.

**لیبراڵیزم وەک ئایدیۆلۆژیا جەخت دەکاتەوە لە سەروەری تاکەکەس و ئازادییەکانی، لەکاتێکدا دیموکراسی وەک ئایدیا سەروکاری زیاتر لەگەڵ یەکسانی و ڕەخساندنی هەلی یەکسانە.**

پارت ڕۆڵێکی دوو ڕەهەندی هەیە؛ پەیوەست بەخەڵکەوە، پەیوەست بەدەسەڵاتەوە. یەکەم، پەیوەندی نێوان پارت و خەڵک، لە قۆناغی ڕاگوزەردا لە شێوەی ئەرباب و موشتەری دایە، هەموو ئەو پارتانەی کە لە هەڵبژاردنەکاندا براوەن، فێردەبن کە دروێنەی لایەنگرەکانیان بکەن (کاپێچ ٢٠٠١؛ ل ١٧٦). پارت لە بەرانبەر بەشداری سیاسی و دەنگ، وەک ئەربابێک کۆمەڵێک پێویستی بۆ هاوڵاتی دەنگدەر دەستەبەر دەکا، لە پۆست و پلە و پارە یا ڕەخساندنی هەلی کار و پێدانی مووچە. ئەم جۆرە لە پەیوەندی بێ مەرجە و درێژخایەنە، نافەرمییە و هیچ تێگەیشتنێکی یاسایی بنەمای نیە، ئەو پەیوەندییە بەرمەبنای نایەکسانییەکی گەورەیە لە جیاوازی هێزدا (ئیَسێنستاد و ڕۆنیگەر ١٩٨١؛ ل ٢٧٦). واتە هەمیشە دەنگدەر ئاتاجی پارتە؛ بەو مانایەی، هاوڵاتی ناتوانێ لێپێچینەوە لە پارت بکات، بەپێچەوانەوە ئەوە پارتە کە دەتوانێ سزای هاوڵاتی بدا بە لێسەندنەوەی پلەو پۆست یا لێبڕینی مووچە. لەم جۆرە لە پەیوەندییەدا سەرکەوتن سەرکەوتن ڕادەکێشێ، ئەو بەرپرسانەی کە پۆستێک وەردەگرن، دەسەڵاتی خۆیان بەکاردەهێنن بۆئەوەی بنکەی جەماوەریی خۆیان گەورەتربکەن، خەڵکی دیکەش بێننە ژێر هەژموونی خۆیانەوە (سمیت ٢٠٠٩؛ ل ١٢٨). ئەم جۆرە پەیوەندییە دەبێتە بەربەست لەبەردەم پرۆسەی بەدامەزراوەکردندا، کە ئەمەش پێشمەرجەیە بۆ چەسپاندنی دیموکراسی. ئەمە دەبێتە بەربەست بۆ قۆناغی ڕاگوزەر، چونکە ئەگەری ئەوە

هەیە کە پەیوەندییەکە ببێتە پەیوەندییەکی درێژخایەن و هەمیشەیی و ببێتە پەیکەرەیەک کە جێگرەوەی سیستەمێکی دیموکراتیک بێ.

دووەم، هەژموونی پارت بۆ دەسەڵات، ئەمەش لەوانەیە ببێتە ئاستەنگ بۆ پرۆسەی بەدیموکراسیکردن. چونکە کاتێک کە پارتەکان مۆنۆپۆلی دەسەڵات دەکەن بە ئاسانی ناتوانن وا لە سەرکردایەتی و ئەندامانی باڵایان بکەن کە لەبەرانبەر داخوازییەکانی هاوڵاتیانی ئاساییدا وەڵامگۆبن (کاماک و پوول ٢٠٠٢؛ ل ٩٦). لەو ڕووەوە پارتەکان لەگەڵ دوو پرسدا دەستەویەخەن، یەکەم، تا چەند دەتوانن لە پەیکەرەی خۆیاندا دیموکراتیک بن، دووەم، تا چ ڕادەیەک دەتوانن هاوکاربن بۆ سەرخستنی پرۆسەی دیموکراسی لە کۆمەڵگەدا. یەکێک لە هەرە گرفتە سەرەکییەکان بۆ قۆناغی ڕاگوزرە بریتییە لە تێکەڵی نێوان پارت و دەسەلات (حکومەت). پارت ئامادەیی هەیە لە هەموو ئاستەکانی دەسەڵاتدا؛ دەسەڵاتی ڕاپەراندن، دەسەڵاتی دادوەری، دەسەڵاتی یاسادانان، و هێزەکانی ئاسایش، لە هەموو ئەو ئاستانەش دا لق و شانەکانی پارت دڵسۆزی بۆ پارت دەچەسپێنن، بەشێوەیەک کە هەموو ئەوانەی لە پەیکەرەی دەسەڵاتدان دەبێ ئەندامانی پارت بن. ئەم نزیکییەی پارت و حکومەت، کە ئاوێتەی یەکبوون، دەبێتە هۆکارێک بۆ لاوازی بەرهەڵستی سیاسی و ئۆپۆزسیۆن. بۆیە بۆ ئەو وڵاتانەی کە لە قۆناغی ڕاگوزەردان، لە ناوخۆدا، ڕێگەی ئۆپۆزسیۆن بوون ڕێگەیەکی سەختە و لە دەرەوەش فشار بۆ بەدیموکراسیکردن دوچاری بەرهەڵستی دەستەبژێری کاربەدەست دەبێتەوە کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم ڕیفۆرمێکی مانابەخش (کاماک ٢٠٠٢؛ ل ١٢٩).

ئەوەی کە لەم پوختە توێژینەوەیەدا دەفامرێتەوە ئەوەیە کە پارتی سیاسی ڕۆڵێکی ناوەندی هەیە لە پرۆسەی بەدیموکراسیکردن؛ ئەم دەربڕینە پێچەوانەکەشی ڕاستە، بەو واتایەی کە پارتی سیاسی دەتوانێ ڕۆڵێکی ناوەندی هەبێ لە پەکخستنی پرۆسەی بە دیموکراسیبوون. ئەگەر سەرنجی قۆناغێکی گوزەر بەرەو دیموکراسی بدەین، ببینین تووشی چەقبەستوویی بووە، دەتوانین بڵێین کە هۆکاری سەرەکی پارتە سیاسییەکانن. بۆیە بۆ سەرخستنی قۆناغی ڕاگوزەر دەبێ پارتە سیاسییەکان بدوێندرێن ئەمەش بە پارتی سیاسی دەکرێ، بۆ وێنە پارتێکی سیاسی کە بۆتە بەربەست لەبەردەم بەشداری سیاسی و بۆتە هۆکاری نائومێدی خەڵک لە پرۆسەی سیاسی، دەبێ لەلایەن پارتێکی دیکەوە بدوێندرێ کە ئامانجی کاری ئەوەیە خەڵک هانبدا بۆ بەشداری سیاسی و هێزی خۆی لە ئومێد گەڕاندنەوە بۆ خەڵک ببینێ، ئەوەش هەنگاوێکی سانا نیە، بەڵام ئەستەمیش نیە. وەک هەر پرۆسەیەکی دی سیاسی، بوێریی و خۆ بۆ یەکلاکردنەوە کاری بەردەوامی دەوێ.

# سەرچاوەکان


Cammack, P., Pool, D. & Tordoff, W., 2002. Third world politics: a comparative introduction. New York: Palgrave MacMillan.

Cappedge, (2001) Political Darwinism in Latin America's lat decade In L. Diamond, & R. Gunter, eds. Political parties and democracy. Baltimore: The Johns Hopkins University Press.

Dhal, R. A., 1971. Polyarchy: Participation and Opposition. New Haven: Yale University Press.

Diamond, L. and Cunther, R., 2006. Species of political parties. In B. E. Brown Comparative politics: notes and readings. London: Thomson Wadsworth.

Diamond, L., 1996. Three paradoxes of democracy. In L. Diamond & M. F. Planter, eds. The global resurgence of democracy. London: The Johns Hopkins University Press.

Diamond, L., 1997. Introduction: in search of consolidation. In L. Diamond, M. F. Planter, Y. Chu, & H. Tien, eds. Consolidating the third wave democracies: themes and perceptions. London: The Johns Hopkins University Press.

Eisenstadt, S.N. and Roniger, L., 1981 'The study of patron-client relations and recent developments in sociological theory' in S. N. Eisentadt & R. Lemarchand, eds. Political Clientism, Patronage and Development. London: Sage.

For Leaders, Organizers and Activists' report, p.5, available at www.ndi.org

Fukuyama, F., 1989. The end of history. The National Interest, 16 (Summer 1989), p.3-18

Fukuyama, F., 2001. Confucianism and democracy? In L. Diamond & M. F. Planter, eds. The global divergence of democracies. London: The Johns Hopkins University Press.

Gunter, M. M., 2004. Historical dictionary of the Kurds. Oxford: The Scarecrow Press Incorporated.

Heywood, A., 2005. Politics. New York: Palgrave MacMillan.

Hudson, E. W., 1995. American democracy in peril: seven challenges to America's future. Chatham: Chatham House.

Huggins, R., 2002. Political communication and the media. In B. Axford, G.K. Browning, R. Huggins, & B. Rosamond, eds. Politics: an introduction. London: Routledge.

Huntington, S. P., 1968. Political order in changing societies. New Haven: Yale University Press.

Huntington, S., 1996. Democracy's third wave. In L. Diamond & M. F. Planter. The global resurgence of democracy. London: The Johns Hopkins University Press.

Lapalombara, J. & Weiner, M. eds., 1966. Political parties and political development Princeton:Princeton University Press.

Roskin, G. M., Cord L. R., Medeiros, A. J. & Jones, S. W., 2006. Political science: an introduction. New Jersey: Pearson.

Schedler, A., 2001. What is democratic consolidation? In L. Diamond & M. F. Planter, eds. The global divergence of democracies. London: The Johns Hopkins University Press.

Schmitter, C. P. and Karl, L. T., 1996. What democracy is and is not. In L. Diamond & M. F. Planter, eds. The global resurgence of democracy. London: The Johns Hopkins University Press.

Schmitter, C. P., 1996. Dangers and dilemmas of democracy. In L. Diamond & M. F. Planter, eds. The global resurgence of democracy. London: The Johns Hopkins University Press.

Smith, B. C., 2009. Understanding third world politics: theories of political change and development. New York: MacMillan Palgrave.

Spitz, D., 2005. Patterns of anti democratic thought: an analysis and criticism, with special reference to the American mind in recent times. New York: MacMillan.



عومەر گوڵپی
ئەندامی لیژنەی دارایی لە پەرلەمانی کوردستان

# هەرێمی کوردستان داهات و سامانی زۆر

## ئابووریی و ئایندەیەکی نادیار!

ژمارەیەک هۆکاری جیاجیا، کە بەشێکیان خواکرد و بەشێکی تریان پەیوەندییان بە جیۆپۆلۆتیکەوە هەیە، بوونەتە هۆی ئەوەی هەرێمی کوردستان هەرێمێکی دەوڵەمەند بێت، بەڵام لەگەڵ دەوڵەمەندی هەرێمەکەشدا خەڵکەکەی خۆش ناژین و دڵخۆش نین بە ئایندەی خۆیان و هەرێمەکەیان، بەپێی لێکدانەوەو بنەما زانستییەکان و ئامار و ئاماژەکانی بەردەستیش، ئەو هەستانەی خەڵک ڕاستن و بەردەوامیدان بەمشێوازەی حکومڕانی کە نۆ کابینەی یەک لە دوای یەکی حکومەتی لەسەر دامەزراوە، ئایندەیەکی باش و گەش بۆ کوردستان و خەڵکەکەی بەدوای خۆیدا ناهێنێت، کە مەبەستمان ئایندەی ئابوورییە وەک ڕەگەزێکی سەرەکی خۆشگوزەرانی، هەموو ئەمانەش لەم بەشانەی خوارەوەدا شی دەکەینەوە، ئەوەش لە ڕوانگەی دەرفەت و هەڕەشەکان.

**بەشی یەکەم/ دەرفەتەکانی بەردەم ئابووری هەرێمی کوردستان:**

بۆئەوەی لە قەبارەی کێشە ئابوورییی و داراییەکانی هەرێم تێبگەین، سەرەتا پێویستە بزانین ئەو دەرفەتانە کامانەن کە دەکرێت بەهۆیانەوە هەرێمی کوردستان خۆی لە کێشە ئابوورییەکان بەدووربگرێت و خاوەنی ژێرخانێکی بەهێزی ئابووری بێت.

**١- بوونی ئاسایش و سەقامگیریی:**

یەکێک لە هۆکارەکانی پێشکەوتنی ئابووریی و گەشەسەندنی وەبەرهێنان و پێشخستنی وڵات لەڕووی ژێرخانی ئابوورییەوە، بوونی سەقامگیریی و ئاسایشە، کە بەراورد بەناوچەکانی تری عێراق، هەرێمی کوردستان خاوەنی ئاسایش و سەقامگیرییە و دوورە لە شەڕ و ململانێی سەربازیی و تەقینەوە و کاری تێکدەرانە، ئەمەش خاڵێکی ئەرێنی بەهێزە، چونکە سەروەت و سامان بەرەو ئەو شوێنە دەچێت کە سەقامگیریی و ئاسایشی لێ بێت و هیچ وەبەرهێنەرێک ئامادە نییە سەروەت و سامانەکەی لە شار و ناوچەیەک لە پرۆژەدا خەرج بکات کە دڵنیا نەبێت لەوەی پرۆژە و سەروەت و سامانەکەی پارێزراوە.

**٢- هەڵکەوتەی جیۆپۆلەتیکی کوردستان:**

بەهۆی شوێنە جوگرافییەکەیی و ئارامی و سەقامیگرییەکەیەوە، هەرێمی کوردستان دەروازە و ڕێڕەوێکی باشی ئاڵوگۆڕی بازرگانییە لە نێوان وڵاتانی ئاسیا و ئەوروپا لەڕێگەی تورکیا و وڵاتی ئێرانەوە بۆ ناوخۆی هەرێمی کوردستان و شارەکانی ناوەڕاست و خوارووی عێراق و بەپێچەوانەشەوە، ئەمەش دەرفەتێکی گەورەی داوەتە هەرێمی کوردستا هەتا بەهۆی وەرگرتنی باج و باجی گومرگییەوە خاوەنی داهات بێت و جموجوڵە بازرگانییەکە دەرفەتی زۆرباش بۆ بازرگانانی هەرێم و حکومەتیش بڕەخسێنێت.

**٣- دەرفەتە دەستوورییەکان:**

بەپێی دەستوور، هەرێمی کوردستان خاوەنی کۆمەڵێک مافی ئابووریی و سیاسییە، کە ئەو مافانە زۆرترن لەوەی هەرێمێکی فیدراڵی هەیبێت، ئەوەش بەهۆی ئەو واقیعەی کە پێش ڕووخانی ڕژێمی بەعس بۆ هەرێمی کوردستان بەرجەستە بوو تا بەهێزەوە لە دەستووردا خۆی بەرجەستە بکات.

**٤- سرووشتی کوردستان:**

بوونی کەشوهەوای گونجاو، سرووشتێکی لەبار، خاکی بە پیت، ئاوی شیرین، کوردستان دەرفەتی گەورەی هەیە بۆ گەشەسەندنی کەرتی کشتوکاڵ و گەشتوگوزار و ئاژەڵداریی، کە گەشەسەندنی ئەم بوارە و وەبەرهێنان تیایدا یەکێک لە بوارەکانی بەهێزی ئابووری هەر وڵاتێکن، لەم ڕووەوە کوردستان دەرفەتی ئەو گەشەیەی هەیە ئەگەر سیاسەت و ئیدارەیەکی باش کاری لەسەر بکات.

**٥- سامانی سرووشتی:**

بوونی نەوت و گاز، هەروەها کانزای تریش، یەکێکی تر لە دەرفەتەکانی گەشەسەندنی ئابووری هەرێمی کوردستانە، بەتایبەت بوونی گاز وەک سەرچاوەیەکی گرنگی وزە کە کاریگەریی گەورەی هەیە لە ئێستای ئابووری جیهاندا و پێگە و دەرفەتێکی کەم وێنە بەهەرێمی کوردستان دەبەخشێت، ئەوەش ئەگەر بەشێوەیەکی دروست و ژیرانە و ستراتیجییانە و دەوڵەتییانە مامەڵە لەگەڵ ئەو سەروەت و سامانە کراو توانرا سود لە دەسەڵاتە فیدراڵییەکان وەربگیرێت بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی وەبەرهێنانێکی دروست لە نەوت و گاز و کانزاکانی تر.

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە، باشە بۆچی لەگەڵ بوونی ئەو دەرفەتانە و تێپەڕبوونی زیاتر لە سی ساڵ ئەزموونی حوکمڕانی و نۆ کابینەی حکومەت، کەچی هێشتا کوردستان خاوەنی ژێرخانی ئابووری نییە و دۆخی دارایی و ئابوورییەکەی ناتوانێت پشت بەخۆی ببەستێت و هاوڵاتیان لە خۆی ڕازی بکات؟ بۆچی دۆخی دارایی هەرێمی کوردستان بە بچووکترین ڕووداوی ناوخۆیی و ناوچەیی تووشی شڵەژانی گەورە دەبێت و توانای وەڵامدانەوی ئەرکە سەرەکییەکانی نامێنێت؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە، کاتی ئەوەیە هەڕەشەکانی سەر ئابووری هەرێمی کوردستان ئاماژە پێ بدەین، ئەوسا تێدەگەین سەرەڕای بوونی ئەو دەرفەتە گەورە و زێڕینانە بۆچی ئابووری هەرێمی کوردستان هێندە لاوازە.

**بەشی دووەم/ هەڕەشەکانی سەر ئابووری هەرێمی کوردستان:**

**١- نەبوون یان لاوازی دامەزراوەکان:**

لە کوردستان، هەتا ئێستا دامەزراوەکان تەنها لە فۆڕمدا دامەزراوەی دەوڵەتین و کاری حکومی دەکەن، ئەگەرنا لە ناوەڕۆکدا لە دامەزراوەی ملکەچ بۆ دەسەڵاتی دوو حزب زیاتر نین، چونکە هەردوو حزبی دەسەڵات بەوجۆرەی بەرژەوەندییان دەیخوازێت یاریی بە دامەزراوەکان دەکەن.

بۆ نموونە: لە ڕووی فۆڕمەوە خاوەنی حکومەت و پەرلەمان و ئەنجومەنی دادوەریی و وەزارەتی دارایی و دیوانی چاودێری دارایی و دەستەی نەزاهە و هێزی پێشمەرگەین، بەڵام لە واقیعدا ئەم دامەزراوانە بەتەواوەتی ملکەچی بڕیار و بەرژەوەندییەکانی هەردوو حزبی دەسەڵاتن و لە پێکهاتەکانیاندا هەمیشە ڕەچاوی هاوسەنگی ئەو دوو هێزە و بەرژەوەندییەکانیان کراوە، تەنانەت پێکهێنانی دادگا باڵاکانیش لەم هاوکێشەیە بەدەر نین!

ئەوەی بۆ دۆخی ئابووری گرنگە و ڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر دادەنێت وەزارەتی

داراییە، کە تا ئێستا وەزارەتێکمان نییە بە یەکگرتوویی کار بکات و دەستی بەسەر سەرجەم داهاتەکاندا بشکێت و سەرچاوەی سەرەتا و کۆتایی داهات و خەرجییەکان بێت.

**٢- نەبوونی سیستمی بانکی:**

بانک بە یەکێک لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی ئابوورییەکی بەهێز ئەژمار ئەکرێت، ئەمە وێڕای ئەوەی پشتبەستن بە سیستمی بانکی ئاسانکاریی بۆ هاوڵاتیان دەکات و پارە لە دەستی حکومەت دەهێڵێتەوە، لەهەمانکاتدا یارمەتیدەرە بۆ شەفافیەت و بەرقەرارکردنی حکومەتی ڕەشید، واتە بەبێ بوونی سیستمی بانکی ئەستەمە ئابووریی هیچ وڵاتێک پێشبکەوێت و هیچ وڵاتێک ببێتە خاوەنی ئابوورییەکی بەهێز.



**گەندەڵی بە هەرچوار جۆرەکانی سیاسی و کارگێڕی و دارایی و کۆمەڵایەتییەوە یەکێک لە هەڕەشە کوشندەکانی بەردەم ئابووری کـــوردســـتانە و بە هۆیەوە ڕۆژ بە ڕۆژ ئابووری کوردستان لاوازتر دەبێت و سامانەکەی بە هەدەر دەدرێت.**



**٣- نەبوونی شەفافییەت لە داهات و خەرجییەکان:**

پاش ئەوەی بۆ ساڵی (٢٠٢٢)ش، کابینەی نۆیەمی حکومەت نەیتوانی پرۆژە یاسای بودجە بنێرێتە پەرلەمان بۆ پەسەندکردن، ئەوە ئەبێتە ساڵی نۆیەمی تەمەنی حکومەت کە یاسای بودجەی نابێت، نەبوونی یاسای بودجەش بێجگە لە بەڵگەی نەبوونی پلان و بەرنامەی دارایی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی حکومەت، لەهەمانکاتدا واتە حکومەت خاوەنی سەرەتاییترین پرەنسیپی شەفافیەت نییە لە داهات و خەرجییەکانی، چونکە کاتێک یاسای بودجە نەبوو، ئەوە ژمێرەی کۆتاییش نابێت، واتە هیچ بەڵگەنامەیەک لە حکومەت نییە داهات و خەرجی پیشان بدات، لە دۆخێکی لەمجۆرەشدا حکومەت مافی ئەوەی نییە بانگەشەی کەمترین شەفافییەت بکات لە کاروباری خۆیدا، چونکە بوونی یاسای بودجە بچووکترین دەروازە و هەنگاوی یەکەمە بۆ شەفافییەت لە داهاتوو خەرجییەکان.

**٤- دوو گیرفانی لە داهات و خەرجی:**

پاش یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەی حکومەتی هەرێم لە کوردستان، هەردوو بواری سەربازیی و دارایی لە حکومەتدا تەنها بەڕووکاری دەرەوە وا دەردەکەون یەک بن و دامەزراوە بن، ئەگەرنا لە هەردوو بواری سەربازیی و داراییدا دوو ئیدارەیی تەواو

زاڵە بەسەر هەردوو وەزارەتی پێشمەرگە و وەزارەتی داراییدا. لە بواری داراییدا، هیچ کات یەک خەزێنە و یەک گیرفان نەبووە، بەڵکو بەشێوەی دوو گیرفان مامەڵە لەگەڵ داهاتەکان کراوە، ئەوەش بەڕێژەی (٤٣٪) و (٥٧٪)، ئەمەش کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر نادیاریی داهاتەکان هەیە، هەروەها دەرفەتێکی تەواوی بەخشیوەتە هەردوو حیزب تا بەو جۆرەی ئەیانەوێت دەست لە دارایی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان وەردەن بەڕێگەی جیاجیا و لەپێناو بەرژەوەندی خۆیاندا بەکاریان بهێنن.

**٥- لاوازی دامەزراوەکانی چاودێریی و لێپرسینەوە:**

نەبوون یان لاوازی دامەزراوەکانی چاودێری یەکێک لە هۆکارەکانی لاوازی ئابووریی و دارایی، چونکە کاتێک دامەزراوەکانی چاودێری لاواز دەبن یان ڕۆڵیان پشت گوێدەخرێت لە پرۆسە کارگێڕیی و ئابوورییەکاندا، ئەوە بێگومان دەرفەتی زێڕین دەست گەندەڵکاران و خراپەکاران دەکەوێت تا داهات و سەروەت و سامانی ئەم وڵاتە و دامەزراوەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان و حیزبەکانیان بەکاربهێنن.

لە کوردستان بەڕێگە و شێوازی جۆراو جۆر، ڕێگە نادرێت پەرلەمان بە ڕۆڵ و ئەرکی چاودێری دامەزراوەکان هەستێت، هەروەها پشتیوانی دارایی و یاسایی و سیاسی دیوانی چاودێری دارایی ناکرێت تا لە ڕێگەی تیمەکانییەوە وردبینی و پشکنین بۆ کاری فەرمانگەکان بکات و ڕێگە بگرێت لە بەهەدەردان و لادان لە یاسا و ڕێنماییەکان، لەوبارەیەوە نەبوونی فەرمانگەی دامەزراوەکە لە پارێزگاکانی دهۆک و هەڵەبجە و ئیدارەکانی ڕاپەڕین و گەرمیان بەسە بۆ ئەوەی تێبگەین چۆن دیوانی چاودێری دارایی پەراوێزخراوە، هەروەها ڕێگەنەدان بە تیمەکانی دیوانی چاودێری دارایی تا وردبینی و پکشنین لە دۆسییەی نەوت و خاڵە سنوورییە گومرگییەکان بکات یەکێکتر لە گرفتە سەرەکییەکانی بەردەم ئەو دیوانەیە کە ئەرکی چاودێری دامەزراوەکانە، بەهەمانشێوە بۆ دەستەی دەستپاکی و پێنەدانی زانیاریی بە میدیاکان.

**٦- قۆرخکاریی:**

بەشێوەیەکی چڕ و لە زۆرینەی بوارەکان، حیزبەکانی دەسەڵات کۆمپانیای جیاجیایان هەیە و زۆر بە بەهێزی لە بازاڕدا کار دەکەن کە ئەمەش بێجگە لەوەی پێچەوانەی یاسایە، بووەتە هۆی لاوازی کۆمپانیا نیشتیمانییە سەربەخۆکان و تەنگپێهەڵچنینیان لە بازاڕی کار و وەدەرنان و زیانگەیاندن پێیان، یان ڕێگە نەدان بە کارکردنی هیچ کۆمپانیایەک لە بواری گەورە و مامناوەندیدا تا بەرپرسێکی حیزبەکانی دەسەڵات نەکاتە شەریک، بەمەش شتێک بەناوی بازاڕی ئازاد نەماوە و ئەوەی هەیە بازاڕێکی لاوازی قۆرخکراوە، ئەمە بێجگە لەوەی لە هەندێک بواردا بەهیچ جۆرێک ڕێگە نادرێت کۆمپانیای

نیشتیمانی بازرگانی ڕاستەقینە کار بکات و ئەو بوارانە بە تەواوەتی بۆ کۆمپانیاکانی حیزبەکانی دەسەڵات و بەرپرسەکانیان قۆرخکراون وەک بواری خزمەتگوزاری خاڵە سنورییە گومرگییەکان و نەوت و سامانی سروشتی.

**٧. گەندەڵی:**

ئەگەرچی ئەو شەش خاڵەی سەرەوە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەشێکن لە گەندەڵی، بەڵام گەندەڵی بەهەر چوار جۆرەکانی سیاسیی و کارگێڕیی و دارایی و کۆمەڵایەتییەوە یەکێک لە هەڕەشە کوشندەکانی بەردەم ئابووری کوردستانە و بەهۆیەوە ڕۆژ بە ڕۆژ ئابووری کوردستان لاوازتر دەبێت و سامانەکەی بەهەدەر دەدرێت.

ئەم حەوت خاڵەی سەرەوە، کە دەکرێت ورد بکرێنەوە بۆ هۆکاری تر، یان ژمارەیەک خاڵی تریش ئاماژەیان پێبکرێت کە بوونەتە هەڕەشەیەکی جیدی لەسەر ئێستا و ئایندەی ئابووری هەرێمی کوردستان، بەئاستێکە ئەوە بۆماوەی حەوت ساڵە حکومەت تەنانەت ناتوانێت بەپێی یاسا مووچەی مووچەخۆرەکانی دابین بکات، کە سەرەتاییترین ئەرکی هەر حکومەتێکە.

**ئەوەی لەسەرەوە باسمانکرد تا ئەو قۆناغە بوو کە بڕیاری دادگای فیدراڵی سەبارەت بە نادەستوریی ناساندنی پرۆسەی دەرهێنان و فرۆشتنی نەوتی هەرێمی کوردستان دەرنەچوو بوو، لەپاش ئەو بڕیارەوە دۆخەکە هەستیارتر بووە، چونکە بەشی گەورەی داهاتی هەرێمی کوردستان سەرچاوەکەی نەوتە، هەستیارییەکەش ئەوەیە کە دەوەستێتە سەر شێوازی جێبەجێکردنی بڕیارەکە و چۆنیەتی مامەڵە کردنی هەرێم لەگەڵ بڕیارەکە و حکومەتی فیدراڵ لە دۆسییەی نەوتدا، کە هەم ئەگەری باشبوونی دۆخی دارایی و ئابووری تیایدا ئامادەیە هەم بەپێچەوانەوە ئەگەری خراپتربوونی دۆخەکە و بەرەودواگەڕانەوەی زیاتری ئابووری کراوە و ئامادەیە، ئەوەش لە ئایندەیەکی نزیکدا ڕوون دەبێتەوە.**

لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، هێشتا زۆر شاعیری سەدەی نۆزدەمان هەن نەناسێنراون و بەرهەمەکانیان نەکەوتوونەتە بەر ڕووناکایی و لەنێو کەشکۆڵ و بەیاز و کتێبخانەی بنەماڵەکاندا هەڵگیراون و بەشێکیشیان هەتا ئێستا ونن و سۆراغیان نازانین. لەنێو سەدەکانی ڕابردووشدا سەدەی نۆزدە بۆ مێژووی ئەدەبی کوردی سەدەیەکی دەوڵەمەندە و بە هەموو زارەکان لەو سەدەیەدا کورد خاوەنی ئەدەبیاتی خۆی بووە.

نکۆڵی ناکرێ کە جوگرافیای باکووری کوردستان لەبەر نزیکیی لە سنووری تورک و ئەدەبیاتی تورکیدا، پریشکی ئەو کاریگەرییەی بەرکەوتووە، بۆیە زۆر لەو شاعیرانەی ئەو جوگرافیایە لەپاڵ شیعرە کوردییەکانیان شیعری تورکیشیان هەیە. ئەمانە وەک شاعیر بۆ مێژووی کورد گرنگیی خۆیان هەیە و ئەگەر بەرهەمیان بە زمانی کوردییش هەبێ ئەوا لەنێو مێژووی ئەدەبی کوردیدا جێگە و پێگەیەکی گرنگییان دەبێت.

ئەم شاعیر و زانایەمان کە بە کوردیی ناوەند هیچی لەبارەوە نەنووسراوە، ناوی شێخ سەلیم کوڕی ئیسماعیل ئاغا کوڕی بەکر ئاغایە، ساڵی ١٨١٣ی زایینی لە گوندی ئەزنافیری سەر بە قەزای کیغی پارێزگای بنگۆلی باکووری کوردستان لەدایکبووە. ئەو یەکێکە لە خەلیفە و نوێنەرانی تەریقەتی نەقشبەندی لە ناوچەکەدا، پەروەردەی سۆفییانەی لای شێخ زیائوددین گوموشخانەیی وەرگرتووە. پاشان لای شێخ عەلی سەبتی[١] (باپیری شێخ سەعیدی پیران)ی خوێندووە و هەر لای ئەویش مۆڵەتی تەریقەت و زانستی وەرگرتووە.

شێخ سەلیم وێڕای ئەوەی لە ناوچەکەدا ڕۆڵێکی گەورەی زانستی و پەروەردەیی و تەریقەتی هەبووە، لەهەمانکاتدا شاعیرێکی باشیش بووە، بەداخەوە تەنیا ٢١ شیعری لە پاش خۆی دۆزراوەتەوە، کە زۆربەیان بە زمانی تورکین و کەمێکیان بە کوردیی کورمانجین و بەشێکیش لەوانە لە شێوەی مولەممەع تێکەڵەیەکن لە زمانی کوردی و تورکی.

---

١. شێخ عەلی سبتی پاڵۆیی (١٧٨٦-١٨٧١ز):زانا، سۆفی و ئەدیبێکی سەدەی نۆزدەیە، بنەماڵەکەیان لە عێراقەوە هاتوون و لە ناوچەکانی دیاربەکر و پاڵۆ نیشتەجێ بوونە. ناوبراو لە مزگەوتی گەورەی دیاربەکر خوێندوویەتی و پاشان هاتۆتە باشووری کوردستان و لای بەرزنجی و حەیدەرییەکان لە سلێمانی و هەولێر خوێندوویەتی، دوای تەواوکردنی خوێندن ماوەی بیست ساڵ لە مزگەوتی گەورەی دیاربەکر دەرسی داوەتەوە و دواتر چۆتە لای مەولانا خالید و ماوەی چوار ساڵی لا ماوەتەوە و ئیجازەی تەریقەتی نەقشبەندی لەو وەرگرتووە و بۆ جێبەجێکردنی وەسیەتەکەی مەولانا دەچێتە پاڵۆ و لەوێ دەست بە تەدریس و ئیرشاد دەکات و ژمارەیەکی زۆر لەسەر دەستی پێدەگەن و هەندێکیان لەو ناوچانەی باکووری کوردستان دەبنە خەلیفەی ئەو بۆ تەریقەتی نەقشبەندی. لە گوندی پاڵۆ کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە.

له شیعره‌كانیدا نازناوی (سین و لام)ی بۆ خۆی داناوه وه‌ک کورتکراوه‌ی ناوی سه‌لیم، هه‌روه‌ها له ته‌واوی شیعره‌كانیدا لایه‌نی عیرفان و مه‌عنه‌وییه‌ت زۆر به‌ڕوونی ده‌بینرێت و وێڕای ئه‌وه‌ش خۆشه‌ویستییه‌كی له‌ڕاده‌به‌ده‌ری بۆ پێغه‌مبه‌ر و ئه‌سحاب ده‌ربڕیوه، ده‌توانین لێره‌دا بۆ تۆمارکردنی به‌شێک له مێژووی ئه‌ده‌بیاتی سه‌ده‌ی نۆزده‌مان، شیعره کوردییه‌كانی بهێنینه‌وه، که بێگومان وه‌ک هاوچه‌رخی شاعیرانی حاجی قادری کۆیی و شاعیرانی تر دێته هه‌ژماردن. ناوبراو له ساڵی ١٨٩٨ له گوندی خه‌رابه کۆچی دوایی کردووه و هه‌ر له‌وێش نێژراوه.

**له نموونه‌ی شیعره‌كانی:**

عه‌شقا مه‌جاز حاصل ببه   عاشق ئه‌گه‌ر صادق ببه
بابێ حه‌قیقه‌ت لێ ڤه‌به، هێجا دگه‌ی مه‌عنه‌وییه‌تێ
قه‌لبان غه‌ره‌ز عاشق هه‌به   یان یار و مه‌طلووبه‌ك هه‌به
یان عاشق و مه‌عشووق هه‌به   دائیم د قه‌یدا مه‌حبه‌تێ
قه‌لبان غه‌ره‌ز موقه‌لله‌به   گه‌ه نار دبه گه‌ه نوور دبه
گه‌ه راحه‌ت و مه‌سروور دبه   نێزیك دبه ژ وه‌صله‌تێ
قه‌لبێ کـــو ذاكر نابته   غه‌فـــله‌ت د ویدا ثابته
قه‌ت فه‌یز ژ وی چـــێنابته   دائیم د قه‌یدا زوڵمه‌تێ
قه‌لب قاسییه نه‌رم نابته   له‌و بێ ذیكر نوور نابته
بێ مورشیدا ئیش نابته   جاریی بوویه ل ڤێ عاده‌تێ
دلبه‌ر له‌تیف و ئه‌نوه‌ره   ئینجیی و دوڕ و جه‌وهه‌ره
نووره‌ك ژ نوورا ئه‌كبه‌ره   میـــرئات و سیڕڕا وه‌حده‌تێ
عالم بكه گه‌ر صوبح و شام   وه‌صفان (الی یوم القیام)
هێژ نابته بێ شك ته‌مام له‌و سین و لام كه‌ت حیره‌تێ

**(٢)**

الحمدلله الغفار   دیسان بخێرهات ئه‌و بهار
بولبول دكت ئه‌فغان و زار   دیسان بخێر هات ئه‌و بهار
الحمدلله الغفور   خه‌ملین ژ نوو ڤه گول ظوهور
ته‌یر و تویوور هاتن ژ دوور   دیسان بخێر هات ئه‌و بهار

چیچەك و ڕەیحانێ د زەر  جوملە نەبات و بەڕ و بەحر
فەیضا خودێ تێ کر ئەثەر  دیسان بخێر هات ئەو بهار
هاتی زەمانێ سوورگولان  چوویە د باغێ بولبولان
ئەفغان ژ وان چوو ئاسیمان دیسان بخێر هات ئەو بهار
ئەفغان ژ وان چوونە فەلەك  ژ ئاسیمان حەتتا سەمەك
بیلجوملە عاشق و مەلەك دیسان بخێر هات ئەو بهار
سوورگول ژ فەیضا دلبەرێ  بێن دایە شوبهێ عەنبەرێ
خەمرەك ژ مەیخانا بەرێ  دیسان بخێر هات ئەو بهار
سوبحان ژ نەققاشێ بەرێ  سەد ئاه ژ دەستێ دلبەرێ
کوشتم ب دەربا خەنجەرێ  دیسان بخێر هات ئەو بهار
هاتی بهار وەقتێ سوروور ڕەمزەك ژ مەحبووبان ظوهوور
مووسا صیفەت بەر کوهێ طوور دیسان بخێر هات ئەو بهار
حەی بوون ژ نووڤە جامیدات  ئەرز و سەمائو مائیات
بوون مەظهەرا ذات و صیفات  دیسان بخێر هات ئەو بهار

(٣)

قەسیدەی شیوەن بۆ کۆچی دوایی شێخ ئەحمەد:
گەلۆ قوتبەك خودا دابوو کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ
وەکی ڕۆژێ ضیا دابوو کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ
وەکی ڕۆژێ بوویە ئەظهەر وەکیلێ (صدیق الاکبر)
کەریم و نازك و سەروەر کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ
نەشینێ تەختێ دەولەت بوو یەقین شاهێ ویلایەت بوو
خودان سیرڕ و صەلاحەت بوو کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ
کو ئەو شێخەکی کامل بوو دەوائێ قەلبێ غافل بوو
د ئەمرێ حەقدا عامل بوو کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ
کو ئەو شێخێ چەبەخچوور[١] بوو تژی فەیض و تژی نوور بوو
ژ جوملە مەنهییان دوور بوو کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ
ڕەئیسێ جوملە شەیخان بوو ژ بۆ دەردان را دەرمان بوو
چراغێ ئەهلێ ئیمان بوو کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ

---

١. چەبەخچوور: ناوی کۆنی شاری بنگۆلە

خودانێ کەشف و ئیلهامێ کو مەشهوور بوو د ناڤ عامێ
وی شوهرەت دا حەتا شامێ کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ
کو ئەو غەوثێ حەقائیق بوو عەلیمێ سڕڕێ فائیق بوو
چە قوطبەك بوو خودا دابوو کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ
فەنا فیللاهێ مەعدووم بوو فەقیروڵڵاهێ مەزلووم بوو
وەلێ واصیلێ مەرحووم بوو کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ
کوسەید حەیف چوو شێخ نوورانی موتیعێ ڕەببێ ڕەحمانی
(سمعنا) حوکمێ یەزدانی کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ
مەدحێ کو شێخ ئەحمەد تەمام قابیل نینە ئەو سین و لام
گەر چی ببێم هەتا قیام کو سەد حەیف چوو ژ دنیایێ

**(٤)**

ئەم شیعرە بە شێوەی مولەممەع تێکەڵی زمانی تورکی کراوە:
ئەیا دلەبەر ژ عـــیشقا تە دلێ من پر پەریـــــشانە
سەنین حوسنینلە سەرگەشتە دبم هەر شوبهی پەروانە
شیعرەکە پێنج دێرە و لە کۆتایی هەر نیوەدێرێکدا پارچەیەک بە کوردییە و سێ پارچەکەی تر تورکییە.

**(٥)**

موجیبێ کەون و زەمانی ل تە بن یوز بین سەلام[١]
مەفخەرێ ئینسان و جانی ل تە بن یوز بین سەلام
لەو ب تە ئادەم ڕەها بوو هەم ب تە ئەییوب شیفا بوو
ڕۆژ ب تە پڕ ئینجلا بوو ل تە بن یوز بین سەلام
گەرچی مووسا ئەو کەلیمە هەر ب تە بوویە کەریمە
عەرش ب نەعلا تە عەظیمە ل تە بن یوز بین سەلام
زەمزەم و کەعبە شەریفن کەوثەر و جەننەت نەظیفن
ئەو ب نوورا تە لەتیفن ل تە بن یوز بین سەلام
دوڕڕێ نوورا تە ضیا کر وەجهێ یوسف ئینجلا کر
لەو زولێخا موبتەلا کر ل تە بن یوز بین سەلام

---

١. ل تە بن یوز بین سەلام: لەسەرتۆ بێت سەد هەزار سەلام




عەکسێ حوسنا تە نەهانی غونچە یەك شەممە هلانی
لەو دکت بولبول فیغانی ل تە بن یوز بین سەلام
حەلقەیا داود ضیا بوو شەربەتا لەعلەش گها بوو
لەو لەتیف و پڕ بها بوو ل تە بن یوز بین ســـــەلام
خەلقوڵڵاهی جوملە دائی تو ژ بۆ هەمیان دەوائی
مەعدەن و کانا شیفائی ل تە بن یوز بین سەلام
لەو ب تە سەکنایێ ئەفلاك مەقسەدا ئەسرارێ لەولاك
د خزمەتا تە جوملە ئەملاك ل تە بن یوز بین سەلام
(عالم القدس) تاریکوونە هەر دهاتن سەر زەمینە
خاصەتەن ڕوحولئەمـــــینە ل تە بن یوز بین سەلام
هەم ژ بێهنا تە موعەتتەر خوش تو بوویە میسك و عەنبەر
مەمدووحێ الله اکبر ل تە بن یوز بین ســـــەلام
مەمدووحێ ڕەببێ ڕەحیمی (لعلی خلق عظیم)ی
فەوقە عەرشە تو کەلیمی ل تە بن یوز بین سەلام
هەم ئەزەلدا لا میثالی ئەبعەدێ وەهم و خەیالی
لەو ژ نوورا ذولجەلالی ل تە بن یوز بین سەلام
لیلخەلائیق قیبلەگاهـــی ماســــیوا را پادشاهی
شافیعێ عوصصات پەناهی ل تە بن یوز بین سەلام
شافیعێ ئەهلێ ذونووبی مەلهەما وەجعا قولووبی
هەم حەبیبی هەم طەبیبی ل تە بن یوز بین سەلام
سین و لام پڕ بێ نەوایە ژار و ئەدنا و گەدایە
سەگێ دەرگاهێ عولایە ل تە بن یوز بین سەلام

## سەرچاوەکان


سوود لەم سێ سەرچاوەیە وەرگیراوە:

-Selimefendigil, Molla Halis, Kiğılı Şeyh Selim Efendi Divan, Kent Yay, İstanbul 2007.

-Mahmut GİDER, Kiğili Şeyh Selim Efendi’nin Dünya Algisi, BİNGÖL ARAŞTIRMALARI DERGİSİ, Volume: 5 Issue: 1, 2018.

- علماؤنا من المدرسين فی القرن العشرین، صباح الدین الچانی، دار الروضة، اسطنبول، ٢٠١٥.



داڕشتنەوەی هەژار حاتەم

# وۆرکشۆپی یاسای پەروەردە و فێرکاری لە هەرێمی کوردستان

**ڕۆژی ٢٤ی شوباتی ٢٠٢٢ لە ئوتێل (تایتانیك) لە شاری سلێمانی، بە ئامادەبوونی ژمارەیەك لە مامۆستایان و شارەزایانی کەرتی پەروەردە و پەرلەمانتار و مامۆستایانی زانکۆ، سەنتەری زەهاوی وۆرکشۆپێکی بۆ گفتوگۆکردن لە بارەی پڕۆژە یاسای پەروەردە و فێرکاری لە هەرێمی کوردستان بۆ هەریەك لە: (پ.د. سامان فەوزی) و (د. عەبدوڵڵا وەهاب) و (م. بوخاری عەبدوڵڵا) ساز کرد.**

وتەی دەستپێکی ۆرکشۆپەکە لەلایەن (م. ئیدریس سیوەیلی) بەڕێوەبەری دانیشتنەکەوە پێشکەشکرا. دواتر (د.سەباح بەرزنجی) لە وتەیەکدا، کە بەناوی سەنتەری زەهاوی-یەوە خوێندییەوە، تیادا بەخێرهاتنی ئامادەبووانی کرد و ئامانجی ۆرکشۆپەکەی خستەڕوو، کە هەڵسەنگاندنی برگە و ماددەکانی پڕۆژە یاساکەیە، هیواشی خواست کە بە هەمووان بتوانین پڕۆژە یاساکەیەکی گونجاو بۆ کەرتی پەروەردە ئامادە بکەین.

پاشان **(پ.د. سامان فەوزی)** مامۆستای زانکۆ و شارەزای یاسایی، دەستیکرد بە پێشکەشکردنی بابەتەکەی لەژێر ناونیشانی: **«ڕەهەندی یاسایی پڕۆژە یاسای پەروەردە و فێرکاری هەرێمی کوردستان»**. ناوبراو کۆی سەرنجەکانی خۆی لە (١٠) خاڵدا خستەڕوو، کە ئەمانەن:

١- ئەم یاسایە لە نزیکەی (٢٠٠) ماددە و ڕێنمایی پێکهاتووە، زیاتر لە (تقنین)ە دەچێت و زیادەی زۆری تێدایە، هەندێک ماددەی، بۆ نموونە ماددەی یەکەم، (٥٠) بڕگەی لەگەڵدایە و کەموکوڕیشی زۆرە.

- هەروەها لە نزیکەی (٢٠) شوێندا نووسراوە:»بەڕێنمایی ڕێکدەخرێت»، کە ئەم هەموو دەستەواژەی «بەڕێنمایی ڕێکدەخرێت» یاساکەی لاواز کردووە.

- دواتر حشودی زۆری تیادایە، بۆ نموونە لە ماددەی (٣٥ بڕگەی ٣) لە بابەتی پشووەکاندا دەڵێت: پشووی بەهارە لە (١٩)ی ئازار دەستپێدەکات، کە ئەوەش وانییە.

٢- بنەمای یاسایی جیاوازە لەگەڵ گریمانە، یاسا سنوور دیاری دەکات، بەڵام لە پڕۆژە یاساکەدا وای نەکردووە، بۆ نموونە لە ماددەی (٤٦)دا دەڵێت: پێویستە خوێندکار و قوتابی لە وانەکاندا ئامادە بێت!!.. ئەی ئەگەر غائب بوو؟!

- هەروەها لە ماددەی (١٧ بڕگەی ٣)دا هاتووە:

پێویستە خوێندکار بەر لە تەواوکردنی تەمەنی (٢٤)ساڵی قۆناغی ئامادەیی تەواو کردبێت! ئەی گەر وانەبوو!؟

٣- ناڕێکی لەڕووی داڕشتنی یاساییەوە (الصیاغە القانونیە):

ئەمەش لە ماددەکانی (١، بڕگەی ٢٢، ٢١ بڕگەی ٤، ١٤٨ بڕگەی ٣)دا بە ئاشکرا دەبینرێت، هەر بۆ نموونە ماددەی (١٤٨ بڕگەی ٣)دا دەڵێت: بەرچاوکردنی یاسای بەکار، ئەمە یانی چی؟ دەبوایە بڵێت کەمتر نەبێت لەوەی یاسای بەکاردا هەیە.

٤- لەڕووی نەتەوەییەوە لاواز و شەرمنانەیە:

- زمانە کوردییەکەی لاوازە، ئەمەش لە زیاد لە (٦) شوێندا بەزەقی دیارە: بۆ نموونە ماددەکانی: (٣٩، ١٣٩، ٢٠ بڕگەی٤، ٤٢ بڕگەی ٣).

٥- بەتاڵیی بەشێک لە بڕگە و ماددەکانی:

ئەمەش لە ماددەکانی (٨، ٩، ١٠، ٥٠)دا دەبینرێت، بۆ نموونە لە ماددەی (٨)دا هاتووە: دەبێت ژمارەی منداڵی هەر پۆلێک گونجاو بێت لەگەڵ ڕووبەری ژوورەکەدا.

٦- لە ڕووی (منطوق النص ومفهوم النص) مفهوم المخالفه والموافقه:

ئەوە لەو یاسایەدا پەیڕەو نەکراوە، بۆ نموونە لە ماددەی (٢٢) دەبێت لە پێشەوە برگەی (ب) بخوێنیتەوە، ئینجا (أ) بخوێنیتەوە. لە بابەتی مانەوە (ڕاسب) بوون لە هەمان پۆل و خوێندنگا.

٧- بە دروشم مەرکەزییە، بەڵام بە فیعلی وانییە:

ئەمەش لە ماددەکانی (٢ برگەی ٧، ١٣٤ برگەی ٢)دا هەستی پێدەکرێت، بۆ نموونە لە ماددەی (٢)دا باسی مەرکەزییەت، بەڵام لە ئامانجەکانی قسەکە دەگۆڕێت.

٨- پڕۆژە یاسایەکی بۆرجوازییانەیە: زیاتر گرنگی بە کەرتی تایبەت دەدات و کەرتی پەروەردەی گشتی فەرامۆش کردووە.

٩- نارێکیی سزا و قەبارەی سزا:

ئەمەش لە ماددەکانی (١٦٧، ١٨٨)دا دەبینرێت، بۆ نموونە ماددەی (١٦٧)دا هاتووە: (سزای ١٠ ملیۆن تا ١٥٠ ملیۆن) بە سزای دیکە سزا دەدرێت! (لا جريمة ولا عقوبة الا بالنص).

١٠- ڕۆژی جێبەجێکردنی یاساکەدا:

بەپێی ماددەی ١٩٧، لە ڕۆژی بڵاوکردنەوەی پڕۆژە یاساکەوە دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە، کە نابێ وابێت، بەڵکو دەبێت بگۆڕێت، بەلانی کەمەوە بە دوو ساڵ.

ـ دواتر **(د.عەبدوڵڵا وەهاب)** پەیپەرەکەی خۆی بەناونیشانی: **«سیاسەتی پەروەردەیی و تیشکێك لەسەر پڕۆژە یاسای پەروەردە و فێرکاری»** پێشکەشکرد. ئەویش ڕەخنەکانی خۆی لەسەر پڕۆژە یاسای پەروەردە و فێرکاری لەم خاڵانەی خوارەوەدا خستەڕوو:

١- ئەم یاسایە بەراورد بە یاساکانی ساڵی (٢٠٠٧) و (٢٠٠٩) تەنها گۆڕانە لە ڕووکەشدا، دەبێ گۆڕانکارییەکە لە جەوهەردا بێت.

٢- گرنگە کار لەسەر ئامانجەکانی پڕۆژە یاساکە بکرێت، ئێستا ئامانجەکان زیاتر قسەی گشتی و ناڕوونن.

٣- مەسەلەی تاقیکردنەوە بگۆڕدرێت، ناکرێت هەموو هەڵسەنگاندێک تەنها لە تاقیکردنەوەیەکدا کۆبکرێتەوە.

٤- بە ئەهلییکردنی کەرتی پەروەردە خراپە، بۆ ڕێگرتن لەو حاڵەتە دەبێ جەخت لە بەهێزکردنی کەرتی پەروەردەی گشتی بکرێتەوە.

٥- ئەم یاسایە چ جۆرە سیستمێکی کارگێڕیی پەرە پێدەدات، ستوونی، یان ئاسۆیی؟

٦- پەیوەندیی ئەم یاسایە بە یاساکانی دیکەی هەرێمەوە چییە؟

٧- گرنگە لە پڕۆژە یاساکەدا بە ڕوونی ئەرکی وەزارەت و بەڕێوەبەرەتییەکان نیشان بدرێن.

لە بەشی کۆتایی وۆرکشۆپەکەدا، **(م.بوخاری عەبدوڵڵا)** بابەتەکەی خۆی لەژێر ناونیشانی: **«فەلسەفەی پەروەردە و ڕەنگدانەوەی لەناو یاسای پەروەردە و فێرکاریدا»** پێشکەش کرد.

**ناوبراو کۆی ڕەخنە و سەرنجەکانی لەم خاڵانەدا خستەڕوو:**

١- بەهای پەروەردەیی (مرۆیی): یاساکە لە ڕووی تەکنیکییەوە هەنگاوی باشی بڕیوە، بەڵام خزمەتی بەها باڵاکان ناکات.

٢- ژینگەی پەروەردەیی: ئەم پڕۆژە یاسایە چ ژینگەی پەروەردەیمان بۆ دەستەبەر دەکات؟ چونکە ژینگەی پەروەردەیی بۆ قوتابی زۆر گرنگە.

٣- بیرکردنەوەی ڕەخنەیی (التفکیر النقدی): لە پڕۆژە یاساکەدا ونە... بیرکردنەوەی قووڵ هاتووە.

٤- هەروەها لە پڕۆژە یاساکەدا هاتووە، کە دەکرێ قوتابخانەکان کتێبخانەیان هەبێ، ئەمە شتێکی زۆر بەدیهییە، دەبێت بڵێ کتێبخانە بۆ قوتابخانەکان دابین بکرێت.

٥- پڕۆژە یاساکە سیستمی کارگێڕیی لەسەرەوە بۆ خوارەوە جێبەجێ دەکات.

٦- لە پڕۆژە یاساکەدا شوناسی مامۆستا ونە.

٧- تاقیکردنەوە کراوەتە تاکە پێوەری هەڵسەنگانی قوتابی، دەبێ باس لە فێربوون و فێرنەبوون بکرێ.

**سەرنج و تێبینییەکانی ئامادەبووان:**

بەشێکی تری وۆرکشۆپەکە تایبەت بوو بە سەرنج و تێبینی ئامادەبووان، کە هەریەک لەم بەڕێزانە قسەیان کرد، ئێمە لەبەر دووبارەنەبوونەوە سەرنجەکانی هەموویانمان یاداشت نەکردووە.

م. عومەر، جێگری بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی سلێمانی. م. بەیان کەمال محەمەد، سەرپەرشتیاری پەروەردەیی. م. ئاواز جەزا، سەرپەرشتیاری باخچەی منداڵان. م. ئەحمەد کەرکووکی، ئەندامی سکرتاریەتی (ی. م. ک). م. جیهاد حەمە. م. عەبدوڵڵا. م. ئاوارە مەعروف. م. عیرفان. م. ئەرسەلان. م. بەختیار ستار محەمەد. م. پەخشان. م. عەبدولرەحیم. م. عەتا. م. سیروان ساڵح محەمەد

**پێشنیازەکانی (م. سیروان ساڵح محەمەد):**

- ماددەی (١٧) پرسێکی لەسەر تەمەن ورووژاندووە، لە ماددەی (٢٢) وەڵامێکی بۆ ئەمە تێدایە، کە ئەمەش مەنتیقی نییە.

- ماددەی (١٨ بڕگەی ١) لەگەڵ ماددەی (٢٦ بڕگەی ٢) هەمان شتە، واتا دووبارەیە.

- مادده (٢٧)باسی ئەوە دەكات، كە پێش مانگی (٣)ی هەموو ساڵێک وەزیری پەروەردە بڕیاری لێدەدات، وا باشترە ئەمە چاک بكرێت.

دواتر م.ئەحمەد كەركووكی، ئەندامی سكرتاریەتی (ی. م. ک) پێوابوو پڕۆژە یاساكە كەموكورتی زۆری تێدایە، گرنگترین تێبینییەكانی خۆی لەم خاڵانەدا دیاریكرد:

- لە وەرگێڕانەكەی بۆ كوردیدا وشەی «جێندەر» لە ماددەی ٣ بڕگەی ١دا زیادكراوە، ئەوە لاببرێ و لە بری ئەوە «دادگەری نێوان هەردوو ڕەگەز» زیاد بكرێ.

- وشەی «پەروەردەی ئیسلامی» لە ئامانجە فەلسەفییەكاندا زیاد بكرێ.

- هەر ماددەی (٣ بڕگەی ٣)دا « بەها كۆمەڵایەتییەكان» زیاد بكرێت.

- دواتر لە خاڵی (٤)ی هەمان ماددەدا لە كۆتایی بڕگەدا بنووسرێت: «لەگەڵ پاراستنی شكۆی مامۆستا»دا.

- لە ماددەی (٤ خاڵی ٢)دا، «شانازیكردن بە ئاینی ئیسلام» زیاد بكرێ، خاڵی ٣یش «ڕێزگرتنی ئاینەكان» بگۆڕێت بە «ڕێزگرتنی ئایینی ئیسلام و ئاینەكان)، چونكە گەلی كورد زۆرینەی هەرە زۆری مسوڵمانە.

- لە هەمان ماددەدا، وشەی»یەكسانی» بگۆڕێت بۆ «چەسپاندنی دادگەری نێوان هەردوو ڕەگەز «، لە خاڵی (١٥)یشدا ئەمە زیاد بكرێ و بنووسرێت: «گرنگیدان بە پەروەردەی ئیسلامی».

- ماددەی ٤٤: لە شتە قەدەغەكراوەكان لەناو ناوەندەكانی خوێندندا لە بڕگەی (ب)دا وشەی «لادانی سروشتی» زیاد بكرێ.

- ماددەی ١٨٨: «تاوانی بینراو» لاببرێ و ئینجا سزاكە دیار بكرێت.

## پێشنیازەكانی (م. بەختیار ستار محەمەد ماستەر لە سەركردایەتی و كارگێڕی پەروەردەیی)دا:

- لە ماددەی (٢ بڕگەی ٥) هاتووە گوایە قوتابی سەنتەرە، بەڵام لە وردەكاریی پڕۆژەكەدا پێچەوانەكەی دەبینین.

- لە ماددەكانی (٢٧، ٣٠، ٣٨، ٤٠)دا دەسەڵاتێكی زۆری داوە بە ئەوانەی پسپۆڕی پەروەردەیی نین، شێوازی شكستخواردووی (٣٠) ساڵی ڕابردووی پەروەردە دووبارە دەكاتەوە، هەروەها هیچ شتێكی نوێی بۆ لامەكەزیەت تێدا بەدی ناكرێت، لەكاتێكدا پەروەردە پێویستی بە لامەكەزیەتە، دەسەڵاتێكی زۆر داوە بە وەزیر و ئەنجوومەنی وەزارەت.

- ئامانجی خوێندنی ئامادەیی و ئامادەیی پیشەیی وەک یەک باسكردووە، لەكاتێكدا دوو دامەزراوەی جیاوازن.

- تێکەڵی و دووبارەی زۆری تێدایە، بۆ نمونە لە لاپەڕە (٢٤)دا ئامانج و بنەمای تێکەڵکردووە، بەڵام لە خوێندنی بنەڕەتیدا جیایکروونەتەوە.

- هەروەها بەدێرێک باسی (بریتش کانسڵ)ی نەکردووە، کە ئومێدێک بوو بۆ بەرەوپێشبردنی پەروەردە و زیاتر لە (١٠) ساڵ ئەو هەموو خەرجی ماددیی و مەعنەوییەی تێدا کرا.

- لە ماددەکانی (٦٣، ٦٧)دا جەخت لە ئەرکەکانی مامۆستا و بەڕێوەبەر و فەرمانبەران دەکات، بەڵام زۆر بە شەرمنی باسی مافیان دەکات.

- لە پڕۆژە یاساکەدا بە هیچ شێوەیەک باسی لە مەشق و ڕاهێنانی مامۆستایان نەکردووە، کە چەند گرنگە و پێویستە بۆ بەرەوپێشبردنی کەرتی پەروەردە.

**پێشنیازەکانی (م. ئیدریس):**

- لە یاساکەدا جەخت بکرێتەوە، کە مەلزەمە قەدەغە بکرێت و سزای ئەوانەش دیاری بکرێ، چونکە مەلزەمە توانای بیرکردنەوەی فێرخواز لەناو دەبات و تەنها لەبەرکردنی بۆ دەهێڵێتەوە.

- جێگیرکردنی «بیری ڕەخنەیی» وەکو پڕۆگرام لە سەرجەم ناوەندەکانی خوێندندا، چونکە بیری ڕەخنەیی لووتکەی مەعریفە و ئەزموونە و کرۆکی پڕۆسەی پەروەردەیە.

پێشنیازەکانی (م. ئاواز جەزا سەرپەرشتیاری باخچەی منالان):

- لە پڕۆژە یاساکەدا با جەخت لەو خاڵە بکەینەوە، باخچەکان ناچار بکرێن، کە تەنها (٤) کاتژمێر منالّ بهێڵرێنەوە بۆئەوەی تووشی مەلەل نەبن.

- هەروەها گرنگی زیاتر بە گەشەپێدان و فێربوونی بەها کۆمەڵاتییەکان بدرێ و کەمتر گرنگی بە وانەی زانست و بیرکاری بدرێ.

- لە باخچەی منالاّندا گرنگی زیاتر بە زمانی دایک بدرێت.



نووسینی: عادل صدیق

# ململانێی نێوان
# تورکخواکان و ئینگلیزخواکان

**یەکێك لە سیما دیار و بەرچاوەکانی سەردەمی حوکمڕانی دووەمی شێخ بریتی بوو لە ململانێی نێوان ئینگلیزخواکان و تورکخواکان، کە هەندێك جاریش بە جلخوارەکان نێودەبران، ئەم بابەتە بەر لە هێنانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی سەریهەڵدابوو، فاکتەری سەرەکیش بۆ دەرکەوتنی ئەم دیاردەیە ڕووخاندنی حکومەتی یەکەمی شێخ مەحمود و دوورخستنەوەی ناوبراو بوو بۆ هیندستان، هەروەك نارەزایەتی و ئاڵۆزییەکانی ماوەی نێوان ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٢ کە سەردەمی حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیز بوو، لەلایەکی ترەوە هاتنی ئۆزدەمیر و هێزی تورك بۆ ناوچەکانی ڕەواندز و دروستکردنی پردی پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵێك لە خەڵکانی دیار و بەرچاوی کوردستان و سلێمانی بەتایبەتی و لەو ڕێگەیەشەوە قۆستنەوەی نارەزایەتییەکانی خەڵکی بەرامبەر بە ئیدارەی ئینگلیز لە ناوچەکەدا بۆ بەرژەوەندی خۆیان...**

لێرەوە سەرەتاکانی ململانێی نێوان ئەو دوو چینە دەستیپێکرد، ئەڵبەت هەتا حوکمڕانی سێیەمی شێخیش تەواو بوو تای تەرازوو بە پشتیوانی ئۆزدەمیر و قۆستنەوەی پێگە و پەیوەندییە کۆمەڵاتییەکان بەلای تورکخواکاندا بوو، ئێمە لەم ڕاپۆرتەدا هەوڵمانداوە بەکورتی سەرنج بخەینە سەر سرووشتی ئەو پەیوەندیانە و کاریگەرییان لەسەر چارەنووسی شێخ مەحمود بەتایبەتی و بارودۆخی خەڵکی بەگشتی لە شاری سلێمانیدا.

## باسی یەکەم/ حکومەتی دووەمی شێخ مەحمود

دوای ئەوەی ئینگلیزەکان کۆمەڵێک شکستی یەک لە دوای یەکیان لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان تووش هات، بارودۆخەکە زیاتر ڕووی لە ئاڵۆزی کرد، بەریتانییەکان میکانیزم و شێوازی جۆبەجۆریان بەکارهێنا بۆ سەرلەنوێ کۆنترۆڵکردنەوەی ناوچەکە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، هۆکارەکەشی لەلایەکەوە فشاری تورکەکان لەسەریان زیاد دەبوو، لەلایەکی تریشەوە ناڕەزایەتییەکانی خەڵک لەبارەی سیاسەتەکانی ئینگلیز و حوکمی ڕاستەوخۆیان هەتا دەهات ڕووی لە هەڵکشان ئەکرد، بەتایبەتی لەناو شاری سلێمانیدا. دوای ئەوەی ئۆزدەمیر پاشا لە ڕەواندز خۆی قایم کرد، کەمالییەکان کەسێکیان بەناوی فەوزی بەگ ڕەوانەی ڕەواندز کرد و کردیان بە قایمقامی شارەکە[١].

ئۆزدەمێر(عەلی شەفیق)ی چەرکەسی بەڕەگەز میسری جێگەی یوزباشی محێدین بەگی گرتەوە، بوو بە قوماندانی قوای عەسکەری ڕەواندز، جوڵانەوەکە گڕوتینی تێکەوت، دوای ئەوەی ناودەشت و ڕانییەیان لە ١٩٢٢/٨/٣١ کۆنترۆڵکرد، شاری کۆیەشیان بە ئینگلیزەکان چۆڵکرد. تەنانەت هێزێکی چل سەربازی تورک و هێزێکی پشدەریان نارده گوندی قەمچوغە بەنیازی گرتنی شاری سلێمانی. دەنگۆی هاتنی ئەو هێزە لە ڕێگەی تورکخواکانەوە بەناو شاردا بڵاوبوویەوە[٢]. بەوتەی ئەحمەد تەقی بۆیە هێزەکەیان نەبردووتە سلێمانی ترسی ئەوەیان هەبووە کە بە هەمان شێوەی کۆیە سلێمانیش بۆردومان بکەن[٣]. پیاوەکانیان بەئاشکرا لە ناوچەکەدا هاتوچۆیان دەکرد، هەوڵی زۆریان دەدا ناڕەزایی خەڵک بقۆزنەوە بۆ خزمەتی سیاسەتەکانی خۆیان، بەتایبەت دوای دورخستنەوەی شێخ مەحمود و بێ بەڵێنی ئینگلیزەکان، بەشێکی زۆری خەڵک لەوە بەدوا بەلای تورکەکاندا دایان دەشکاندەوە. مس بێڵ لە چەندین شوێندا ئاماژەی بە مەترسییەکانی ئەو هێزەی تورک کردووە، بە مەترسی گەورەی زانیوە بۆ

---

١. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی(١٩١٨-١٩٣٢)، چ١، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٥٦.

٢. صدیق ساڵح: حکومەتی کوردستان(١٩١٨-١٩٢٤)، چ٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٨٢؛ ئەحمەد تەقی: خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقی دا، چاپخانەی سلمان الاعظمی، بەغدا، ل٦٥.

٣. ئەحمەد تەقی: س.پ، ل٦٥.

سەر ئاسایشی ویلایەتی موسڵ بەگشتی و سلێمانی بەتایبەتی[1].

ئینگلیزەکان بۆئەوەی سنورێک بۆ ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە دابنێن، بەر لە هێنانەوەی شێخ بیریان لە ئەلتەرناتیڤی دیکە کردەوە، بەتایبەتی لە شاری سلێمانیدا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون[2]، ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش داواکاری بۆ گێڕانەوەی شێخ مەحمود زیاتر دەبوو[3]، سلێمانیش لەو ڕۆژانەدا ئەکولا، لایەنگرانی شێخ شایی و ئاهەنگیان تێکدەدا و پەلاماری ئەوانەیان ئەدا کە ئامێری مۆسیقایان بەکارئەهێنا، هەندێک ماڵ و خانیان تالانکرد، بەبیانووی ئەوەی خاوەنی ئەمانە هاوکاری ئینگلیز بوون[4]. کار بەو ڕادەیە گەیشتبوو بەر لە گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی تورکەکان و لایەنگرەکانیان هەڕەشەی گرتنی سلێمانییان ئەکرد[5] و بانگەشەیان بۆ ئەتاتورک و ئۆزدەمیر ئەکرد[6].

ئینگلیز نائومێدبوو لەوەی کە بتوانێ بە داهات و ئیمکانیەتی تایبەتی خۆی تورک لە ڕەواندز و پشدەر و ڕانیە دەرپەڕێنێ بۆ ئەودیو سنوور، بۆیە هاتنە سەر ئەوەی کە شێخ مەحمود بەکاربهێنن[7]، ئەوە لەکاتێکدا قەزاکانی پشدەر و ڕانیە و ڕەواندز بەتەواوی بۆ تورکەکان ساغ ببوویەوە. دواجار بڕیاریاندا شێخ مەحمود بگێڕنەوە بۆ سلێمانی، دوای ئەوەی شێخ گەیشتە بەغدا، ئینگلیزەکان دوو داواکارییان لێی هەبوو، یەکەم سنووری چالاکی سیاسی هەر لەناو سلێمانیدا بێت، دووەم، هەموو تواناکانی بخاتەگەڕ بۆ دوورخستنەوەی مەترسی ئۆزدەمیر و تورکەکان لە ڕەواندز[8]. چونکە ئۆزدەمیر سەرەڕای شەڕی پارتیزانی، تۆڕێکی پەیوەندیشی لەگەڵ ناودارانی کورد لە شارەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکوک و موصڵ و ئاکرێ دروستکردبوو، لەو پەیوەندییانەدا دڵنیای کردبوونەوە، کە تورکیا دەگەڕێتەوە بۆ ویلایەتی موصڵ و بەڵێنی حوکمی زاتی پێدابوون[9].

١. بڕوانە: کورد لە نامەکانی مس بێڵدا، و.محەمەد حەمەساڵح تۆفیق، چ١، چاپخانەی تاران، ٢٠١٦، ل١٦٢-٢٠٦.

٢. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: س.پ، ل ١٥٠.

٣. صدیق صالح: س.پ، ل٨٦.

٤. صدیق صالح: س.پ، ل٨٩.

٥. ڕەفیق حیلمی: یادداشت (کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود)، بەشی دووەم، بەرگی دووەم، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٦، ل٥٨٣.

٦. ئەحمەد خواجە: س.پ، ل٧٦.

٧. صدیق صالح: س.پ، ل٩٥؛ ئەحمەد تەقی: س.پ، ل٦٦؛ د.عوسمان عەلی: چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد، و.کارمەران جەمال بابان زادە، ب٢، چ١، چاپخانەی ڕێنوێ، ٢٠١٠، ل٢٩-٣٠.

٨. صدیق سالح: س.پ، ل.

٩. د.عوسمان عەلی: س.پ، ل٢٢.

هێشتا شێخ له کفری بوو، تورکخواکان و لایەنگرەکانیان، بەگەرمی کەوتنە بڵاوکردنەوەی واتەواتی گەڕانەوەی دەسەڵاتی تورک بۆ سلێمانی و هەڕەشەیان پێ لە نەیارانی تورک دەکرد[١]. تورکخواکان هانی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندییاندا کە هەڕەشە و چەک بەکاربهێنێ بۆ ترساندنی نەیارەکانیان، تەنانەت کەسایەتییەکی وەک مستەفا پاشای یامولکیان گرت و خستییانە زیندانەوە، بەنیازی ئەوەی تەسلیمی ئۆزدەمیری بکەن، دواتر بە هەوڵی کەسایەتییەکانی سلێمانی لە بەندی دەرهێنراو ڕزگارکرا[٢].

ئەو ڕەوشە پاڵی بە ئینگلیزەکانەوەنا کە سلێمانی چۆڵ بکەن، شارەکەیان تەسلیمی شێخ قادری برای شێخ مەحمود و ژمارەیەک لە پیاوماقوڵانی شار کرد(١٩٢٢/٩/٥)، لەولاشەوە شێخ مەحمود دوای جێهیشتنی کنگربان بەرەو سلێمانی بەڕێکەوت، ڕۆژی ١٩٢٢/٩/٣٠ لەنێو ئاپۆڕایەکی گەورەی پێشوازیکردندا بەیاوەری مێجەر نۆئێل گەیشتەوە شاری سلێمانی[٣]. لەمبارەیەوە ئەدۆنز دەڵێت:" ئێوارەی ڕۆژی ١٩٢٢/٩/٢٠ لە بەغداوە بە سواری قیتار چوومە کەرکوک، شێخ مەحمود و نۆئێل لەو قیتارەدا بوون، کاتێک بەیانی ڕۆژی دوایی لە کنگربان، لە چوار مایلی کفری گەیشتینە کۆتایی هێڵی قیتار، سەدان سوارەی عەشایریی کە بۆ پێشوازیکردن هاتبوون، بە دروشمدان و ڕاوەشاندنی ئاڵا شاڵاویان بۆ وێستگەی قیتار هێنا. ئەم جەماوەرە لە دەوری شێخ کۆبوونەوە و کاتی قسەکردنیان بە لیژنەی نوێنەرایەتی ڕەسمی نەدا کە لە سلێمانییەوە بۆ پێشوازیکردن هاتبوو. شێخیان بە شادومانی لە قیتار هێنایە خوارەوە...."[٤]. ڕەفیق حیلمیش دەڵێت:" لە هەموو لایەکی کوردستانەوە پۆل پۆل و دەستە دەستە ئەهالی و عەشایەر بەپێیان و بەسواری ڕێیان گرتبوویەبەر، ڕووە و بەغدا ئەچوون و تا دەوری کفری هەندێکیشیان تا نزیک بەغدا ڕۆیشتبوون..."[٥].

دوای نزیکەی هەفتەیەک لە پشوودان، ڕۆژی ١٩٢٢/١٠/٨ شێخ مەحمود بە فەرمی کاروباری گرتەوە دەست[٦]، دوو ڕۆژ دواتر حکومەتی دووەمی کە لە هەشت وەزارەت

---

١. صدیق صالح: س.پ، ل٩٩.

٢. ئەحمەد خواجە: س.پ، ل٧٦.

٣. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: س.پ، ل١٥٧-١٥٨؛ ڕەفیق حیلمی: س.پ، ل٥٣٧؛ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب٢، لەندەن، ١٩٩١ ، ل٢٨٤-٢٩٩.

٤. کورد تورک عەرەب، و.حامید گەوهەری، چ٣، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر، ل٣٤١.

٥. ڕەفیق حیلمی: س.پ، ل٥٣٧؛ ئەحمەد خواجە: س.پ، ل٧٨؛ د.عوسمان عەلی: س.پ، ل٣١.

٦. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: س.پ، ل١٥٨؛ ئەحمەد خواجە: س.پ، ل٧٨؛ د.عوسمان عەلی: س.پ، ل٣١.

پێکهاتبوو ڕاگەیاند، لە کۆتایی هەمان مانگدا نازناوی مەلیکی کوردستان بۆ خۆی هەڵبژارد[1]. بەڵام ئەم کارانە بەدڵی ئینگلیزەکان نەبوو، ڕاگەیاندنی حکومەت و مەلیکایەتی و هەوڵدان بۆ فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتەکەی و نزیکبوونەوە لە تورکەکان ئینگلیزەکانی بەجارێک تورە و نیگەران کرد. هەوڵەکانی نۆئێلیش بۆ نزیککردنەوەی شێخ و کاربەدەستانی وڵاتەکەی شکستیان هێنا، بۆیە بەیەکجاری سلێمانی جێهێشت و چاپمەن شوێنی گرتەوە.

> بەشێکی زۆری ئەو نزیکبوونەوەی شێخ مەحمود لــــە تــورکەکان پەیوەندی بە پشـــتگوێخستنی داواکارییەکـــانی کـــوردەوە هـــەبوو لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، ئەوە سەرباری هەستە ئاینییەکە

ڕەوتی گۆڕانکارییە ناوخۆییەکان بەتایبەتی ڕێکەوتنی عێراق – بەریتانی ١٩٢٢ و هەلومەرجی نێودەوڵەتی بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە کێشەی ویلایەتی موصڵ و سپاردنی بە کۆمەڵەی گەلان لە بەرژەوەندی بەریتانییەکان بوو، ئەوەش وای لە ئینگلیزەکان کرد دەستیان خاڵی ببێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی شێخ مەحمود و لە ناوبردن حکومەتی دووەمی. بەتایبەت لە بێمتمانەیی خۆیاندا ئاگاداری ئەوەبوون تادێ شێخ لە تورکەکان نزیک دەبێتەوە و هاتوچۆی یەکتر دەکەن. ئینگلیزەکان ئاگاداری ئەوەبوون کە ئۆزدەمیر ناوبەناو فەتاحی ئەمین عەتار و ڕەمزی تۆپاڵ دەنێرێتە سلێمانی بۆ بینینی شێخ مەحمود و هاوکات پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاودەکردەوە، کە دواجار ویلایەتی موصڵ هەر بۆ تورکیا دەبێت. لەلایەکی تریشەوە ئەم دەورە تورکخواکان چواردەوریان گرتبوو و بەتەواوی چووبوونە بنکڵیشەی شێخ، بەشێوەیەک تایەری ئەمین مەسرەف کە سەر کاتبی ملوکانە بوو، لە نۆئێل زیاتر لە سلێمانیدا دەستی دەڕۆیشت[2]. کار بەو ڕادەیە گەیشتبوو تورکخواکان بواریان بە نۆئێل نەدەدا لە شێخ مەحمود نزیک ببێتەوە[3]. لەڕاستیشدا تایەر وەک ڕەفیق حیلمی باسی دەکات نوێنەری ئۆزدەمیر بوو لە دەرباری شێخ مەحموددا،

---

١. ڕەفیق حیلمی: س.پ، ل٥٣٧ ، ٥٥٣؛ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: س.پ ، ل٣٠١-٣٠٢؛ د.عوسمان عەلی: س.پ، ل٣١.

٢. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: س.پ، ل١٦١-١٦٢؛ ڕەفیق حیلمی: س.پ، ل٥٦٣.

٣. ڕەفیق حیلمی: س.پ، ل٥٨٢.

هەر لەبەرئەوەش بوو جارێکی تر تای تەرازوو لە کوردستاندا بەلای تورکدا شکایەوە[١].

دوای ئەوەی شێخ مەحمود لە ئینگلیز نائومێد بوو زیاتر پەیوەندی بە ڕەواندزەوە گرێدا، داوای لە ئۆزدەمیر کرد وەفدێکی خۆی بنێرێتە سلێمانی، تورکخواکان و تایەری ئەمین مەسرەف و فەتاح بەگی ژنبرای، ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە نزیککردنەوەی شێخ و تورکەکاندا. نوێنەرەکانی ئۆزدەمیر بەردەوام نامەیان بۆ شێخ ئەهێنا، ئەویش بە سەید محەمەد موفتی و عەبدوڵڵای حاجی سەعید و مەجیدبەگی حاجی ڕەسوڵ بەگدا وەڵامی بۆ ئەناردنەوە.

شانبەشانی تورکخواکان، دەستەیەکی لاوان هەبوون بڕوای تەواویان بە ئینگلیز هەبوو، جیا لەمانەش، دەستەیەکی کەمی نیشتمانپەروەر هەبوون، بێ پشتیوان و گیانی نەتەوەییان بەهێز بوو[٢]. ڕەفیق حیلمی دەربارەی ئەم سێ دەستە و گرووپە دەڵێت:" تورکخواکان و شاترەکانی تورک لە هاتوچۆدا بوون و دەوری حوکمداریان گرتبوو. شێخ مەحمود واقی وڕمابوو نەیئەزانی ڕووبکاتە کام لا، لەبەر بێ قەراری خەڵک و شێواوی و تێکەڵ و پێکەڵی بیروباوەڕ، ئەویش سەری لێشێوابوو متمانەی بە کەس نەئەکرد. مستەشارێکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەری نەبوو. ئەوانەی کە لەو ڕۆژەدا لە سلێمانی بوون دوانیان پێکەوە نەئەلکان. دەستەیەک لەلاوەکان ئیمانیان بە ئینگلیز هێنابوو، بەلای ئەوانەوە کوردپەوەرەکان و دەستەی تورکخوا شوێن کڵاوی بابردوو ئەکەون. تورکخواکانیش، ئینگلیزخواکانیان بە جاسوور(سیخوڕ) دائەناو نیشتمانپەروەرەکانیان بە(ئالەت)ێکی فریودراوی ئینگلیز ئەهاتە بەرچاو. هەرچی لاوە نیشتمانپەروەرەکانە لەگەڵ ئەوەشا کە زۆر کەم بوون و لە هیچ لایەکەوە پشتیوانیان نەبوو، بەڵام گیانی میللییان ئێجگار بەهێز بوو. زۆربەی دەستەی ئەهالی و ڕەشۆکی، زیاتر بەوانەوە ئەلکاو لێیان نزیک ئەکەوتەوە"[٣].

جێی خۆیەتی کە ئاماژە بەوە بکەین بەشێکی زۆری ئەو نزیکبوونەوەی شێخ مەحمود لە تورکەکان پەیوەندی بە پشتگوێخستنی داواکارییەکانی کوردەوە هەبوو لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، ئەوە سەرباری هەستە ئاینییەکە[٤]، کە فاکتەرێکی دیکە بوو، کەوایکردبوو

١. ڕەفیق حیلمی: س.پ، ل٥٨٣.

٢. صدیق صالح: س.پ، ل٩٩.

٣. ڕەفیق حیلمی: س.پ، ل٥٦٢-٥٦٣؛ عەلادین سەجادی: شۆڕشەکانی کورد وە کورد و کۆماری عێراق، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەتڵەتس، تاران، ٢٠٠٥، ل٩٧.

٤. لەمبارەیەوە ئەحمەد تەقی دەڵێت: گومانی تێدا نییە کە هەستی ئاینی(خیلافەت) و (کافرێتی)ش

کورد هیچ باوەڕێکی بە ئینگلیز نەمێنێت، ژمارەیەکی کەم نەبێت وەک مستەفا پاشای یامولکی و منەوەرەکان. ئەمانەش بە ئاشکرا لە شاری سلێمانی دژایەتی دەکران و دوورخرابوونەوە، تەنانەت ئەو ئەفسەرانەش کە لە بەغدا گەڕابوونەوە و ڕێگەیان پێ نەدەدرا لە دامودەزگاکانی حکومەتەکەی شێخدا وەک پێویست ڕۆڵی خۆیان بگێڕن، ئەم ساردییەش زیاتر تورکخواکان ڕۆڵیان تیادا دەبینی.

ئەو ڕۆژانەش هەتا دەهات ئینگلیز لە شێخ مەحمود دەکەوتنە گومانەوە، ئەم بابەتە تەنها پەیوەست نەبوو بە هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ تورکدا، بەڵکو هەندێک دیاردە و کاروکردەوەی دیکەیان لە سلێمانیدا دەبینی کە نەدەکرا پشتگوێی بخەن، ئەوان چاوەڕوانی ئەوەبوون شێخ محمود پەندی لە سزادان و دوورخستنەوەی چەند ساڵەی وەرگرتبێت[1].

هێشتا مانگێک بەسەر هاتنەوەی شێخدا تێپەر نەببوو کە ئینگلیزەکان هیچ متمانەیەکیان بە ناوبراو نەما، بۆیە لە دەرفەتێک دەگەڕان بۆ بنکۆڵکردنی حکومەتەکەیی و پاشان ڕووخاندنی و دواتریش لکاندنی کوردستان بە عێراقەوە[2]. دوای سەرنەکەوتنی سەرجەم هەوڵەکان بۆ چارەسەری کێشەکانی نێوان شێخ مەحمود و ئینگلیز، ڕۆژی ١٩٢٣/٢/٢٣ ئینگلیزەکان لە ڕێگەی بڵاوکراوەیەکەوە سمکۆی شکاک کە ئەو ڕۆژانە لە سلێمانی بوو ئاگادارکردەوە کە شارەکە چۆڵ بکات، چونکە ئەوان سلێمانی بۆردومان ئەکەن و نایانەوێت زیان بە ئەو بگات[3]، ڕۆژی ١٩٢٣/٣/١یش لە ڕێگەی فڕۆکەوە شێخ مەحمودیان ئاگادارکردەوە کە خۆیی و هێزەکەی لە سلێمانی بڕۆنە دەرەوە، کاتێک شێخ ملی بۆ داواکارییەکەیان نەدا، ڕۆژی ١٩٢٣/٣/٣ بە چڕی کەوتنە بۆردومانکردنی شارەکە، بەوهۆیەوە ژمارەیەک خەڵکی سڤیل کوژران و برینداربوون، دەرئەنجام شێخ ناچاربوو سلێمانی بەرەو ناوچەی سورداش و ئەشکەوتی جاسەنە بەجێبهێڵێت، دوای خۆی ئیدارەی شار لەلایەن شێخ حەمەغەریبی زاوای و کۆمەڵێک خەڵک و کەسایەتی دیکەوە بەڕێوەدەبرا. ئەم ئیدارە کاتییەش زۆری نەخایاند ڕۆژی ١٩٢٣/٥/٢٨ هێزەکانی ئینگلیز گەیشتنەوە شاری سلێمانی و کۆنترۆڵیان کردەوە[4].

---

تارادەیەکی زۆر کاری کردبووە سەر خەڵکەکە بۆ بانگکردن و هێنانی لەشکری تورک بۆ ڕەواندز. (س.پ، ل٥٣؛ د.عوسمانی عەلی: س.پ، ل٢٢)

١. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: س.پ، ل١٦٢-١٦٣.

٢. ە.س ل١٦٤.

٣. عەلادین سەجادی، ل٩٨.

٤. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: س.پ، ل١٦٧-١٦٩؛ عەلادین سەجادی: س.پ، ل٩٩-١٠٠.

باڵادەستی ئەمجارەی دیکەی ئینگلیزەکان زۆر درێژەی نەکێشا، نائارامی ناوچەکە و نەبوونی ئەلتەرناتیڤی شێخ لە سلێمانیدا جارێکی تر ئەوانی لە ١٩٢٣/٦/١٧ ناچار بە چۆڵکردن و جێهێشتنی سلێمانی کردەوە، هاوکات ژمارەیەک لەو خەڵکانەی کە وەک دۆستی ئینگلیز و نەیاری شێخ دەهاتنە ئەژمار لەگەڵ ئینگلیزەکاندا شارەکەیان بەجێهێشت و ڕوویانکردە کەرکوک، بەشێکی زۆر لەمانە لەو ئەفسەرە دڵسۆزانە بوون کە لە ڕیزی سوپاکەی شێخدا بوون، بەڵام لەلایەن جلخوارەکانەوە بەهەموو شێوەیەک دژایەتی دەکران و هەوڵی لەناوبردنیان دەدرا[١]. دوای ڕێکەوتنی لۆزان، ئینگلیزەکان ئیدی کەوتنەوە بیری کۆنترۆڵکردنەوەی سلێمانی و لەناوبردنی حکومەتی سێیەمی شێخ مەحمود، دوای زنجیرەیەک فشار و دواجاریش بۆردومانی خەستی شار سلێمانی ڕۆژی ١٩٢٤/٧/١٦ شێخ مەحمود ناچار کرا کە شارەکە چۆل بکات، سێ ڕۆژ دواتر هێزەکانی بەریتانیا سلێمانییان کۆنترۆڵی کردەوە و بەیەکجاری کۆتاییان بە حوکمڕانی شێخ لە شارەکەدا هێنا[٢].

**باسی دووەم/ ململانێی نێوان تورکخواکان و ئینگلیزخواکان:**

ئینگلیزەکان بەر لە هێنانەوەی شێخ بۆ سلێمانی، پێیان ڕاگەیاندبوو کە نابێت بەبێ پرس لە سلێمانی بچێتە دەرەوە، بەڵام تورکخواکان دەرفەتی هاتنەوەی شێخیان قۆستەوە و پێگەی خۆیان ئێجگار بەهێز کرد. ئەمانە سودیان لە پیاوە ئایینی و خەڵکە دواکەوتووەکەش وەرگرتبوو بۆ هەرچی زیاتر پاڵپشتی خۆیان و لەو ڕێگەیەشەوە تەنگیان بە ئینگلیزخواکان و ئەو ڕووناکبیر و نیشتماپەرەوانە لێژکردبوو کە بڕوایان نە بە تورک و نە بە ئینگلیز هەبوو. ململانێی باوی ئەو سەردەمەش کێشمەکێشمی نێوان ئەو دوو دەستە و گرووپە بوو، بێ ئەوەی ئاماژە بەناوی هیچ گرووپ و ڕێکخراوێکی تایبەت بەم دوو دەستەیە بکرێت. تورکخواکان نەک هەر داوای سەربەخۆییان نەدەکرد، بەڵکو ئەوەی باسی نیشتمانپەروەریشی بکردایە بەدوژمنیان دەزانی و هەڕەشەیان لێ دەکرد. ململانێی نێوان ئەم دوو دەستەیە، واتە تورکخواکان و نیشتماپەروەران، هەر لەڕووی سیاسییەوە نەبوو، بەڵکو ئاینیش بوو، بەوپێیەی تورکخواکان مەلا و پیاوە ئاینییە دواکەوتووەکانیشیان بە پشتوانی خۆیان دەزانی، هەربۆیە ئەگەر ئەو ڕۆژگارە باسی زانست و پێشکەوتنی بکردایە، بە کافر لەقەڵەم دەدراو دەکەوتنە دژایەتیکردنی.

---

١. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: س.پ، ل١٦٩.

٢. ه.س، ل١٧٤-١٧٥.

سەردەمی دووەمین حکومەتی شێخ مەحمود، سەردەمی بەهێزبوونی تورکخواکان بوو، پلەوپایەی بەرزیان لەنێو دامودەزگاکاندا هەبوو، کاریگەرییان زۆر بوو، شێخ مەحمودیش لەو نێوانەدا نەیدەزانی چی بکات و خۆی بۆ یەکلایی نەدەکرایەوە، ئینگلیزەکان هیچ بەڵێنێکیان پێ نەدەدا، تورکخواکانیش لەو ڕۆژانەدا دەسەڵاتیان هەبوو، شێخ نەیدەتوانی هەروا دەستبەرداریان ببێت و دووریان بخاتەوە، چونکە هێشتا دەمارگیری ئاینیی و پەیوەندی کۆنینەی کورد و عوسمانی و خەلافەتی ئیسلامی و پاشماوەکانی مابوو، ئەمانەش جڵەوی خەڵکی ساویلکەیان بەدەستەوە بوو، ژمارەشیان کەم نەبوو، بۆیە شێخ مەحمود هەروا بە ئاسانی نەیدەتوانی لە داوی ئەمانە قوتاری ببێت و کەوتبووە ژێر کاریگەرییانەوە.

لە بەرامبەردا کەسێکی وەک مستەفا پاشای یاملکی کە وەزیری مەعاریفی حکومەتەکەی بوو[١]، لەماڵەکەی خۆیدا دەستبەرسەر کرابوو، شێخ ئامادە نەبوو گوێی لێبگریت. هەر ئەو ڕۆژانە بوو بۆ چاوترساندنی نیشتمانپەروەران و ڕووناکبیران، کەسایەتییەکی وەک جەمال عیرفان(١٢-١٣/١٢/١٩٢٢) لە ماڵەکەی خۆیدا تیرۆرکرا. ئەوەش بووبە یەکەمین تیرۆری سیاسی کە لە سلێمانیدا ڕوویدابێت. ئەگەرچی قسەی زۆر دەربارەی بکوژانی دەکرێت، بەڵام بۆچوونی باو ئەوە بوو کە تورکخواکان بەو کارە هەستاون[٢]. کێشەکە ساغ نەبوویەوە و بکوژانی نەدۆزرانەوە و سزا نەدران، ئەوەش کەم و زۆر ترسی خستە دڵی منەوەرانی شارەوە[٣]. ڕەفیق حیلمی لەبارەی بارودۆخی ئەو ڕۆژانە و کوشتنی جەمال عیرفانەوە دەڵێت:" لەناو شاردا لەو ڕۆژانەدا دەنگێکی سامناک بڵاوکرایەوە، دەیانگووت بەفیت و هاندانی دەستەی ئۆزدەمیر، بڕیاری ئەوە دراوە کە دۆستەکانی ئینگلیز و لاوەکانی نیشتمانپەروەری کورد بکوژرێن و لەناوببرێن. جەمال عیرفانیش لەم ڕۆژانەدا کوژرا، لەبەرئەوە دەنگەکە کارێکی زۆری کردبووە سەر بیری خەڵک، پیاوەکانی ئینگلیز لە کون نەئەهاتنە دەرەوە، لاوە نیشتمانپەروەرەکانیش ترسیان لەوان کەمتر نەبوو"[٤].

ڕوونتر بڵێین، ڕووداوەکە کاریگەری گەورەی لەسەر دەروونی ڕووناکبیران و نیشتمانپەروەران بەتایبەتی خەڵکی شاری سلێمانی بەگشتی دانا، بەشێوەیەک هەتا

١. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: س.پ، ل١٩٣-١٩٥.

٢. ه.س، ل١٩٦؛ صدیق صالح: س.پ، ل١٢٢-١٢٣؛ ڕەفیق حیلمی: س.پ، ل٥٩٢.

٣. صدیق صالح: س.پ، ل١٢٢؛ ڕەفیق حیلمی: س.پ، ل٥٩٢.

٤. ڕەفیق حیلمی: س.پ، ل٥٩٢؛ محەمەد ڕەسوڵ هاوار: س.پ، ل٢٩١.

ماوەیەکی زۆر دوای ڕووداوەکە بابەتی مشتومڕی نێو خەڵکی بوو، لێرە بەدواوە ڕووناکبیرانی سلێمانی ترسێکی زۆریان هەبوو کە هەمان چارەنووس ڕووبەڕووی ئەوان بکرێتەوە. پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین، ئەو خەڵکانەی کە بە دەستەی ئینگلیزخواکان ئەناسران، ناکرێت بە خائین و بەکرێگیراو لەقەڵەمبدرێن، ئەوانەیان نەبێت کە سیخوڕ و دەستوپێوەند بوون، چونکە ئەو قۆناغە بەشێکی زۆری ئەوانەی بە پیاوی ئینگلیز لەقەڵەمدەدران بریتی بوون لەو خەڵکانەی کە دەیانویست شێخ لە تورکەکان دووربخەنەوە و ڕابردووی دەسەڵاتی تورکیان بیر دەخستەوە، ئەوانە پێیانوابوو هەتا شوێن پێ قایمکردن دەبێت کورد پشت بە ئینگلیز ببەستێت و هاوشانی ئەو هەنگاو بنێت و بەپێی هەلومەرجی دونیا هەڵسوکەوت بکات، بەڵام تورکخواکان لەلای شێخ بەهەموو شێوەیەک دژایەتی ئەمانەیان دەکرد، هەرچەندە ئەوانەی سەر بە ئینگلیز بوون بیروڕایان هەرچی بووبێت[1] لەچوارچێوەی کوردایەتی نەچووبوونە دەرەوە، بەڵکو پێیانوابوو دەبێ هەموو شتێک لەپێناوی چاکەی کوردبێ.

دواجار بە نەمانی دەسەڵاتی شێخ مەحمود و دەرپەڕاندنی ئۆزدەمیر لە ڕەواندز، کار و چالاکی تورکخواکان ڕوویان لە کزی کرد و ئەو ڕۆڵەی جارانیان نەما. سەرباری ئەوانەش لە سەردەمی سێیەمین حکومەتی شێخدا هێشتا ئەو دابەشبوونە سیاسییە هەر مابوو، تەنانەت هەتا کێشەی ویلایەتی موصڵ یەکلایی بوویەوە، ژمارەیەک لە ڕووناکبیران چاویان لە بەریتانیا بوو، کورد ڕزگار بکات. دوای یەکلابوونەوەی کێشەی ویلایەتی موصڵ و دەرکەوتنی ڕووی ڕاستەقینەی ئینگلیزەکان، ڕەوتی نیشتمانپەروەری سەری دەرهێنایەوە و جموجوڵی کوردایەتی بە گڕوتینی نوێوە هاتەوە مەیدان[2].

---

١. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: س.پ، ل١٩٧.

٢. ه.س، ل١٩٨.

# ئەنجام

دوای ڕووخانی حکومەتی یەکەمی شێخ مەحمود و دوورخستنەی ناوبراو بۆ هیندستان ئاڵۆزی تەواوی ناوچەکانی کوردستان گرتەوە، بەشێوەیەک هەر ڕۆژەی لە ناوچەیەک ڕاپەڕین هەڵدەگیرسا و ڕووبەڕوونەوەی چەکداری دژ بە ئینگلیزەکان و سیاسەتەکانیان بەرپا ئەبوو، ئینگلیزەکان لای خۆیانەوە میکانیزمی جۆراو جۆریان بەکارهێنا بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕەوشەکە، بەڵام بێ سوود بوو، لەولاشەوە هاتنی تورکەکان بۆ ڕەواندز هێندەی دیکە بارودۆخەکەی ئاڵۆزکرد لێیان، ئینگلیزەکان ترسی ئەوەیان هەبوو بارودۆخەکە لە کۆنترۆڵ دەربچێت و تورکەکان دوای سەرکەوتنیان بەسەر یۆنانییەکاندا ئیدی بەفیعلی بیر لە گێڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بکەنەوە، ناردنی ئۆزدەمیریشیان هەر لەوچوارچیوەیەدا دەبینی، بۆیە دوای سەرنەکەوتنی سەرجەم هەوڵەکانیان بیریان لە گێڕانەوەی شێخ مەحمود کردەوە بۆ سلێمانی، ئەو ڕۆژانە ململانێی هەردوو گرووپ یاخود دەستەی ئینگلیزخواکان و تورکخواکان تادەهات توندوتیژی زیاتری بەخۆیەوە ئەدی، هەردوولا شیر و تیریان لە یەک ئەسوی، کاتێکیش کە شێخ گەڕایەوە بۆ سلێمانی ململانێکان پێیان نایە قۆناغێکی نوێوە، ئەڵبەت وەک لە ناوەڕۆکدا ئاماژەمان بۆ کردووە بەحوکمی کۆمەڵێک فاکتەر ڕەوشەکە لە بەرژەوەندی تورکخواکان بوو، تا ئەو ڕادەیەی هەڕەشەی گرتن و کوشتنی نەیارەکانیان لە ئینگلیزخواکان ئەکرد. هەروەک توانیبوویان کۆنترۆڵی شێخ و تەواوی دامودەزگاکانی حکومەتەکەی بکەن و بیخەنە ژێر هەژموونی خۆیانەوە و لە دژی نەیارەکانیان بەکاری بهێنن.

ململانێی نێوان ئەم چینانە و سیاسەتی هەڵەی تورکخواکان شێخیان تووشی سەرئێشەی زۆر و هەڵەی کوشندە کرد، چونکە ئینگلیزەکان هەروا بەئاسانی بابەتی هاتنی تورکەکان و گرێدانی پەیوەندییان لەگەڵ شێخ مەحمود بۆ قوت نەدەدرا، بۆیە کەوتنە خۆیان و دوای یەکلایی کردنەوەی کۆمەڵێک کێشە و گرفت لە بەرژەوەندی خۆیان وەک بابەتی کێشەی ویلایەتی موسڵ و پەیمانی عێراقی بەریتانی ١٩٢٢ ئیدی هەموو هەوڵەکانیان تەرخانکرد بۆ لەناوبردن و ڕووخانی حکومەتەکەی شێخ مەحمود، دوای زنجیرەیەک شەڕ و ئاڵۆزی سەرئەنجام توانیان کێشەکە لە بەرژەوەندی خۆیان کۆتایی پێ بهێنن و شێخ مەحمود بەیەکجاری لە سلێمانی دووربخەوە، بەگەڕانەوەی ئینگلیزەکان و گۆڕانکارییە ناوخۆیی و هەرێمی و نێودەوڵەتییەکان ئیدی شتێک نەما بەناوی تورکخواکان و کۆتاییان پێهات.



نوسینی: عالمه رنگریز
وەرگێڕانی لە فارسییەوە: ئەرکان ئەحمەد جاف

# پێگە (گرنگی) یادداشتەکان لە نووسینەوەی مێژوودا

پێشەکی:

یەکێك لە پرسە نوێ و دیارەکان لەڕێبازی نوێی لێکۆڵینەوەی مێژووییدا، بریتییە لە ئاست و ڕادەی باوەڕپێکراویی و ڕۆڵی یادداشت و مێژووی زارەکی لە لێکۆڵینەوە زانستییە مێژوییەکاندا. شێوازی سودوەرگرتنی مێژوونوسان لە سەرچاوە مێژووییە زارەکی و نەنوسراوەکان لە نوسینەوەی مێژووی نێوچەیی و گشتییەکاندا، بەردەوام مایەی گفتوگۆ ڕاجیاوازی بووە لە نێوان شارەزایان و مێژوونووسانی ئەو بوارە. هەندێك لە مێژوونووسان، بەتەواوی ڕەتیدەکەنەوە کە یادداشتە تاکەکەسییەکان بکرێنە سەرچاوەیەك بۆ نوسینەوەی مێژوو. هەندێکی دیکە لە مێژوونووسان، ئەم سەرچاوانەیان کاتێك لا پەسەندە کە بەسەرچاوەی نوسراو پشتڕاست کرابنەوە، لەبەرئەوە هیچ گرنگیی و تایبەتمەندییەکی دیکەی بۆ ڕەوا نابینن.

بەڵام لەم چەند دەیەی دواییدا، مێژووی زارەکی و نوسینەوەی یادداشت، پێگە و گرنگییەکی زۆری لە ناوەندکانی توێژینەوە و زانکۆکاندا پەیداکردووە، بەو واتایەی کە لە ئێستادا و لە دارشتنەوەی سەرچاوەکان و ڕێبازی نوێی لێکۆڵینەوە و نوسینەوەی مێژوو، یان تەنانەت بۆ ڕەخنەگرتن و دووبارە خوێندنەوە یان لێکۆڵینەوە لە سەرچاوە مێژوییەکانی دیکە، گرنگی تایبەتی بە مێژووی زارەکی دەدرێت و بەشێوەیەکی فراوان سودی لێ وەردەگیردرێت. لەڕوانگەی ئەوەشی کە، ئەم وەرزنامەیە (خاطرات سیاسی/ یادداشتی سیاسی) لەم ژمارەیەدا گرنگی داوە بە ئەم بابەتە، ئەم توێژینەوەیە دەتوانێت دەروازەیەک بێت بۆ خستنەڕووی پێشنیاز و پلانی قوڵتر و جدیتر لەم بابەتەدا و دەوڵەمەندترکردنی ئەدەبیاتی مێژووی زارەکی و نوسینەوەی یادداشت. لەڕاستیدا، بابەتێکی گرنگی وەک نووسینەوەی یادداشت، بەتایبەت لەنێو پیاوانی سیاسی ئێرانیدا، گرنگی پێویستی پێنەدراوە و جگەلە ژمارەیەکی کەم نەبێت، ئەوانی دیکە نوسینێکی تیروتەسەلی یادداشتیان لەدوای خویان بە جێنەهێشتووە.

## یادداشت نووسی چییە؟

چەمکی یادداشت لە فەرهەنگی دەهخودا دا واتاکراوە بەوەی کە: ڕوداوگەلێکە کە بەسەر کەسێکدا هاتبێت و یادەوەرییەکی لە خەیاڵدانی ئەوکەسەدا بەجێهێشتبێت. ڕابردووەکانی مرڤ. ڕووداوێکی ڕابردووە کە کەسێک دیبێتی یان بیستبێتی. بینراو یان بیستراوەکانی ڕابردوو. بەسەرنجدان لەو بۆچوونە جیاوازانەی کە لەبارەی یادداشت نووسینەوە بوونی هەیە، لێرەدا سێ پێناسە و شیکردنەوەی جیاواز دەخەینە ڕوو.

ئەلف: نووسینەوەی یادداشت، نوسینەوەی ڕوداوگەلێکە کە یادداشتنووس لە ڕوودانی ئەو ڕووداوانەدا بەشدار بووە. لەم جۆرە یادداشتەدا، بابەت و ناوەڕۆکی نوسینەکە بریتییە لە: باسی خەڵکانی دیکە، تیایدا هۆکار و ڕووداوە لاوەکییەکان و ڕۆڵی خودی یادداشتنووسەکە کەمتر ڕەنگدەداتەوە. لەبەرئەوە، باسی نوسەر و کارەکانی نوسەر لە نوسینەوەی یادداشتەکەدا، ڕۆڵێکی لاوەکییان هەیە، لەڕووی ڕواڵەتییەوە، ئەم جۆرە نوسینەوەیە زیاتر لە ڕاپۆرتنووسی یان گێڕانەوەی ڕووداوەکانەوە نزیک دەبێتەوە. نمونەی ئەم جۆرە یادداشتەش وەک یاداشتی: حسین فردوست: ظهور و سقوط سلطنت پهلوی.

ب: نووسینەوەی یادداشت: نووسینی سەردەم و ڕوداوێکە کە لەکاتێکی دیاریکراوی ژیانی نووسەردا ڕوویداوە، ناوەڕۆکی سەرەکی لەم شێوەیەی یادداشتدا بریتییە لە: نوسینەوەی ڕۆڵ، بۆچوون، کردار و قسەی نووسەر لەسەر ڕووداوەکان بەشێوەیەکی ڕوون و وردەکاری نوسراوە. هۆکار، کاریگەریی و ڕووداوە دەرەکییەکان بە بەراورد بە ناوەڕۆکی یادداشتەکە، ڕۆڵێکی لاوەکییان هەیە. ئەم شێوە یادداشتانە بە (شەرحی حاڵ) ناودەبر]ن و تیایاندا نوسەر باس لە ڕووداوە دیار و کاریگەرەکانی ڕۆژانی ڕابردووی ژیانی

خۆی دەکات. نمونەی ئەم جۆرە یادداشتانەش وەک یادداشتی: محمد علی اسلامی: روزها.

ج: نووسینەوەی یادداشت: نووسینەوەی ژیان و کارەکانی نووسەر، هەروەها نووسینەوەی ڕووداوەکان، هۆکار، ڕووداوە لاوەکییەکان و باسکردنی ژیان و کاریگەری کەسانی دیکەیە. دەتوانرێت بگوترێت کە تێکەڵکردنی هەردوو جۆری نوسینەوەی یادداشتە، ئەمەش نمونەی باڵای یادداشت نوسینە. لەبەرئەوە، یادداشتنووس بەسودوەرگرتن لەوەی کە بیستوویەتی و بینیویەتی، ڕۆڵی خۆی، هۆکار و ڕووداوە دەرکییەکان تێکەڵ دەکات و یادداشتەکانی خۆی دەنوسێتەوە. نمونەی ئەم جۆرە یاداشتانەش، وەک یادداشتی: محسن نجات حسینی: بر فراز خلیج فارس.

**مێژوونووسی:**

مێژوونووسی (Historiography) بەواتای وەسف و تۆمارکردنی لایەنە جیاوازەکانی ژیان و بارودۆخی مرۆڤە لەڕووی سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە. بەپێی پێناسەیەکی دیکە، مێژووی مێژوو، نەخشەی مێژوو یان چەمک ناسییەکە کە چۆنیەتی بەدەستهێنان یان گواستنەوەی زانیاری ڕابردوو لەخۆی دەگرێت. بەشێوەیەکی فەرمی، مێژونووسی یان نووسینەوەی مێژوو یان پەیڕەوکردنی ڕێبازە مێژووییەکان پشتبەستووە بە نووسەر، سەرچاوە، لێکدانەوەکان، ڕێبازەکانی لێکۆڵینەوە و ئامانجەکانی خوێنەرەوە.

**پێشینە و مێژووی یادداشتنووسی لە ئێران:**

نووسینەوەی یادداشت، لە واتا فراوانەکەیدا وابەستەی هیچ جۆرێک لە ڕێبازە ئەدەبییەکان نییە. ئەو هەلە بە نووسەری یادداشت دەدرێت کە سود لە هەر ڕێبازێک ببینێت کە لەگەڵ هەست، سەلیقە و دەروونی نوسەردا دەگونجێت و خودی یادداشتنووس شارەزایی تێیدا هەیە بۆ نووسینەوەی ئەو شتانەی کە دیویەتی یان بیستوویەتی. هەربۆیە بە زەحمەت دەتوانرێت کە لە ڕابردوودا لایەنێک و ڕێبازێکی ئەدەبی پەیدا بکرێت کە لە نوسینەوەی یادداشتەکاندا سودیان لێ وەرنەگیرابێت. هەربۆیە، دەکرێت مێژووی یادداشت نوسینەوە لە ئێراندا، لە لابەلای تۆمارە بەردینەییەکانی پاشاکانی هەخامنشینی و ساسانی، وێنە ڕووداوەکانی سەر دەرگای کۆشکی پاشاکان، ڕۆژنامەی یادداشتەکانی ئەهلی دیوان و گەنجینەی فراوانی ئەدەبیاتی فارسی چاوی بۆ بگێڕدرێت.

گرنگترین تایبەتمەندی یادداشت نووسین و بەتایبەت یادداشتی تایبەتی، ئامادەبوونی خودی نوسەرە لەنێو تەواوی بابەتەکانی نێو یادداشتەکەدا، چ وەک کارەکتەری سەرەکی نێو ڕووداوەکان، یان وەک بینەرێکی ڕووداوەکان یان وەک گێڕەوەی بیرەوەری کەسانی دیکە. هەربۆیە، لەم ڕووەوە وا دەردەکەوێت کە یادداشت گێڕانەوەی داستانگەلێکە کە نوسەرەکەی (کەسی یەکەمی تاک) بێت. ئەگەر چاوێک بە ئەدەبیاتی فراوانی پارسی وەک چیرۆک و

پەخشاندا بگێڕین، بەڕوونی ئەوە دەبینین کە لەو سەردەمەدا، داستاننووسی بە ڕاناوی کەسی یەکەمی تاک، زۆر ڕەواجی نەبووە. هەرچەند شێوازی یادداشتنووسی پاشاکانی هەخامنشینی و ساسانیش کە لە تۆمارە بەردینەکاندا پارێزراون، بە ڕاناوی من (کەسی یەکەمی تاک) دەستپێدەکەن. لە سەردەمی ئیسلامدا، ئەم جۆرە تاڕادەیەک کەم دەبێتەوە و یادداشت نووسین شوێنی خۆی دەداتە مێژوونووسی و تیایدا مێژوونووسە دەرباریییەکان خۆیان لە پشتی ڕووداوەکانەوە دەشارنەوە و لە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی کە بینیویانە، زیاتر ڕاناوی ئەو (کەسی سێیەمی تاک) بەکاردەهێنن. لەگەڵ ئەوانەشدا، چەند بەرهەمێکی دەگمەن و نایاب لە یادداشتە تاکەکەسییەکان هەن کە نوسەرەکانیان باسیان لەخۆیان کردووە و یادداشتنووسەکان خۆیان قسە دەکەن و ڕووداوەکان بە ڕاناوی کەسی یەکەمی تاک دەگێڕنەوە. هەروەها هەندێک بەش لە نوسراوە مێژووییەکان یان ژمارەیەک نوسراوی کورتی لەم شێوەیە بە یادگاری بەجێماون، کە لەڕووی مێژووی یادداشت نوسینەوە، شیاوی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونن.

**ڕووداونووسی:**

ڕوداوونوسی یان تۆماری ساڵانەی ڕووداوە مێژووییەکان بە ڕیز و بەپێی کات و ڕۆژی ڕوودانیان، جۆرێکی تایبەت و ئاسانی مێژوونووسی و یادداشتنووسی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئێران، وڵاتانی ئیسلامی، شارستانییەتە ئاسیاییەکان و تەنانەت وڵاتانی ئەورووپاش بووە.

لە ڕووداونووسیدا، ڕووداوە زۆر گرنگەکان بەشێوەیەک تۆمار دەکرێن و دەنوسرێنەوە، کە تیایدا نوسەر بەشێوەیەکی گشتی خۆی دەخاتە پشتی ڕووداوەکانەوە و ئەوپەڕی هەوڵدەدات کە ئەوەندەی بۆی دەکرێت، نووسینەکەی بەشێوەیەکی دوور لە تاکەکەسی بخاتە ڕوو. هەربۆیە، لەم جۆرە نوسینانەدا، بەدەگمەن ڕۆڵ و ئامادەبوونی کەسایەتی ڕووداونووس لەنێو ڕوداوەکاندا هەستی پێدەکرێت و دەبینرێت. سەرەنجام، ڕووداونووسی زیاتر لە جۆرەکانی یادداشتنووسی، لە مێژوونوسییەوە نزیک دەبێتەوە.

ڕووداونووسی لە ئەدەبیاتی فارسیدا، لە سەدەکانی چوارەم و پێنجەمەوە لە شێوەی مێژوونووسی گشتی و نێوچەیی و مێژووی بنەماڵەکان دەستپێکردووە.

ڕووداونووسی لە ئەدەبیاتی فارسیدا و بەشێوەیەکی تایبەتی بە سێ بەرهەمی نایاب لە سەدەی پێنجەمدا دەستپێدەکات، بەڵام بەداخەوە بە هەمان چۆنیەتی نایابەوە بەردەوام نابێت. بەرهەمەکانیش بریتین لە:

یەکەم/ نوسینی زانای گەورە، ئەبو ڕەیحانی بیرونی: اخبار خوارزم کە دوای ساڵی ٤٠٨ نوسراوە. دووەم/ بەرهەمی مێژوونووسی گەورەی ئێرانی، ابوالفضل محمد بن حسین کاتب بیهقی: تاریخ بیهقی، کە لە سەدەی پێنجەم نوسراوە.

سێیەم/ بەرهەمی یەکێک لە شاعیر، پەخشاننووس و فەیلەسوفی ناوداری ئێرانی،

ناصر خسرو قبادیانی مروزی: سفرنامه ناصر خسرو، ساڵانی ٤٣٧- ٤٤٢.

گرنگترین تایبەتمەندی ئەم بەرهەمانە کە لە ڕووداونووسی ڕووتەوە دەیانگۆڕیت بۆ یادداشتنووسی، ئامادەیی تەواوی خودی نوسەرەکانە لەو ڕووداوانەی کە باسیان لێوە کردووە. تایبەتمەندییەکی دیکە هەرسێ بەرهەمەکە، وردی لە تۆمار و سەرنجی ڕوون و ئەمانەتپارێزی نووسەرەکانە لە تۆمارکردنی ڕووداوەکاندا بەتایبەت لە تۆمارکردنی گێڕانەوە کۆمەڵایەتیی و کەلتوورییەکاندا.

مێژوونووسی لە سەردەمی مەغۆل (سەدەی حەوت و هەشت)، بەهەمان شێوەی مێژوونووسانی دەرباری، ڕەواجێکی زۆر پەیدا دەکات. دەسپێکی ئەم کارەش نوسینەکەی، عطاملک جوینی: تاریخ جهانگشای، بوو. ڕووداونووسی و مێژوونووسی دەرباری کە لە کۆتاییەکانی مەغۆلەوە ڕووی لە پاشاکشە بوو، دیسانەوە لە سەردەمی تەیمورییەکان لە سەدەی نۆیەم، ڕەواج پەیدا دەکاتەوە. لە ڕووداونووسە گرنگەکانی ئەم سەردەمەش، دەتوانرێت ناوی (ظفرنامە نظام الدین شاهی و ظفرنامە شرف الدین علی یزدی) ببرێت.

**گرنگترین تایبەتمەندی یادداشت نووسین و بە تایبەت یادداشتی تایبەتی، ئامادەبوونی خودی نووسەرە لەنێو تەواوی بابەتەکانی نێو یادداشتەکەدا.**

لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی سەفەوی لە سەدەکانی دەیەم و یانزەیەمی کۆچی، دیسانەوە ڕووداونووسی دەرباری ڕەواج و ڕەونەقێکی نوێ دەگرێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی چەند بەرهەمێکی ڕووداونووسی لە سەردەمەکانی شا ئیسماعیل، شا تەهماسب، شا عەباسی یەکەم و شا عەباسی دووەم نوسراون وەک: نوسەرێکی نەناسراو: عالم ارای شا اسماعیل. حسن روملو: احسن التواریخ، کە باس لە ڕووداوەکانی سەردەمی شا ئیسماعیل و شا تەهماسب و زانایانی ناودار و وەزیرەکانیان دەکات. اسکندربیک ترکمان: تاریخ عالم ارای عباسی، لە ساڵی ١٠٢٥ کە بە گرنگترین ڕووداونووسی سەردەمی پاشایەتی شا عەباسی یەکەمی سەفەوی دادەنرێت، گرنگی تایبەتی نوسینەکەی اسکندربیک ئەوەیە کە خودی نووسەر، سکرتێری خودی شاعەباس بووە و بینەر و چاودێری زۆرێک لە ڕووداوەکانی سەردەمی شا عەباسی یەکەم بووە و هەوڵی زۆری داوە کە لە نووسینەکانیدا و لە گواستنەوە و گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا، تا ئەو ڕادەیەی

که پێچەوانەی تەبع و سەلیقەی شا عەباس نەبێت، وردیی و ئەمانەتپارێزی ڕەچاو بکات.
تێکەڵبوون و ئاشنایی سیاسی، ئابووریی و کەلتووری لە نێوان ئێران و وڵاتانی بەهێزی ئەورووپی، کاریگەری زۆری لە کۆمەڵگەی ئێرانی لە سەردەمی دەسەڵاتدارییەتی قاجارییەکاندا هەبووە. ئاشنابوون بە شێوازی نوێی مێژوونووسی و کەنارخستنی شێوازەکانی ڕووداونووسی و مێژوونووسی ئێرانی، یەکێک بووە لە گرنگترین دەستکەوتەکانی ئەم ئاشنایەتییە.
یادداشنووسی نوێ، پشتبەست بە هوشیاری لەبارەی (من)ی تاک و بە ناوەڕۆک (کۆ)، یەکێکە لە شێوازەکانی تایبەت بەم سەردەمە کە لە ناوەڕاستی سەردەمی ناصری (ناسرەدین شای قاجار) لەژێر کاریگەری ڕاستەوخۆی هزر و ڕواڵەتی ئەورووپی دەردەکەوێت و لە ماوەی سەردەمی دەسەڵاتی ئەم بنەماڵەیەدا و بەتایبەت لەکاتی سەرهەڵدانی شۆڕشی مەشروتەخوازی، فراوان دەبێت و گۆڕانکارییەکی گەورە بەخۆیەوە دەبینێت. ئەم ئاشنایەتییە لەگەڵ شێوازی نوێی یادداشتنووسی و ڕەخنەگرتن لە شێوازی مێژوونووسی کۆنی ئێرانی، دەستکەوتی گۆڕانکاری هزریی و گۆڕانکاری لە دونیابینی و ئاسۆی هزری ئێرانییەکان لەبارەی باوەڕ و بنەما ئیمانییە کلاسیکییەکان بوو کە هەژموونی فراوانی لەسەر سیستەمی هزری ئێرانییەکاندا هەبوو. دەرکەوتنی یادداشتنووسی و ڕووداونووسی ڕۆژانە، بە پشتبەستوو بە منی تاک و کۆ (هوشیاری نەتەوەیی) – وەک شێوازێکی نوێ لە مێژوونووسیدا بەشێوەیەکی شاراوە و نا فەرمی، و ڕەخنەگرتن لە شێوازی پێشوو لە تۆمارکردنی ڕووداوەکاندا کە جۆرێک لە مێژوونووسی دەرباریی و ساختە بوو، دەبێت لەم ئاڕاستەی گۆڕانکارییەدا هەژمار بکرێت. یادداشتە پەرت و بڵاو و ناتەواوەکانی پیاوانی سیاسیی و ناوداری مێژووی ئێرانی دوای هاتنی ئیسلام بۆ ئەو وڵاتە، لایەنی جیاوازیان هەیە کە لەوانەیە بتوانرێت دابەش بکرێت بەسەر دوو بابەتی ئەدەبی و سیاسی.
یادداشتنووسی سیاسی، جۆری بنەڕەتی یادداشتنووسییە لە ئێران. لەکاتێکدا کە یادداشتنووسی ئەدەبی و کەلتووری، بنەڕەتی یادداشتنووسی ڕۆژئاوایە. بەو بەڵگەیەی کە، یادداشتەکانی ڕۆژئاواییەکان زیاتر لە ڕووی ڕەخنەی ئەدەبییەوە جێگای سەرنجن و یادداشتی ئێرانییەکان زیاتر لە بابەتی مێژوونوسیدا جێگای بایەخن. یادداشت یان نوسینەکانی پیاوانی سیاسی، سەرچاوەیەکی باشن بۆ شارەزابوون لە ڕووداوە سیاسیەکانی ئەو سەردەمانەی خۆیان.

### ڕۆڵی یادداشت لە نوسینەوەی مێژوودا:

یەکێک لە گرنگییە بنەڕەتییەکانی یادداشت، تۆمارکردنی بابەتگەلێکە کە لەوانەیە بۆ جیلی داهاتوو گرنگ بێت. یادداشتەکان کە لە هەر سەردەمێکدا دەنووسرێن، بەڕوونکەرەوە و نیشاندەری بارودۆخی کۆمەلایەتی، کەلتووریی و سیاسی... هتد، ئەو سەردەمە دادەنرێن.

سەرباری ئەوەش، یادداشتنووسی بۆ خۆی جۆرێکە لە فێرکردن. فێرکارێکی ئەزموونییە کە خوێنەر بەئاسانی دەتوانێت پەندی لێ وەربگرێت. ئەم تایبەتمەندییەش، لەگەڵ ئەوەی کە یادداشت دەکاتە گەنجینەیەکی گەورە و فراوان، هەندێکجاریش دەیخاتە سەرووی هۆنراوە و داستانەوە. بەوەش یادداشت لە گەنجینەیەکی پەراوێزخراو دەردەهێنێت و ڕۆڵێکی فێرکاری پێدەبەخشێت.

یادداشت، بەهۆی ئەو پەیوەندییە دەروونییەی کە لەگەڵ خوێنەردا پەیدای دەکات، واتە پانتایی یادداشت لە نوسەرەوە تا خوێنەر، تێگەیشتن و تێڕوانینی جیاواز دروست دەکات. یادداشت، گواستنەوەی پاشخانی هزریی و ئەزموونی کەسێکە بۆ کەسێکی دیکە و تەنها یادداشتە کە هەستی تێپەڕینی کات، جیاوازی کات یان قوڵایی کات دەخاتە بەرچاوی ئێمە. بەشێوەیەکی گشتی، یادداشت تاکەکەسییە. گێرانەوەی ئەو یادداشتنانەی کە تاکەکەسین، بەڵام لە بابەتێک یان چەند بابەتێکیدا هاوبەشن، ئەوا لە تایبەتمەندی تاکەکەسییەوە دەیهێنێتە دەرەوە و دەیکاتە یاداشتێکی کۆمەڵی. بە نووسینەوەی یادداشتەکان، یەکەم ئەڵقەی پەیوەندی نێوان یادداشتی تاکەکەسی و کۆمەڵی پەیدا دەبێت.

تاکەکەسی بوون، یان تایبەتمەندی تاکەکەسی بوون، چەمکێکی نوێیە کە لە پانتایی کۆمەڵگەی نوێدا پەیدا دەبێت. گەیشتن بە دیاردەی من (کەسی یەکەمی تاک) لە جۆری مۆدێرنەییدا، دەرەنجامی تێپەڕینی پرۆسەیەکی دورودرێژ و پرکێشە و بەبۆچوونی زۆرێکیش، پرۆسەیەکی تەواو تایبەتی نێو دونیای ڕۆژئاوایە، پرۆسەیەک کە لە پێشینەی چەمکەکانی یەهودیی و مەسیحی، ناسین و شارەزاییەکی دروستی لە کەلتوری فەلسەفی یۆنانی و، هەروەها شارەزایی لەلایەنە جیاوازەکانی مێژووی ڕۆژئاوا دەرکەوتووە.

گواستنەوەی ئەم جۆرە زانستە لەنێو ئەندێشەی ئەوروپاییەوە بۆ وڵاتانی دیکە و لەوانەش ئێرانی سەردەمی قاجاری، هەنگاو بەهەنگاو و بەتایبەت لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەی زایینییەوە ڕوویداوە. جەنگەکانی ئێران و ڕووسیا کە چاو و گوێی هەندێک لە پێشکەوتوخوازانی ئێرانی بەڕووی دونیای نوێدا دەکاتەوە کە دەبێتە هۆی فەراهەمکردنی یەکەمین زەمینە بۆ دەستکەوتنی هزریی و ماددی شارستانیەتی نوێی ئەوروپا لە لایەن ئێرانییەکانەوە. پەیدابوونی یادداشتنووسی، بە شارەزایی و پشتبەستوو بە (من)ی تاک و کۆ (هوشیاری نیشتیمانی)، شێوازێکی نوێی مێژوونووسییە، بەڵام بە شێوەیەکی پەنهانی و نافەرمی. و گەشانەوەی مێژونووسی نوێ لە ژێر چاودێری ئەوانەدا بووە. بەشێوەیەکی گشتی، دەبێت دان بەوەدا بنرێت کە ڕەوتی نووسینەوەی مێژوونووسی ئێرانی کە ڕیشەیەکی پتەو و دێرینەی هەبوو، نەیتوانی خۆی لە گۆڕانکارییە هەنگاوبەهەنگاوەکان بپارێزێت و هەروەک دیاردە کۆمەڵایەتیی و کەلتوورییەکان، بیەوێت و نەیەوێت کەوتە ژێر کاریگەری

ئەو گۆڕانکارییانەوە و لە شێوازی نوسینەوەی پەخشان، زمانی نووسینەوەی ڕووداو و ڕاپۆرتەکان، هونەری مێژوو و مێژوونووسی، ڕووبەڕووی گۆڕانکارییەکی گەورە بوویەوە.

یادداشتنووسە نوێیەکان، بەتێڕوانینیکی ڕەخنەگرانە و بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە و بوێرانە، زانیاری نوێ و دەگمەنیان تۆمار دەکرد. شۆڕشی مەشروتەخوازیش لە ئێران، ڕۆڵێکی بەرچاوی بینی لە بەردەوامیدان بەم گۆڕانکارییە و تۆمارکردنی یادداشتەکان. گەورەیی شۆڕشی مەشروتەخوازیی و پێویستی بۆ تۆمارکردنی ڕووداوەکانی تایبەت بە شۆڕشەکە، چەندین کەسی هاندا بۆئەوەی بەم شێوازە نوێیە دەستبکەن بە نووسینەوەی مێژووی ڕووداوەکانی شۆڕش. لەڕوانگەی پۆلێنکاریشەوە، زۆربەی یادداشتنووسەکان لە چینی باڵای کۆمەڵگە نین و چەندان کەسی دیکەش هاتوونەتە نێو پانتایی مەیدانی یادداشتنووسییەوە. بینینی کەسانی بازرگان، مامۆستای ئاینی و کەسانی دیکەی چینە ناوەندەکانی کۆمەڵگە لەنێو کۆمەڵی یادداشتنووسەکانی ئەو سەردەمەدا، گۆڕانکارییەکە کە بەشێوەیەکی ڕوون دەبینرێت. تەنانەت لەڕووی جیاوازیی ڕەگەزییشەوە گۆڕانکاری بەرچاو دەبینرێت بەشێوەیەک یادداشتنووسی ژن لەنێو مەیدانەکەدا دەبینرێت.

## گۆڕانکاریی و پێگەی من (کەسی یەکەمی تاك) لە یادداشتنووسی سەردەمی قاجار.

لە سەردەمی قاجاردا، پشتبەستن بە شارەزایی و تێگەیشتنی تاک، بووبە هۆی دەرکەوتن و پەیدابوونی تێڕوانینێکی ڕەخنەگرانە لە مێژوونووسی باوی سەردەم و داهێنانی مێژوونووسی نوێ لەچوارچێوە یادداشتنووسیدا.

یادداشتنووسانی سەردەمی قاجار، لەگەڵ ئاشنایی و شارەزایی تەواویان لە (من)ی تاک و ڕەنگدانەوەی لە باسکردنی بارودۆخی ژیانی خۆیان، ناسینی تەواویان لە (م)ی تاک لەنێو ناوەڕۆکی (من)ی کۆمەڵایەتیدا هەبوو. کە دەگوترێت (من)ی تاک، واتە نەک لەپێناو گەشانەوەی خودی من و تۆمارکردنی ڕاست و دروستییەکان و بنەچەی ڕاستەقینەی خودی کەسەکە، بەڵکو لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خودی (من)ی تاک (واتە بە گرنگ نیشاندانی خود یان بێبەریکردنی خود لە هەڵەکانی نێو ڕووداوەکان)، هەروەها بەرژەوەندی تایبەتی خودی من بە ناوەڕۆکی کۆ لەنێو ڕونکردنەوە و نووسینەوەی ڕووداوە گرنگە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان (واتە مێژوونووسی شاراوە و ئامانجدار).

هەربۆیە دەتوانرێت ئەوە بگوترێت کە مێژوونووسی نوێ لە ئێراندا، لە هەناوی یادداشتنووسییەوە دەردەکەوێت، ئەڵبەتە ئەمەش بەهۆی کاریگەری تەواو و ڕاستەوخۆی هزری نوێی ئەوروپا و ئەو ڕەخنانەی کە لە مێژوونووسی کلاسیکی ئێران دەگیران، دێتە بوون. هەروەها پەیداکردنی هوشیاری لەبارەی کەسایەتی تاک و پێگەی مێژوویی مرۆڤ، ڕۆڵێکی گرنگ لەو گۆڕانکاییەدا دەبینێت؛ بەشێوەیەک کە ئەم هوشیارییە لە (من)

ی تاک، دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەرکەسێک سەرگوزەشتەیەکی خۆی تۆمار بکات.

یادداشتنووسی بەهۆی هوشیاری تاک لەبارەی ئەم کەسایەتییەی خود، لەنێو ڕەوتی گۆڕانکاریی و گەشەسەندنی شۆڕشی مەشروتەخوازی، و بەهۆی گرنگی مەشروتە و ڕووداوەکانی نێوی و پێویستی تۆمارکردنیان لەنێو پێگەی مێژوویی مرۆڤ وەک بونەوەرێکی سەربەخۆ و هەڵچووی نێو مەیدانەکە، ئەڵبەت بەلەبەرچاوگرتن و دەرخستنی (ئێمە ی کۆمەڵایەتی)، گۆڕا بۆ تۆمارکردنی ڕووداوە مێژووییەکان، هەربۆیە بەرهەمەکانی یادداشتنووسی گۆڕدران بە سەرچاوەی باوەڕپێکراو بۆ شارەزابوون و ناسینی ئەو سەردەمە.

**پەیدابوونی نیمچە یادداشت و کاریگەری لە نوسینەوەی مێژوودا**

سەرنوسەری بڵاوکراوەیەک، لە ماوەی چەندین ساڵدا، هەم دەنووسێت و هەمیش چاو بەنووسینی کەسانی دیکەشدا دەگێڕێت و بڵاویان دەکاتەوە، ئیدی دوای تێپەڕینی ماوەیەک بەسەر بڵاوکراوەکەدا، قەڵەم بەدەستەوە دەگرێت بۆئەوەی بیرەوەری ئەوکەسانە بنوسێتەوە کە لەماوەی ساڵانێ ڕابردووی بڵاوکراوەکەدا، بەجۆرێک لە جۆرەکان سەروکاریان لەگەڵیدا هەبووە، بنووسێتەوە، ئیدی بەم شێوەیە نیمچە یادداشت پەیدا دەبێت. نموونەش وەک نیمچە یادداشتی دوکتۆر عەلی بەهزادی سەرنوسەری گۆڤاری ڕەش و سپی. جۆراوجۆریی و جیاوازی کەسایەتییەکانی نێو نیمچە یادداشت، دەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێنەر کەمتر هەست بە ماندووبوون بکات. هەندێک لە زانیارییەکانی نێو نیمچەیادداشت، تایبەت و دەگمەنن و بە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ توێژینەوەکانی مێژووی بڵاوکراوەکان و بارودۆخی کەلتووری مێژووی هاوچەرخ دێنە هەژمار.

لەم سەردەمەدا، ئەو کەسانەی کە سەرقاڵی توێژینەوەن لەبارەی مێژووی هاوچەرخ، یادداشتەکان بە یەکێک لە سەرچاوە گرنگەکانی خۆیان دەزانن.

## سەرچاوەکان


– اشرف، احمد: سابقه ی خاطرەنگاری در ایران، مجله فرهنگی هنری بخارا، ١٣٨٨، شماره ٧٤، ص ٣٦٣- ٣٦٩.

– عباسی، سمیه؛ فصیحی، سیمین: گۆڕانکاری من ی تاک (کەسی یەکەمی تاک) و جایگاه ان در تاریخ نکاری نوین ایران (با تکیه بر خاطرەنگاری عصر قاجار)، تاریخ نگری و تاریخ نگاری، بهار و تابستان ١٣٩٤، شماره ١٥ (علمی پژوهشی/ ISC)، ص٨٧- ١١٤.

– جوادیان، مسعود: شبه خاطرات (خاطره نویسی و تاریخ نگاری)، رشد معلم، ١٣٧٦، شماره ١٣٠، ص٦٠- ٦٣.



# ئەحمەدی خانی

## بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە پڕۆژەی (کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠)

**ئامادەکردن: بوار نوورەدین**

ئەم بیبلیۆگرافیایە، لەسەر داواکاریی زانکۆی وان لە وڵاتی تورکیا ئامادەکراوە و ڕۆژی ٢٣ی گوڵانی ٢٠٢١ بە ئۆنلاین پێشکەش کراوە:

(SEMPOZYÛMA KURDIYATÊ II Ehmedê Xanî û Mîrasa Wî (22-23 Gulan 2021

هەروەها لەگەڵ هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی لە چالاکییەکەدا پێشکەش کراون، لەچوارچێوەی کتێبێکدا چاپکراون، بەڵام لەبەرئەوەی تەواوی بەکاربەرانی کورد ناتوانن کەڵکی لێ وەربگرن، پێمان باش بوو لە گۆڤاری خاڵیشدا بڵاوبکرێتەوە.

ئامادەکار لەپێناوی ئەم کارەدا، جارێکی تر دەستی بە لێکۆڵینەوە کردووە و شەش کتێبی گرنگی لە ئەرشیفی بنکەی ژین وەرگرتووە و لە شوێنی خۆیدا ئاماژەیان پێ کراوە: (سەرچاوە: ئەرشیفی بنکەی ژین). بیبلیۆگرافیاکە دوو تەوەرەی سەرەکییە، یەکەمیان ٣٠ کتێبە کە لە نێوان ساڵانی ١٩١٧- ٢٠١٠دا، بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەبارەی ئەحمەدی خانی، یان کتێبەکانییەوە و بەتایبەتیش (مەم و زین) نووسراون، هەروەها ئەو کتێبانەش کە لە ناونیشاندا ناویان هێناوە. تەوەرەی دووەمیش ٦٠ کتێبی ساڵانی ١٩٠٣- ٢٠١٠یە، کە لە ناوەڕۆک، یان پێڕستدا، لێکۆڵینەوە، یان بابەتیان لەبارەی ئەحمەدی خانی و کتێبەکانی نووسیوە.

**کورتکراوەکان:**

پ.: پێوانە (بە سانتیمەتر و «پانی»ی پێش «درێژی»ی نووسراوە)
چاپ.: نۆبەتی چاپ
چ.: چاپخانە
ژ.: ژمارە
ژ.س.: ژمارەی سپاردن
ز.: زانکۆ
س.: ساڵ
ش.: شوێن
کۆڕ.: چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد
ل.: لاپەڕە
و.: وەزارەت
ی.ن.ک.: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
؟: بۆ هەر زانیارییەکی نەزانراو و نادیار دانراوە
ISBN: International Standard Book Number ژمارەی جێگیری نێودەوڵەتیی کتێب

## تەوەرەی یەکەم: کتێبی سەربەخۆ ١٩١٧- ٢٠١٠

### ١- مم و زین- اثرا سرتاج ادیب کردان و مدار افتخارا حمیان احمد خانی

نووسین: ئەحمەدی خانی
چاپ.: ؟، چ.: نەجم ئیستیقبال، ش.: ئەستەمبووڵ، ژ.س.: ؟، س.: ١٣٣٥- ١٣٣٧ (١٩١٧-١٩١٩)، ل.: ٤+١٣٨، پ.: ١٦×٢٤
ناوەرۆک: دیباچە (بە کرمانجیی ژووروو): حەمزە/ تێکستی مەم و زینی خانی بە کرمانجیی ژووروو.
(سەرچاوە: ئەرشیفی بنکەی ژین).

**٢- سرگزشته مەم و زین**
عەشقیکی پاک روحانی
سودابیکی گیانی یزدانی- لە کوردستانا روی داوە
خوشتر لە لیلی و مجنون
نووسین: پیرەمێرد
چاپ: یەکەم، چ: ژیان، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ١٩٣٢، ل: ٢٤، پ: ٢١×١٤
ناوەڕۆک: پەردەی ئەوەل/ پەردەی دووەم/ پەردەی سێیەم/ پەردەی چوارەم/ پەردەی پێنجەم/ پەردەی شەشەم.
تێبینی: پیرەمێرد بە کەڵکوەرگرتن لە مەم و زینی خانی، ئەم شانۆگەرییەی ئامادەکردووە.

**٣- مەم و زینی ئەحمەدی خانی**
ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: ژین؟
چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: حەڵەب، ژ.س: ؟، س: ١٩٤٧، ل: ١٣٩، پ: ٢١×١٥
ناوەڕۆک: دەقی داستانی مەم زینی ئەحمەدی خانی لە ٥٩ بەشدا.

**٤- مەم و زین- یادگاری تاجی سەری ویژەوان و بویژان، بووژینەوەی هەستی بەرزی**
نەتەوایەتی و مایەی سەربڵندی و شانازی کورد و کوردستان
نووسین: ئەحمەدی خانی
ئامادەکردن: چاپخانەی کوردستان (گیو موکریانی)
چاپ: سێیەم؟، چ: کوردستان، ش: هەولێر، ژ.س: ؟، س: ١٩٥٤، ل: ١٩٧، پ: ٢٢×١٥
ناوەڕۆک: پێشدەستی/ بەسەرهاتی ئەحمەدی خانی/ خانی و هەستی نەتەوایەتی/ خانی و سەودای نیشتمانپەرستی/ داستانی مەم و زینی خانی بە شێوەزاری کرمانجیی ناوەڕاست/ پێڕستی مەم و زین/ سەرچاوەکانی ئەم مەم و زینە/ تکای چاوپۆشی و بەخشین.
(سەرچاوە: ئەرشیفی بنکەی ژین).

**٥- مەم و زینی خانی**
نووسین: ئەحمەدی خانی
گۆڕین، ئامادەکردن و پەراوێز نووسین: هەژار موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: نەجاح، ش: بەغدا، ژ.س: ؟، س: ١٩٦٠، ل: ١١٨، پ: ٢٤×١٧
ناوەڕۆک: ئەو وشانەی تووشیان دەبی و ئاشناییت لەگەڵیان نییە لێرە بۆی بگەڕێ/ سەرەتا: حەسەن قزڵجی/ بەرکوڵێک لە لایەن وەرگێڕەوە/ گۆڕینی چیرۆک و داستانی مەم و زینی خانی کە بە شێوەزاری کرمانجی ژووروو نووسراوە بۆ شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست.

**٦- مم و زین- تیکستا کریتیک**

نووسین: ئەحمەدی خانی

وەرگێڕان و پێشەکی: م. ب. ڕۆدینکۆ

آکادمیا علمی یا تفاقا شوری- آثارید ادبی اید ملتید روهلاتی- تیکست- زنجیرا بچوک ١٣ نشرخانا ادبیتا روهلاتی

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: مۆسکۆ، ژ.س: ؟، س: ١٩٦٢، ل: ١٩٧+٢٥٠، پ: ١٤×٢١

ناوەرۆک: پێشگۆتنا رداکتور/ ئەحمەدی خانی- مەم و زین/ تێکستی مەم و زینی خانی بە تیپی (ئارامی- عەرەبی لە یەکەم لاپەڕەی لای ڕاستەوە تاکوو لاپەڕە ١٩٧)/ لێکۆڵینەوە و تێکستی مەم و زینی خانی بە زمانی ڕووسی (لە یەکەم لاپەڕەی لای چەپ تاکوو لاپەڕە ٢٤٩).

(سەرچاوە: ئەرشیفی بنکەی ژین).

**٧- چریکەی (مم و زین) کوردی: فارسی**

ئامادەکردن: عوبێدوڵڵا ئەییووبیان

چاپ: یەکەم، چ: شەفەق، ش: بەغدا، ژ.س: ؟، س: ١٩٦٣، ل: ٢٧٧، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: پێشەکی/ چریکە چییە/ چریکە بەناوبانگەکانی کوردی - ناوی زیاتر لە ٢٠٠ دانەی نووسیوە-/ مەم و زینی خانی/ چریکەی مەم و زین.

**٨- مەم و زین- یادگاری تاجی سەری وێژەوان و هەستیاران، بووژێنەوەی هەستی پاکی نەتەوایەتی و مایەی شانازی کورد و کوردستان**

نووسین: ئەحمەدی خانی

ئامادەکردن: چاپخانەی هەولێر (گیو موکریانی)

چاپ: سێیەم؟، چ: هەولێر، ش: هەولێر، ژ.س: ؟، س: ١٩٦٨، ل: ٢٢٦، پ: ١٦×٢١

ناوەرۆک: وێنەی خانی و کورتە باسێک/ پێشدەستی/ بەسەرهاتی ئەحمەدی خانی/ خانی و هەستی نەتەوایەتی/ هۆی دانانی ئەو پەڕتووکە/ خانی و سەودای نیشتمانپەرستی/ داستانی مەم و زینی خانی بە شێوەزاری کرمانجیی ناوەڕاست/ پێڕستی مەم و زین/ سەرچاوەکانی ئەم مەم و زینە/ تکای چاوپۆشی و بەخشین.

(سەرچاوە: ئەرشیفی بنکەی ژین).

**٩- مەم و زین**

نووسین: ئەحمەدی خانی
ئامادەکردن و پەراوێز نووسین: هەژار موکریانی
بڵاوکراوەی ئینستیتیوتا کوردییا پاریس
چاپ.: ؟، چ.: ؟، ش.: پاریس، ژ.س.: ؟، س.: ١٩٨٩، ل.: ١٥+٣٧٦، پ.: ١٧×٢٤
ناوەرۆک: مەم و زینی خانی چییە/ چیرۆک نووسی/ ئامۆژگاریی ڕامیارانە/ وەفا و ئەمەک/ شێخی خانی و مرۆڤایەتی/ خودا ناسین/ خانی و هونەرە جوانەکان/ خانی و شیعر/ ئەحمەدی خانی و ئازادی/ من و مەم و زینی خانی/ چم کرد/ تێکستی مەم و زینی خانی بە کرمانجیی ژووروو/ تێکستی مەم و زینی خانی بە کرمانجیی ناوەڕاست/ هەژار ئامۆژگاریی شێرکۆی کوڕی خۆی دەکا/ پێڕست.
(سەرچاوە: ئەرشیفی بنکەی ژین).

**١٠- مەم و زین MEM Û ZiN**

ئامادەکردنی: قەناتی کوردۆ
چاپ.: یەکەم، چ: ؟، ش.: سوید- ستۆکهۆڵم، ژ.س.: ؟، س.: ١٩٩٦، ل.: ٣٢٠، پ.: ١٣×٢٠
ناوەرۆک: پێشگۆتن/ شاخێن فۆلکلۆری و نڤیسەرا ئەحمەدێ خانی -نووسینەوەی ١٢ دەقی جۆراوجۆری مەم و زین-.

**١١- چیرۆکی مەم و زین لە تەرازوودا**

نووسین: شاکیر فەتاح
لە ڕیزە نووسراوانی ویژەیی
چاپ.: یەکەم، چ.: کامەران، ش.: سلێمانی، ژس.: ؟، س.: ١٩٦٩، ل.: ٧٧، پ.: ١٤×٢٢
ناوەرۆک: هەندێ بابەتی وەک: ئەم نووسراوە/ کوردستان لە سەردەمی ئەحمەدی خانی دا/ هۆی دانانی ئەم چیرۆکە/ چیرۆکی مەم و زین/ جیاوازیی هەردوو چیرۆک/ وێنەیەک لە ناوەرۆکی مەم و زینی خانی/ نموونەی چیرۆکی مەم و زینە ڕەمەکییەکە/ مەم و زینی بە دەست نووسراو/ مەم و زینی چاپکراو/ ناوی چیرۆکە بەناوبانگەکانی کورد/ ناوی چیرۆکبێژەکانی کورد/ واتەی ڕۆشنبیرانی جیهان/ بڕانەوەی وتار/ ناوەرۆک.

**١٢- ئەحمەدێ خانی یێ نەمر**

نووسین: سادق بەهائەدین ئامێدی
چاپکراوی کۆڕی زانیاریی کورد- لە بەشی یەکەمی بەرگی دووەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد دەرهێنراوە
چاپ.: یەکەم، چ.: کۆڕ، ش.: بەغدا، ژ.س.: ؟، س.: ١٩٧٤، ل.: ٥٧ (٧٦٩- ٨٢٦)، پ.: ١٧×٢٤
ناوەرۆک: ئەحمەدێ خانی یێ نەمر/ کورتەی باسەکە بە زمانی عەرەبی.

### ١٣- نەوبەهاری خانی و ئەحمەدی شێخ مارفی نۆدی

لێکۆڵینەوە و بەراوردکردن: عەلی فەتاح دزەیی

چاپ: یەکەم، چ: ڕۆشنبیری و هونەر، ش: هەولێر، ژ.س: ١٥١٨، س: ١٩٨٥، ل: ٦٥، پ: ٢٢×١٧

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: (نەوبەهارا بچووکان)ی ئەحمەدی خانی ١٦٥٠- ١٧٠٦ (کۆنترین فەرهەنگ و هەم کۆنترین سەرچاوەی زانیاریی عەرووزە لە زمانی کوردیدا)/ تێبینییەکی پێویست/ پێشەکی/ بابەتی وێژەیی و نەوبەهار و بەشەکانی/ ناوەرۆکی نەوبەهار/ بابەتی وشەکانی نەوبەهار/ قاڵب و فۆڕمی نەوبەهار/ لێکدانەوەی کێشەکان/ بەشی دووەم: کتێبی (ئەحمەدی)ی شێخ مارفی نۆدێ ١٧٥٣- ١٨٣٧/ چرای ڕۆشنی زمانی کوردی هەرگیز ناکوژێتەوە/ چاپەکانی ئەحمەدی/ قاڵب و فۆڕمی ئەحمەدی/ ناوەرۆکی فەرهەنگی ئەحمەدی/ کۆتایی: بەراوردکردنی هەردوو فەرهەنگۆک/ سەرچاوەکان/ پێڕست.

### ١٤- مەم و زین- ئەحمەدێ خانی

ڤەژاندن: پەرویز جهانی

بڵاوکراوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی- ئینتیشاراتی سەڵاحەدینی ئەییووبی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ورمێ- ئێران، ژ.س: ؟، س: ١٩٨٨، ل: ٣٨٣، پ: ٢٤×١٧

ناوەرۆک: پێڕست/ پێشگۆتن/ دەستپێک/ داستانی مەم و زینی ئەحمەدی خانی کە لە ٢٦٥٠ بەیت پێکهاتووە و بە پەراوێز لێکدانەوەی بۆ کردووە/ مەم و زین ب ڕێنڤیسا عەرەبی -کە لە ٢٦٥٥ بەیت پێکهاتووە-.

### ١٥- مەم و زین

نووسین: ئەحمەدی خانی

ئامادەکردن و پەراوێزنووسین: هەژار موکریانی

بڵاوکراوەی ئینستیوتی کورد لە پاریس

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ئیتاڵیا، ژس: ؟، س: ١٩٨٩، ل: ٣٧٠، پ: ٢٤×١٧

ناوەرۆک: مەم و زینی خانی چییە/ دەقی داستانی مەم و زینی خانی بە شێوەزاری کرمانجی ژووروو لە لایەن شاعیری گەورەی کورد ئەحمەدی خانی و لێکدانەوەی بە شێوەزاری کرمانجی خواروو.

**١٦- مەم و زین**

نووسین: ئەحمەدی خانی

شرۆڤەکرن و ڤەکۆلین: ئەمینێ ئوسمان

چاپ: یەکەم، چ: ئەلجاحیز، ش: بەغدا، ژ.س: ١٧٣٢، س: ١٩٩٠، ل: ٤٥٤، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: پێشی/ مەم و زین: ئەحمەدێ خانی/ دەقی داستانی مەم و زینی خانی بە هۆنراوە و بە شێوەزاری کرمانجی ژووروو لە لایەن شاعیری گەورەی کورد ئەحمەدی خانی و لێکدانەوەی بە شێوەزاری کرمانجی ژووروو/ فەرهەنگۆک/ ژێدەر.

**١٧- ژ هەلبەستێن ئەحمەدێ خانی**

کۆمکرن و توێژاندن: ئیسماعیل بادی

چاپ: یەکەم، چ: هاوار، ش: دهۆک، ژ.س: ١٣٣، س: ١٩٩٦، ل: ٩٦، پ: ١٤×٢١

ناوەرۆک: پەیڤەک/ ئەحمەدێ خانی- ژیان و بەرهەم/ پەرتووکێن خانی/ ئەڤ هەڵبەستە ل کیڤە هاتینە پاراستن/ کورتکرنا ناڤ و ژێدەران/ ژ هەڵبەستێن ئەحمەدێ خانی/ دەستنڤیس و چاپکری یێن بەلاڤکری/ ناڤەرۆک.

**١٨- فیستڤالا خانی- دهوك ٢٠- ٢٣/حزیران/١٩٩٥**

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: ڕێڤەبەرییا گشتی یا ڕەوشەنبیری و هونەری یا دهوک

چاپ: یەکەم، چ: هاوار، ش: دهۆک، ژ.س: ١٤١، س: ١٩٩٦؟، ل: ١٦٤، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: پێشەکی/ هەندێ بابەتی وەک: خانی ڕۆشنایی دەخاتە دڵ و دەروون و مێشکەوە: مەسعوود بارزانی/ ڤەکۆلین: د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ/ مەم و زین کەنگی ژیا بوون: تەحسین ئیبراهیم دوسکی/ ...: سەعید ناکام/ هێما پەڕندان د مەم و زینێ دا: حەجی جەعفەر/ هزر ل جەم خانی: ڕەشید فندی/ ئەحمەدی خانی پەیامی ڕزگاری و شادمانی: فەلەکەدین کاکەیی/ پێشەکییەکەی (مەم و زین) و چەند هێمایەکی فەلسەفی: حەمەکەریم هەورامی/ شێوازی دەربڕین لە مەم و زین دا: محەممەد خدر مەولوود/ هەندێ بابەت بە زمانی عەرەبی و هۆنراوە/ برووسکە و کاغەز/ ناڤێن پشکداران/ بەلاغا دووماهیێ.

**١٩- مەم و زین- لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن**

نووسین: عەلی فەتاح دزەیی

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر

چاپ: یەکەم، چ: و. ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٢١٨، س: ١٩٩٧، ل: ١٢٥، پ: ١٦×٢٢

ناوەرۆک: پێشەکی/ سەرەتایەکی مێژوویی/ داستانی مەمی ئالان/ مەم و زین و بەراوردکردنی لەگەڵ داستانی مەمی ئالاندا/ لێکدانەوەی بیروباوەڕی خانی/ بابەتی ناوەرۆک و فۆرمی مەم و زین/ هونەرەکانی بەلاغەت لە مەم و زین دا/ کۆتایی/ سەرچاوەکان/ نووسەر لە چەند دێرێکدا.

**٢٠- ئادە لناڤ بەغچێ ئەحمەدێ خانی- هندەك هوزان و هەلقوتان و ڤەرویفاندن و ڕەخنە**

نووسین: د. مەسعوود کتانی

چاپ: ؟، چ: هاوار، ش: دهۆک، ژ.س: ٢٢٤، س: ١٩٩٨؟، ل: ٨٠، پ: ١٥×٢٠

ناوەرۆک: پێشی و سەرگۆتن/ دگەل د. شوکریە ئەو د. ڕۆدینکۆ/ دگەل سەیدا عەبدولڕەقیب یوسف/ ژ هوزانێت خانی/ خانی د هوزانا هەرو سەد جار/ خانی دگەل دلوجارەک/ خانی د هوزانا سەرواما/ خانی د هوزانا ئەی واحیدێ پەنهان/ خانی د هوزانا هندی کو سەرێ/ خانی د هوزانا ئەز چوومە باغێ سۆرگولان/ خانی دگەل دوڕدانە/ هوزانا ٧ یا خانی... دوردانە/ ژێزانکرنا هوزانا خانی (زاهدێ)/ سەروکانی/ ژیاننامەی نووسەر بە زمانی عەرەبی.

**٢١- لە پێناوی ڕاستی و کورد و خانیدا- دەمەتەقێ یەکی دۆستانە لەگەڵ کاك مارتین ڤان براونێسن لەبارەی ئەحمەدی خانی و مەم و زینەکەی و دەوری مەم و زینەوە لە وشیاریی نەتەوەییی کورددا**

ئامادەکردن: محەممەدی مەلا کەریم

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ١١١، س: ١٩٩٩، ل: ٦٤، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: جگە لە ناونیشانی کتێبەکە، هیچ ناونیشانێکی تری تێدا نییە.

**٢٢- چەند ڤەکولین ل دۆر مەم و زینا خانی**

نووسین: حجی جعفر

بڵاوکراوەی ناڤەندا هاڤیبوون یا لێکۆلین و وەشانێن کوردی ل بەرلین

چاپ: یەکەم، چ: هاڤیبون، ش: بەرلین، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٢، ل: ١٤٤، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: پێشی/ خانی د ڤێ میرێ کوردان چەوا بە/ شاهی و خەم ل نک خانی/ ئەحمەدێ خانی ئەڤیندار بوویە/ هەڤالینێ د مەم و زینێ دا/ هندەک ڕەوشت و تیتالێت کوردەواری د مەم و زینێ دا/ ئەحمەدێ خانی و باوەرییێت میللی/ هێما ژمارێ و مەم و زینا خانی/ ئێزدیاتی د مەم و زینا خانی دا/ خانی و لێبۆرین/ ئیشاراتێت قورئانی د مەم و زینا خانی دا/ هندک ئیشاراتێت ئینجیلێ و تەوراتی د مەم و زینا خانی دا/ هێما پەڕندا د مەم و زینێ دا/ ژ مەم و زینا فولکلۆری بۆ مەم و زینا خانی/ ئەحمەدێ خانی یان ئەحمەدێ خانێ/ هەڤپەیڤینەک دگەل ئەحمەدێ خانی/ وەشانێن ناڤەندا هاڤیبوون یا لێکۆلین و وەشانێن کوردی ل بەرلین.

### ٢٣- ئێزدیاتی د مەم و زینا خانی دا
نووسین: ڕێسان حەسەن
چاپکراوی بنگەهێ لالش یێ ڕەوشەنبیری و کۆمەڵایەتی
چاپ: یەکەم، چ: خەبات، ش: دهۆک، ژ.س: ٢٤٨، س: ٢٠٠٤، ل: ٩٤، پ: ١٦×٢٣
ناوەرۆک: ناڤەرۆک/ پێشگۆتن/ ئێکانیکا خودێ/ عەزازیل/ ڕۆژ پەرستن/ خدر پێغەمبەر/ تەرەزەوران (تاووس)/ گوق- تۆک/ دوڕ/ دەف و شباب/ ئاخ و ئاڤ و بای و ئاگر/ برایێ ئاخرەتێ/ قەوال/ دەرچک/ دوعاچی/ ئاگر و ڕوناهی و قەندیل و چرا/ لەوح مەحفووز/ فوقرا/ شێخ و پیر و مرید/ حلوول/ بەرات/ چلەخانە/ زمزم/ بخوور/ زەبوون/ چل ڕۆژی/ کۆچەک/ مەفتوول/ جندی و دەروێش و فەقیر/ سەرسال/ قوب/ تەمبوور/ ڤەخوازن/ ئەنجام.
### ٢٤- مامۆستەیێ سێیەمین خانی
نووسین: هـ مەم
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: زانا فارقینی
گواستنەوەی لە تیپی لاتینەوە: هزرڤان
بڵاوکراوەی یەکێتیی نووسەرانی کورد- لقی دهۆک
چاپ: یەکەم، چ: هاوار، ش: دهۆک، ژ.س: ٢٧٩، س: ٢٠٠٦، ل: ٦٥٧، پ: ١٧×٢٤
ناوەرۆک: ناڤەرۆک/ پێشەکی: شەفیق بەیاز/ دەستپێک: هـ مەم/ ناسنامەیا بەشەری یا خانی/ ناسنامەیا خانی یا زانستی/ د مەم و زینێ دە خوەدا و مرۆڤ/ فەلسەفەیا خانی- هیمێن سەرەکە/ یێن د ڕامانا وی دە و کەساتی/ ڕەوشا جڤاکی یا گەلێ کورد ئا وێ چاخێ و سەدەمێن وێ/ دەستانا یەکیتی و ئاقووبەتێ/ نیشە/ ژ بو بەرگا پاشن.

### ٢٥- مەمێ ئالان
پێشەکی و لێکۆڵینەوە و دیالۆگی کوردی: مەحموود زامدار
دەرهێنان: ناسر حەسەن
بڵاوکراوەی دەزگای موزیک و کەلەپووری کورد
چاپ: یەکەم، چ: دارا، ش: هەولێر، ژ.س: ١٢٦٣، س: ٢٠٠٧، ل: ٤٢٧، پ: ٢٠×٢٨
ناوەرۆک: مەمێ ئالان لە نێوان ئەفسانە و مێژوودا/ چاپەکانی مەمێ ئالان و مەم و زین و دەق و لێکۆڵینەوە/ کورتەی دەقی مەمێ ئالان وەک خۆی/ کورتەی دەقەکەی مەم و زینی خانی/ چەند سەرنجێک/ حیکایەتی ئەفسانەیی و مەمێ ئالان/ چەند سەرنجێک/ مەمی ئالان و مەم و زین و پانۆڕامایەک/ ئالان بۆ/ کوردادنی دیالۆگی مەمێ ئالان/ سەرچاوەکان/ سترانی تایتل/ تێکستی دیمەنەکانی زنجیرە درامای مەمی ئالان کە لە ٥٧٠ دیمەن پێکهاتووە.

**٢٦- ئەحمەدێ خانی**

نووسین: عەبدولڕەحمان دوڕە
بڵاوکراوەی مەتین
چاپ.: یەکەم، چ.: هاوار، ش.: دهۆک، ژ.س.: ٤٧٢، س.: ٢٠٠٨، ل.: ١٩٩، پ.: ١٧×٢٤
ناوەرۆک: ناڤەروک/ پێشگۆتن: بابێ نازێ/ نەقاشێ ئەزەل/ ئەی واحیدێ پەنهان/ عەرشێ موعەللا/ سەروامە/ ئافەرین بۆتە/ میرێ مەجلیس/ تەختێ دیلبەرێ/ ساقیێ مەهوەش/ سازێ خوەش ئاوازم ئەز/ هەر دنالم/ ئەو موتریبێ دەمساز/ دلێ شەیدا/ باغێ سۆرگولان/ شەهیدێ کەربەلا/ دلا/ عەنقائێ بەقا/ مەدی نەقشەک/ هلۆ/ هەرۆ سەد جار/ سوبحەکێ زوو/ هنارەک/ ئەی دەریغا/ ئەی دل/ ئاخیرەت فرۆشین/ زاهدێ خەلوەت نشین/ ئەی سەیدێ عالەم/ مەدحییە و مەرسییە.

**٢٧- ئەحمەدی خانی ١٦٥٠- ١٧٠٧ شاعیر و بیرمەند فەیلەسوف و سۆفی**

نووسینی بە زمانی عەرەبی و وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی: پ. د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ
بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)
چاپ.: یەکەم، چ.: حەمدی، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٢٥٢٥، س.: ٢٠٠٨، ل.: ٥٣٢، پ.: ١٧×٢٣
ناوەرۆک: پێشەکی/ خانی و ژیانی/ مەبەست لە نووسینی مەم و زین/ مەم و زینی خانی دانانە یا وەرگرتن/ مەم و زین داستانێکی ڕەسەنی تایبەتیی کوردە/ ئیملای کوردیی تازە و دیمەنێکی مەم و زینی خانی/ باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردستان لە سەردەمی خانی دا/ چەرخی ئەدەبیی خانی/ خانی و مەسەلەی نەتەوەیی کورد/ وێنەی شارستانییەتی کورد لە مەم و زین دا/ بۆچوونی کۆمەڵایەتی لای خانی/ وێنەی ئەتنۆگرافیی کورد لە مەم و زینی خانی دا/ شێوازی وێنەی ئەدەبی لە مەم و زینی خانی دا/ ئەحمەدی خانی و ڕەخنەی ئەدەبیی کوردی/ خانی و فەلەک/ خانی و فەلسەفە و تەسەووف/ خانی و بوون (وجوود)/ خانی و سیفاتی خوایی/ خانی و مەسەلەی ئیبلیس/ خانی و جەبریەتی تەواو/ خانی و دایلەکتیک/ خانی و تەسەووف/ زوهد و تەسەووف/ ئیستیلاحاتی سۆفیان/ مەقام و ئەحواڵەکان/ گەیشتنە پلە و فەنابوون لە خوادا/ بوونی پێشووی گیان/ شەریعەت و تەسەووف/ باسی نەفس و گیان/ ڕەوشتی سۆفییان/ ئەدەبیاتی سۆفی/ ستایشی پێغەمبەر/ خۆشەویستیی خوایی و هێنانەوەبەرچاوی چیرۆکەکانی دڵداری/ مەی/ یەکێتیی بوونە یا یەکێتیی شهوود/ ئەنجام/ پێشەکیی چاپی تورکیی کتێبەکە/ پێڕستی سەرچاوەکان/ وێنەکان و بەرگی کتێبەکان/ چاپکراوەکانی نووسەر.

**٢٨- بنیاتی گێڕانەوە لە داستانی (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانی و ڕۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان)ی بەختیار عەلی دا- لێکۆڵینەوەیەکی (ڕەخنەیی، پراکتیکی، بەراوردکاری)یە**

نووسین: سەنگەر قادر شێخ محەممەد حاجی

بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ: خانی، ش: دهۆک، ژ.س: ٩٠٩، س: ٢٠٠٩، ل: ٢٨٠، پ: ٢٢×١٦

ناوەرۆک: ناوەرۆک/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: بنیاتی گێڕانەوە لە داستان و ڕۆمان دا/ بەشی دووەم: توخمەکانی گێڕانەوە لە داستان و ڕۆمان دا/ بەشی سێیەم: هونەرەکانی گێڕانەوە لە داستان و ڕۆمان دا/ ئەنجام/ سەرچاوەکان/ کورتەی لێکۆڵینەوەکە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی.

**٢٩- چەند ڤەکۆلین ل دۆر مەم و زینا خانی**

نووسین: حەجی جەعفەر

بڵاوکراوەی ئینستیوتی کەلەپووری کورد

چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ١٥٨٤، س: ٢٠٠٩، ل: ٢١٦، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: ناڤەرۆک/ پێشگۆتن: ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد/ پێشیی چاپا دوویێ/ پێشیی چاپا ئێکێ/ خانی د ڤێ میرێ کوردان چەوا بە/ شاهی و خەم ل نک خانی/ ئەحمەدێ خانی ئەڤیندار بوویە/ هەڤالینێ د مەم و زینێ دا/ هندەک ڕەوشت و تیتالێت کوردەواری د مەم و زینێ دا/ ئەحمەدێ خانی و باوەڕییێت میللی/ هێما ژمارێ و مەم و زینا خانی/ ئێزدیاتی د مەم و زینا خانی دا/ خانی و لێبۆرین/ ئیشاراتێت قورئانی د مەم و زینا خانی دا/ هندک ئیشاراتێت ئینجیلێ و تەوراتی/ هیما پەڕندا د مەم و زینێ دا/ ژ مەم و زینا فولکلۆری بۆ مەم و زینا خانی/ ئەحمەدێ خانی یان ئەحمەدێ خانێ.

تێبینی: ناوەرۆکی ئەم چاپە لەگەڵ چاپی یەکەم جیاوازە، لەبەرئەمە ناوەرۆکی هەردووکیان نووسراوەتەوە.

**٣٠- نەتەوە و دەوڵەت و ئایین لە هزری ئەحمەدی خانی (١٦٥٠- ١٧٠٧)دا**

نووسین: د. فەهمی شوکری عەبدوڵڵا

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: و. ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٢٩٠، س: ٢٠١٠، ل: ٤٠٦، پ: ٢٣×١٦

ناوەرۆک: پێشەکییەک: د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: لایەنی تیۆری (نەتەوە، دەوڵەت، ئایین)/ بەشی دووەم: ئەحمەدی خانی و نەتەوە/ بەشی سێیەم: دەوڵەت و ئایین لای ئەحمەدی خانی/ ئەنجامەکان/ پاشکۆکان/ پوختەی لێکۆڵینەوەکە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی/ سەرچاوەکان.

## تەوەرەی دووەم: پێڕستی لە ناوەرۆکی کتێبی کوردیدا ۱۹۰۳- ۲۰۱۰

**KURDISCHE TEXTE- Erster Teil -١**

کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوە: A. Von Lecoq

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: بەرلین، ژس: ؟، س: ۱۹۰۳، ل: ٤+۷۲+۹٦+۹، پ: ۲۰×۲٥

ناوەرۆک: کتێبەکە تەنها لە لای چەپەوە پێشەکییەک (Vorwort)ی دوو لاپەڕەیی بۆ نووسراوە، کە پێ دەچێت بە زمانی ئەڵمانی بێت، ئەوی تری بەم پیتانە (ئارامی یان عەرەبی) نووسراون. فەهرەستەکەی بۆی ئامادەکراوە دوو بەشە لەگەڵ پاشکۆیەکدا (زەیل)/ بەشی یەکەم: حکایتان یاغب ئۆغلی یوسف ئەفەندی جلک (حکای دنیا کوزلی/ شێخ مووس و ئینجە یوسب دسطاني/ حکای ڕشوان/ حکای تشي/ حکایە عەشیرەت/ حکای کوندە)/ حکایتان جەعفەر ئۆغلی سەید ئەفەندیی بیا (حکای زەمبیل فرۆش/ دستانی مەمی عەوان/ دستانی میری عەکاری جبل ئاغا/ دستانی یاسین بەگ/ دستانی دیمز ئۆغلی کوچک حەسەن ئاغا/ حکای مەمی ئالان/ حکای یوسب عەزز دوو برایە هفە بوون/ دستانی محەمەد یمن/ دستانی سوودالی/ دستانی حسێن ئاغایە زل)/ حکایتان عەلی کوندە دلک (حکای مەمی ئالان/ حکای زەمبیل فرۆش)/ حکای حافظ: زەمبیل فرۆش/ بەشی دووەم: حکایت عومەر ئیبن عەلی کووسا: حەکایەت ئیبراهیم پاشا لفظي ظاظا/ ذیل (پاشکۆ): کتاب نوبهار لأحمەد الخاني/ مولد النبيي الهاشمي بلغه الكردي أهل العراقي/ وێنەی ئۆرجیناڵی دەستنووسی هەموو ئەم داستان و حەکایەتانە.

(سەرچاوە: ئەرشیفی بنکەی ژین).

**تێبینی**: ئەم کتێبە لەچاو سەردەمەکەی (ساڵی ۱۹۰۳) لەسەر کاغەزێکی زۆر باش و ئەستوور، بەشی دەستنووسەکانی بە ڕەنگاوڕەنگ چاپکراوە و بەرگی ڕەقیشی تێ گیراوە. هەروەها تێکستە چاپکراوەکان لەلای ڕاستی کتێبەکە دانراون، بەوشێوەیەی کە ناوەرۆکەکەیمان نووسیوەتەوە، دەستنووسەکانیش لەلای چەپی کتێبەکەوە دانراون و بەپێچەوانەی ناوەرۆکەکە، واتە دوا ناونیشان لە سەرەتای لای چەپ دانراوە.

**٢- مێژووی ئەدەبی کوردی- مێژوو، ئەدەب، زانیاری**

نووسین: عەلادین سەجادی

چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژ.س: ؟، س: ۱۹٥۲، ل: ٦۳٤، پ: ۱٥×۲۰

ناوەرۆک: دەوری دووەم لە ئەدەبی کوردی/ هۆنراوە (شیعر)/ هەڵبەست لە کورددا/ بۆچ هۆنراوە بە شێوەی هەورامی وتراوە: ئەحمەدی خانی.

**٣- نامیلکەی سلێمانی- نامیلکەیەکی زانستی و کۆمەڵایەتی و وێژەیی یە، لەلایەن قوتابییانی قوتابخانەی پێ گەیاندنی مامۆستایانی سەرەتایی کوڕانەوە لە سلێمانی دەرئەچێت.**

ئامادەکاران: عەبدوڵلا زێباری (مامۆستا)، عومەر عەبدولڕەحیم (مامۆستا)، محەممەد عەلی فەرەج (قوتابی)، عەلی شێخ محەممەد (قوتابی)

چاپ: یەکەم، چ: کامەران، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ١٩٦٠، ل: ٧٦، پ: ٢١×١٧

ناوەرۆک: دیوانی سلێمانی- ئەحمەدی خانی: عەلی شێخ محەممەد/ خانی و هەستی نەتەوایەتی.

**٤- ئەدەبی کوردی و لێ کۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی**

نووسین: عەلادین سەجادی

چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژ.س: ؟، س: ١٩٦٨، ل: ٣٤٨، پ: ٢٤×١٧

ناوەرۆک: وردبوونەوەیەک و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی...: ئەحمەدی خانی.

تێبینی: لەسەر بەرگ، ساڵی ١٩٦٨ و لە یەکەم لاپەڕەدا، ساڵی ١٩٦٧ نووسراوە؟

**٥- چیرۆکی مەم و زین لە تەرازوودا**

نووسین: شاکیر فەتاح

لە ڕیزە نووسراوانی وێژەیی

چاپ: یەکەم، چ: کامەران، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ١٩٦٩، ل: ٧٧، پ: ٢٢×١٤

ناوەرۆک: کوردستان لە سەردەمی ئەحمەدی خانی دا.

**٦- باخچەی شاعیران (بەسەرهات و هەلبەستی ٤١ بویژی کورد)**

کۆکردنەوە و لەسەرنووسین: عەبدولعەزیم ماوەتی و عەبدولقادر ساڵح

چاپ: یەکەم، چ: ژین، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ١٩٧٠، ل: ١٦٣، پ: ٢٢×١٥

ناوەرۆک: ئەحمەدی خانی ١٦٥٠- ١٧٠٦.

**٧- لێ دوانێکی کورت لە مەقام و مۆسیقای کورد**

نووسین: عوسمان شارباژێڕی

بە یارمەتیی وەزارەتی کاروباری ژووروو- بەڕێوەبەرێتیی خوێندنی گشتیی کوردی چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: ڕاپەڕین، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٣٢، س: ١٩٧٢، ل: ٨٦، پ: ٢١×١٤

ناوەرۆک: ئەحمەدی خانی- زەنگوڵ.

**٨- چەند شاعیرەك د هەرێما بەهدینان- هۆنراوە و لێكۆڵینەوە**

نووسین: د. نافیع ئاكرەیی

بڵاوكراوەی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان

چاپ: یەكەم، چ.: ئەسعەد، ش.: بەغدا، ژ.س.: ٩٥٦، س.: ١٩٧٨، ل.: ٨٧، پ.: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: ئەحمەدی خانی.

**٩- پێناسی بەشێكی شاعیرانی كورد- بەسەرهات و ژیانی ٤٢ شاعیری ناوداری كوردە**

ئامادەکردن: ئەسعەد عەدۆ

چاپ: یەكەم، چ.: ئەلحەوادیس، ش.: بەغدا، ژ.س.: ٥١٩، س.: ١٩٨٠، ل.: ٥٥، پ.: ١٥×٢٢

ناوەرۆک: ئەحمەدی خانی.

**١٠- هۆزانڤانێت كورد**

نووسین: سادق بەهائەدین ئامێدی

چاپکراوی كۆڕی زانیاریی عیراق

چاپ: یەكەم، چ.: كۆڕ.، ش.: بەغدا، ژ.س.: ١٦٣٩، س.: ١٩٨٠، ل.: ٦٢٤، پ.: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: ئەحمەدێ خانی.

**١١- تێكستی ئەدەبیی كوردی- بەشی دووەم زانستگای سلێمانی كۆلیجی ئاداب بەشی زمانی كوردی**

نووسین: د. محەممەد نووری عارف

بڵاوكراوەی زانكۆی سلێمانی

چاپ: یەكەم، چ.: ز. سلێمانی، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٦٩٣، س.: ١٩٨١، ل.: ٣٥٨، پ.: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: بەشی دووەم: تێكستی هۆنراوەی كۆن بە شێوەی كرمانجی سەروو– ئەحمەدی خانی.

**١٢- ژیناوەری زانایانی كورد لە جیهانی ئیسلامەتی یا گەنجینەی فەرهەنگ و زانست**

نووسین: محەممەد ساڵح ئیبراهیمی محەممەدی (شەپۆل)

چاپ: یەكەم، چ.: مەهارەت، ش.: تاران، ژ.س.: ؟، س.: ١٣٦٣ (١٩٨٤)، ل.: ٨٨٦، پ.: ١٧×٢٣

ناوەرۆک: نەوبەهار.

**١٣- لە بابەت مێژووی ئەدەبی كوردی یەوە- بریتی یە لە چواردە لێكۆڵینەوە**

نووسین: د. مارف خەزنەدار

چاپ: یەكەم، چ.: ئەلموئەسەسە ئەلعیراقییە للدیعایە وەلتیباعە، ش.: بەغدا، ژ.س.: ٦٣٦، س.: ١٩٨٤، ل.: ٥٠٦، پ.: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: بڵاوكردنەوەی دەستنووس: تێكستی مەم و زین/ دەستنووسی ژمارە (B٢٥١٤)/ تێكستی مەم و زین/ فەرهەنگۆكی تێكستی مەم و زین.

**١٤- ئەدەبی کوردی**

نووسین: فریاد فازیل عومەر

بڵاوکراوەی خوێندنی کوردی بەرلین

چاپ: دووەم، چ: ؟، ش: بەرلین، ژ.س: ISBN: ٣- ٩٢٣٤٤٦- ٢٧- ٦، س: ١٩٨٦، ل: ١٨٠، پ: ٢١×١٥

ناوەرۆک: ئەحمەدی خانی.

تێبینی: وەک لە چاپی دووەمدا نووسراوە، دیارە چاپی یەکەمی ساڵی ١٩٧٦ لە سلێمانی چاپکراوە و دەستمان نەکەوتووە.

**١٥- گوتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان**

کۆمکرن و پێشگۆتن، ژێرا نڤیسین و پاشکۆ بۆ ڤەکرین: حجی جەعفەر

بە یارمەتیی ئەمیندرایێتیی گشتیی رۆشنبیری و لاوان چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: عەلا، ش: بەغدا، ژ.س: ٢٢، س: ١٩٨٦، ل: ١٨٠، پ: ٢٤×١٧

ناوەرۆک: پاشکو پەند و هۆزانڤان: ئەحمەدێ خانی.

**١٦- سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی شەهید (پشکۆ)**

کۆکردنەوە و رێکخستن: سامان مارف بەرزنجی و عومەر مەعرووف بەرزنجی

لەسەر ئەرکی بنەماڵەی مارف بەرزنجی چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: رۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٣، ل: ٤٣٢، پ: ٢٣×١٦

ناوەرۆک: بەشی چوارەم: مەم و زینی خانی یا گیانی خانی هەژار کردوویە بە موکریانی.

**١٧- مێژووی وێژەی کوردی- نووسراوی ٢**

نووسین: سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)

بڵاوکراوەی ئینتیشاراتی ناجی لە بانە

چاپ: یەکەم، چ: چهر تبریز، ش: تەورێز، ژ.س: ؟، س: ١٣٧٥ (١٩٩٦)، ل: ٢٦+٧٤٢، پ: ٢٤×١٧

ناوەرۆک: هۆنەرانی دەوری خالیدی: شێخ ئەحمەدی خانی.

**١٨- چێشتی مجێور**

نووسین: عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی (هەژار)

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: پاریس، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٧، ل: ٥٨١، پ: ٢١×١٥

ناوەرۆک: وەرگێڕانی مەم و زینی خانی بە موکریانی/ چاپی مەم و زین.

تێبینی: ئەم چاپی یەکەمە ناوەرۆکی بە وردی بۆ ئامادە نەکراوە، لەکاتێکدا ئامادەکار (ماجید مەردۆخ رۆحانی) لە چاپی دووەمدا ناوەرۆکێکی وردی بۆ ئامادە کردووە، لەبەرئەمە ناوەرۆکی ئەو چاپەمان بۆ ئەم چاپە هێناوە.

**١٩- ٢١ دەستنووسی کوردی (و فارسی سەبارەت بە کورد) لە کتێبخانەکانی بەریتانیا**
نووسین: ئەنوەر سوڵتانی
چاپ: یەکەم، چ: ئەرزان، ش: بەریتانیا، ژ.س: ISBN: ٩١-٨٨-٨٨-٠-٣٤٦، س: ١٩٩٧، ل: ١٨٨، پ: ١٥×٢٠
ناوەرۆک: دەستنووسە کوردییەکان/ مەم و زین: ئەحمەدی خانی/ نۆبار: ئەحمەدی خانی/ عەقاید: ئەحمەدی خانی.

**٢٠- کورد و ئەکراد**
نووسین: سەیدا مەلا حسێن یوسف مارونسی
ئامادەکردن: نیعمەت مارونسی
چاپ: یەکەم، چ: زانا، ش: دهۆک، ژ.س: ١٨٧، س: ١٩٩٧، ل: ١٨٩، پ: ١٤×١٩
ناوەرۆک: دیروکا ژیانا ئەحمەدێ خانی.
تێبینی: ساڵی لەسەر نییە و بە پێی مێژووی نووسینی پێشەکییەکەی لەم ساڵەدا دانراوە.

**٢١- بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە- بەرگی یەکەم**
ئامادەکردن: محەممەد عەلی قەرەداغی
چاپ: یەکەم، چ: وەمیز، ش: بەغدا، ژ.س: ١٤٠، س: ١٩٩٨، ل: ٣٩٢، پ: ١٧×٢٣
ناوەرۆک: مەم و زین/ وێنەی لاپەڕەی یەکەمی دەستخەتی نەوبەهاری خانی.

**٢٢- پەخشانی کوردی**
نووسین: عەبدولڕەزاق بیمار
بڵاوکراوەی دەزگای ڕۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی
چاپ: یەکەم، چ: دار ئەلحورییە، ش: بەغدا، ژ.س: ٣٩٤، س: ١٩٩٨، ل: ٣٠٤، پ: ١٧×٢٤
ناوەرۆک: بەشی دووەم: کورتە مێژوویەکی پەخشانی کوردی/ ئەحمەدی خانی.

**٢٣- ساڵنامەی کوردی ٢٦٩٩**
ئامادەکردن: کازم کۆیی
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٥٨، س: ١٩٩٨، ل: ٣٢، پ: ١٢×١٧
ناوەرۆک: ژیاننامەی هەریەک لەم شاعیرانە و نموونەیەک لە شیعرەکانیان: ئەحمەدی خانی.

**٢٤- شیعر و تەوەر**

نووسین: حەمەسەعید حەسەن

چاپ: یەکەم، چ: ئاپێک، ش: ستۆکهۆڵم، ژ.س: ISBN ٩١- ٩٧٢٠٩٧- ٦- ٧، س: ١٩٩٨، ل: ٢١٤، پ: ١٣×٢٠

ناوەرۆک: خوێندنەوەیەکی دیکەی مەم و زینی خانی.

**٢٥- زریزەی زێڕین**

نووسین: محەممەد ساڵح ئیبراهیمی

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٢٧، س: ١٩٩٩، ل: ١٦٦، پ: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: ئەحمەدی خانی.

**٢٦- بارانی سلێمانی- بەرهەمی بڵاونەکراوە و لەیادکراوی محەمەد ساڵح دیلان**

نووسین: محەممەد ساڵح دیلان

ئامادەکردن: ئومێد ئاشنا

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٧٧، س: ٢٠٠١، ل: ١٤٤، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: بەشی دووەم: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی- ئەحمەدی خانی.

**٢٧- درامای کوردی لە ناو درامای جیهاندا**

نووسین: حەمەکەریم هەورامی

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٣٠٣، س: ٢٠٠١، ل: ٤٠٨، پ: ١٧×٢٣

ناوەرۆک: مەم و زین.

**٢٨- دەربارەی ئەدەب و مێژوو**

نووسین: ئومێد ئاشنا

بڵاوکراوەی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ

چاپ: یەکەم، چ: داناز، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٤٠، س: ٢٠٠١، ل: ٣٥٣، پ: ١٦×٢١

ناوەرۆک: شیعرێکی ئەحمەدی خانی لە ستایشی فەقێی تەیران.

**٢٩- دەفتەری کاف- لێکۆڵینەوەی ئەدەبی**

نووسین: فەلەکەدین کاکەیی

بڵاوکراوەی بزاڤی ڕۆشنبیریی نوێخواز

چاپ: یەکەم، چ: ڕۆشنبیر، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٢٣، س: ٢٠٠١، ل: ١٥٢، پ: ١٦×١١

ناوەرۆک: ئەحمەدی خانی- پەیامی ڕزگاری و شادومانی.

**٣٠- شانۆگەرییەکانی سلێمانی لە ساڵانی (١٩٢٦- ١٩٦١)دا**

نووسین: یاسین قادر بەرزنجی

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٦، س: ٢٠٠١، ل: ٩٨، پ: ٢٠×١٦

ناوەرۆک: شانۆگەریی مەم و زین.

**٣١- گەڕان بە دوای بووندا- یۆتۆپیای ئازادی**

نووسین: عەتا قەرەداغی

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٨٢، س: ٢٠٠٢، ل: ٣٤٦، پ: ٢٢×١٦

ناوەرۆک: ئایا ئەحمەدی خانی فەیلەسووف و بیریار بووە.

**٣٢- مێژووی ئەدەبی کوردی- بەرگی دووەم/ سەدەکانی چواردەم- هەژدەم**

نووسین: د.مارف خەزنەدار

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٠٧، س: ٢٠٠٢، ل: ٤٦٢، پ: ٢٣×١٧

ناوەرۆک: مەم و زین/ مەم و زین لە ڕووی ڕووخسارەوە/ مەم و زینی خانی و مەمی ئالانی میللی/ مەم و زین لە ڕووی کێش و قافیەوە/ دەستنووس و چاپی مەم و زین/ چیرۆکی مەم و زین لە ڕووی ناوەرۆکەوە/ مەم و زین لە پاڵ دڵداری لە ژیانی ئادەمیزاد دەدوێ/ گەشتێک لە گێتیی شیعرایەتیی مەم و زین/ موناجاتی مەزن و موناجاتی چیرۆکەکە/ نەعتی پێغەمبەر/ کوردایەتی/ سامانی نەتەوایەتی/ سەرەتای مەم و زین/ ڕاز و نیازی زین لەگەڵ مەم/ ڕاز و نیازی زین لەگەڵ پەپوولە/ ڕاز و نیازی مەم لەگەڵ دیجلە/ ڕاز و نیازی مەم لەگەڵ بای شەماڵ/ باغی میرزێندین/ مەم لە بەندیخانەدا/ ڕاسپاردە و وەسیەتی زین/ دوا دیدەنی و مردنی مەم/ زین گەشتی لای مەم دەکا/ کۆتایی چیرۆکی مەم و زین/ نوبەهارا بچووکان.

**٣٣- بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە- بەرگی پێنجەم**
نووسین: محەممەد عەلی قەرەداغی
چاپ: یەکەم، چ: ئەلخەنسائ ش: بەغداد، ژ.س: ١٠٥، س: ٢٠٠٣، ل: ٤٠٠، پ: ٢٤×١٧
ناوەرۆک: نوسخەیەکی نایابی مەم و زینی خانی.

**٣٤- پەیدابوونی ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا تا جەنگی گێتی یەکەم**
نووسین: عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٨٩، س: ٢٠٠٣، ل: ١٢٠، پ: ٢١×١٥
ناوەرۆک: بەشی دووەم: ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا لە سەدەی شانزەیەم- هەژدەیەم...: ئەحمەدی خانی.

**٣٥- خەرمان- شارا- تۆماری تەمەن- ئەرشیف ٣**
نووسین: کەریم زەند
چاپ: یەکەم، چ: ئەزمەڕ، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٧٥، س: ٢٠٠٣، ل: ٦٢٠، پ: ٢٤×١٧
ناوەرۆک: کەسێتیی ئەحمەدی خانی.

**٣٦- سەرجەمی بەرهەمی حەسەن قزڵجی**
نووسین: حەسەن قزڵجی
ئامادەکردن: موحسین قزڵجی
سەرپەرشتیار: سدیق ساڵح
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٣٤، س: ٢٠٠٣، ل: ٥٤٠، پ: ٢٩×٢٠
ناوەرۆک: سەرەتا (بۆ «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانی وەرگێڕانی هەژار).

**٣٧- سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح ٣**
نووسین: شاکیر فەتاح
کۆکردنەوە و ڕێکخستن: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٣١٤، س: ٢٠٠٣، ل: ٥٣٦، پ: ٢٣×١٧
ناوەرۆک: چیرۆکی مەم و زین لە تەرازوودا.

**٣٨- سوڕی ژیان- تۆماری تەمەن- ئەرشیف ٤**

نووسین: کەریم زەند

لەسەر ئەرکی ڕێکخراوی بەسالاچوانی نێودەوڵەتی چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: ژیر، ش: سلێمانی، ژ.س: ١١١، س: ٢٠٠٣، ل: ٥٣١، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: نەوبەهار و باوەڕی ئایینیی ئەحمەدی خانی.

**٣٩- شیعری منداڵان لە ئەدەبی کوردیدا**

نووسین: د. فازیل مەجید مەحموود

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٩٣، س: ٢٠٠٤، ل: ١٩٠، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: بەشی دووەم: سەرهەڵدانی ئەدەبی منداڵ: شیعری فێرکاری لە ئەدەبی کوردیدا/ فەرهەنگی نەوبەهاری بچووکانی ئەحمەدی خانی.

**٤٠- قوڵپی پێکەنین- لێکۆڵینەوەی ئەدەبی**

نووسین: حەمەسەعید حەسەن

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٣٩٠، س: ٢٠٠٤، ل: ٢٢٠، پ: ١٤×٢١

ناوەرۆک: خوێندنەوەیەکی دیکەی مەم و زینی خانی.

**٤١- وەغەرەك د نهێنیێن دەقیدا- ڕەخنە و ڤەکولینێن ئەدەبی**

نووسین: یاسرێ حەسەنی

بڵاوکراوەی یەکێتیی نووسەرانی کورد- لقی دهۆک

چاپ: یەکەم، چ: هاوار، ش: دهۆک، ژ.س: ٢٨٣، س: ٢٠٠٤، ل: ١٥٨، پ: ١٢×١٩

ناوەرۆک: ئەحمەدێ خانی و گازندەکا نوی.

**٤٢- بەسەرکردنەوە ٢٤ بابەتی ئەدەبی و ڕۆشنبیرییە**

نووسین: ئیسماعیل تەنیا

چاپ: یەکەم، چ: و. کشتوکاڵ، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٢٤، س: ٢٠٠٥، ل: ٢٢٤، پ: ١٦×٢٢

ناوەرۆک: وێنەی شیعری لای ئەحمەدی خانی.

**٤٣- كەلهێن ئاڤا- كۆمەكا ڤەكولین و تێكستێن كلاسیكی**

نووسین: سەعید دێرەشی

بڵاوكراوەی دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی سپیرێز

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٣٠٥، س: ٢٠٠٥، ل: ٥٥٦، پ: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: نوبهارا خانی خوندنگەهەک هێژایە/ نوبهارا ئەحمەدێ خانی نە بەس فەرهەنگە.

**٤٤- گەڕیانەك د ناڤ باغێ ئەدەبێ كوردی دا**

نووسین: ڕەشید فندی

بڵاوكراوەی یەكێتیی نووسەرانی كورد- لقی دهۆک

چاپ: یەکەم، چ: هاوار، ش: دهۆک، ژ.س: ٢٨٥، س: ٢٠٠٥، ل: ٣٨٢، پ: ١٥×٢١

ناوەرۆک: هزر ل جەم خانی/ هندە پەیڤ و زاراڤێت ئەدەبی د مەم و زینا خانی دا/ ئەڤینی د مەم و زینا خانی دا/ ڕاڤەكرنا مەم و زینێ كارەكێ بساناهی نینە.

**٤٥- پەیڤەكانی نێو هەگبەی ڕێبوارێك- ئاودەلۆك**

نووسین: عەبدوڵڵا شەریف

بڵاوكراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوكردنەوەی هەولێر

چاپ: یەکەم، چ: و. ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٨٣، س: ٢٠٠٦، ل: ٢٤٧، پ: ١٦×٢٢

ناوەرۆک: فیستیڤاڵەكەی ئەحمەدی خانی موژدەی ئاشتبوونەوەی ڕاگەیاند.

**٤٦- ناسیۆنالیزمی كوردی- خەبات بۆ دەوڵەتێكی نەتەوەیی**

نووسین: كاوە ئەمین

بڵاوكراوەی دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٦٢، س: ٢٠٠٦، ل: ٧٩، پ: ١٥×٢١

ناوەرۆک: بیرە ناسیۆنالیستەكانی ئەحمەدی خانی.

**٤٧- ئەندێشە جوانەكانی ڕۆح لە شیعری كوردیدا**

نووسین: ڕەئووف حەسەن

بڵاوكراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوكردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٨٦٥، س: ٢٠٠٧، ل: ١٦٤، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: ئیماژە و هێما لە پێشەكی و پاشەكییەكانی مەم و زینی ئەحمەدی خانی دا/ خوێندنەوەیێكی دیی مەم و زینی ئەحمەدی خانی/ بریا بەكر مەرگەوەڕ نەگەڕابایەوە.

**٤٨- چێشتی مجێور**

نووسین: عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی (هەژار)

ئامادەکردن و (نوویسیار): ماجید مەردۆخی ڕۆحانی

بڵاوکراوەی ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی میهرەگان

چاپ: دووەم، چ.: ؟، ش.: تاران، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٧، ل.: ٥٦٢، پ.: ٢٤×١٨

ناوەرۆک: بڕوانە کتێبی ژمارە ١٧.

**٤٩- سەرجەمی بەرهەمە وەرگێردراوەکانی شاکر فتاح- کتێبی هەشتەم**

نووسین: شاکیر فەتاح

کۆکردنەوە و ڕێکخستن: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ.: ئاراس، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٤٧٧، س.: ٢٠٠٧، ل.: ٦٤٧، پ.: ٢٤×١٧

ناوەرۆک: وێژەیی: مەم و زین.

**٥٠- ئەدەب- کۆمەڵە وتارێکی ئەدەبی**

نووسین: د. ڕەفیق شوانی

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ.: و. ڕۆشنبیری، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٢٧٠٨، س.: ٢٠٠٨، ل.: ١٠٩، پ.: ٢٣×١٦

ناوەرۆک: بۆچی ئەحمەدی خانی مەم و زینی نووسیوە.

**٥١- سەرجەمی بەرهەم: وتارە کوردییەکان- بەرگی چوارەم**

نووسین: محەممەد ڕەسووڵ هاوار

ئامادەکردن: ڕەفیق ساڵح

بڵاوکراوەی بنکەی ژین

چاپ: یەکەم، چ.: شڤان، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ١٤٦٩، س.: ٢٠٠٨، ل.: ٤٤٢، پ.: ٢٤×١٧

ناوەرۆک: شیعر و شاعیرەکانمان: ئەحمەدی خانیێ.

**٥٢- چێشتی مجێور**

نووسین: عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی (هەژار)

ئامادەکردن و (نوویسیار): ماجید مەردۆخ ڕۆحانی

بڵاوکراوەی پەخشانگای ئازادی

چاپ: سێیەم، چ.: ؟، ش.: ؟، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٩، ل.: ٥٦٠، پ.:٢٤×١٧

ناوەرۆک: بۆ ناوەرۆک بڕوانە کتێبی ژمارە ١٧.

**٥٣- ڕۆڵی مارگریت ڕوودینکۆ لە بوژاندنەوەی کەلەپووری کورددا**

نووسین: پ. د. شوکریە ڕەسووڵ

چاپ: یەکەم، چ: ز. سەلاحەدین، ش: هەولێر، ژ.س: ٤١، س: ٢٠٠٩، ل: ١٣١، پ: ٢٣×١٦

ناوەرۆک: بەشی دووەم: مەم و زینی ئەحمەدی خانی/ شیعرە بڵاونەکراوەکانی ئەحمەدی خانی/ ئەحمەدی خانی فەرماید.

**٥٤- عەرووز لە شیعری کوردیدا**

نووسین: ئەحمەد هەردی

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: ئاسۆس هەردی

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٦٢٣، س: ٢٠٠٩، ل: ٢٤٤، پ: ٢١×١٤

ناوەرۆک: ئەحمەدی خانی/ بەشی چوارەم: بنەماکانی کەرتکردن/ کێشە عەرووزییەکانی نەوبەهاری ئەحمەدی خانی.

**٥٥- مێژووی بیری کوردی**

نووسین: مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد)

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: دووەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٣٠٥، س: ٢٠٠٩، ل: ٦٢٢، پ: ٢٥×١٨

ناوەرۆک: ئەحمەدی خانی و دەسەلاتی کوردی.

**٥٦- بیستانێن زێرین**

نووسین: دەنیس دارگول

گۆڕینی لە تیپی لاتینییەوە: ڕەشاد بێجرمانی

چاپ: یەکەم، چ: هاوار، ش: دهۆک، ژ.س: ٢٥٦٣، س: ٢٠١٠، ل: ٤٧٢، پ: ٢٠×١٤

ناوەرۆک: بەشێ سێ: هندەک سیما و بابەتێن تەیبەت- وەک: مەلایێ جزیری/ ئەحمەدێ خانی.

**٥٧- ڕۆژنامەوانیی کوردی- گۆڤاری هیوا ١٩٥٧- ١٩٦٣ بەرگی سێیەم**

لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن: د. هیمداد حسێن

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ٧٥٥، س: ٢٠١٠، ل: ٦٨٤، پ: ٢٣×١٧

ناوەرۆک: پێڕست/ ژ.١ی س.٢ ١٩٥٨: تەمسیلی چیرۆکی مەم و زین.

**٥٨- عەقیدەنامەیێن کرمانجی**

ئامادەکردن: تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی

چاپ: یەکەم، چ: حاجی هاشم، ش: هەولێر، ژ.س: ٢١٤، س: ٢٠١٠، ل: ١١٤، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: پێشگۆتن/ عەقیدەنامەیا ئەحمەدێ خانی.

**٥٩- کۆواری دەنگی گێتیی تازە (خولی یەکەم) بەرگی دووەم (ژمارە ١- ٦) نیسانی ١٩٤٤- ئەیلوولی ١٩٤٤**

ئامادەکردن: سدیق ساڵح، ڕەفیق ساڵح و عەبدوڵڵا زەنگەنە

پڕۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٧٨، س: ٢٠١٠، ل: ٣١٥- ٩١٠+١٦، پ: ١٧×٢٤

ناوەرۆک: ناوەرۆکی ژ.٢: مەم و زین بە شێوەی موکری: تۆفیق وەهبی.

**٦٠- کە بازنە و لاکێشەکان هەڵدەوەشێنەوە- ئاخاوتەی سیاسی و فەرهەنگیی کورد، دوێنێ و ئەمڕۆ**

نووسین: فەرهاد شاکەلی

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٦، س: ٢٠١٠، ل: ٢٤٧، پ: ١٥×٢٣

ناوەرۆک: بەشی دووەم: ٣٠٠ ساڵەی مەم و زینی خانی.

**سەرچاوە:**

بوار نوورەدین، کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان
لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠، تاران- ئێران، ٢٠١٦.



كاروان عوسمان خەیات «ڕێبین»/ تاران

# دەستنووسی زانایانی کورد

## لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعاریفی گەورەی ئیسلامی ئێران لە تاران

**ژمارەی دەستنووسی زانایانی کورد تاکو ئێستا بەشێوەیەکی زانستی و ڕێژەیی، ئەژمار نەکراوە و نازانرێت چەندە، لە ڕاستیدا ئەمەیش شتێکی مەحاڵە. بەڵام دەکرێت لە ڕێگەی پێڕستکردن و ناساندنیانەوە ڕێژەیەکی سادەی لێ بە دەست بهێنرێت. دەستنووسی زانایانی کورد لە وڵاتی ئێراندا و بەتایبەتی لە کتێبخانەکانی تارانی وەکو: کتێبخانەی گشتیی تاران، کتێبخانەی پارلەمانی ئێران، کتێبخانەی میللی مەلەک، کتێبخانەی زانکۆی تاران و کتێبخانەی دائیرەتولمەعاریفی گەورەی ئیسلامی ئێران، ئەژمار بکەین، خۆی لە چەند هەزار نوسخەیەک دەدات و کتێبگەلێکی زۆری تێدایە و هێشتا کەس ئاگای لە خاوەنەکەی نییە و بووەتە ژێر گەردوخۆڵ و جەوری زەمانەوە، لە دەورەی خۆیدا ئەم زانایە، عالمێکی گەورە بووە و جێی پرسوڕا بووە...**

لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٩ەوە چەند کەسێکم لە ئێران ناسی و لە ڕێگەی ئەوانەوە چەند دەستنووسێکم لە کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی تاران و جێگاکانی تری لە ئێران دەست کەوت، وردەوردە دەستم کرد بە وەرگرتنەوەی ئەو دەستنووسانە، ساڵی ٢٠١٣ وەکو خوێندکار لەو زانکۆیەدا وەرگیرام، یەکێک لەو هیوایانەم و پێشتریش لەگەڵ چەند جێگای ئەکادیمی و دەوڵەمەند و ناسراودا قسەم کرد کە هەوڵ بدەین ئەم دەستنووسانە بکڕینەوە و بیانهێنینەوە بۆ کوردستان و ناوەندێکی بەڵگەنامەیی و دەستنووسی نیشتمانیی بۆ کوردستان دابمەزرێنین، بەڵام ئەم هیوا و ئاواتەیان لە گۆڕ نا. لێ کۆڵم نەدا و بەپێی ئەو بودجەیەی هەم بوو، توانیم نوسخەکانی هەندێک کتێبخانە بکڕمەوە و ئەوانەیشی نوسخەکانیان نەدەدا، تا ئەم کاتەیش هەر لە هەوڵداندام بۆ بەدەستهێنانیان.

لێرەدا پێم خۆشە بەشێکی کەم لەو دەستنووسانەی کتێبخانەی دائیرەتولمەعاریفی گەورەی ئیسلامی ئێران لە تاران بناسێنم، دەستنووسی زانایانی کورد لەم کتێبخانەیەدا خۆی لە ١٥٠ دەستنووس لە بوارە جیاجیاکاندا دەدات، مێژوو، فیقهـ، کەلام، عیرفان، سەرف، نەحو، جوگرافیا و شیعر... دەستنووسەکان بە سێ زمان کوردی، عەرەبی و فارسیین.

ئەم دەستنووسانە هەندێکیان بەرهەم و دەستنووسی سەربەخۆن و هەندێکی تریشیان دوو یا سیان یان زیاتر لە دەستنووسێکدان، واتە مەجمووعە یان کەشکۆڵن. بەشێک لەمانەیش بەهۆی ئەوەی مەجمووعە یان کەشکۆڵن، هەر بەرهەمێکیان ژمارە و کۆدی تایبەتی خۆیان هەیە، لێرەدا من تەنیا ناوی بەرهەمم تۆمار کردووە، بە یارمەتی خوا لە بابەتێکی تردا هەموو ئەوانەی مەجمووعە یان کەشکۆڵن، بە جیاواز دەیانناسێنم.

ئەم دەستنووسانە یان خاوەن دانراوەکە کوردە و بە زمانی عەرەبی یان کوردی یان فارسی نووسیویەتی، نووسەر و کاتب هەر خۆیەتی، یان خاوەن نووسراوەکە کوردە و کەسێکی کورد یان فارس یان عەرەب نووسیویەتییەوە، یان نووسینەکە هی کورد نییە و کوردێک کاتبی ئەم دەستنووسەیە...

ئەم بابەتە بەشی یەکەمی ناساندنی دەستنووسی زانایانی کوردە لەم کتێبخانەیەدا و بە چەند بابەتێک هەموویان دەناسێنم و وێنەی چەند پەڕەیەکیش لە دەستنووسەکان لێرەدا دادەنێم.

لەم بابەتەدا ناساندنەکە بە کورتییە، واتا: ناوی کتێب، نووسەر، نووسەری دەستنووس «کاتب»، ساڵی نووسین یا دەستنووس، زمان، بابەت، ژمارەی دەستنووس، ئەندازە، شێوەی خەت، جۆری کاغەز، لاپەڕە، سەرەتا و کۆتاییی دەستنووسەکە و تێبینیی لەسەر دەستنووسەکە. هەندێک لە دەستنووسەکان جۆری کاغەز یان ناوی کاتب یا ساڵی نووسینەوەکەی دیاری نەکراوە، لێرەدا بە نیشانەی «؟، ---، بێ‌تا...» ئاماژەم پێیان کردووە.

نابێت بەسەر ئەوەیشدا بڕۆم، تا نووسینەوەی ئەم بابەتە و ناردنی بۆ گۆڤارەکە، چەندین نامە و ئیمەیڵ و هەوڵی تاکەکەسی، چی لە ڕێگەی کارمەندی خودی دائیرەتولمەعاریف و چی لە ڕێگەی مامۆستاکانی زانکۆ و تەلەفونەوە، بە هەر جۆرێک بووە نوسخەکان وەربگرمەوە، هەوڵەکانم بێئاکام بوون، بۆیە نەمتوانی نوسخەکانی ئێرە بەدەست بهێنم.

ئەم دەستنووسانە لە کتێبی پێڕستی دەستنووسەکانی دائیرەتولمەعاریفی گەورەی ئیسلامی ئێران لە تاراندا ناسێندراوە و هەوڵم داوە وەرگێڕانەکە بەجۆرێک بێت و دەستەواژەکان تا جێگایەک کوردیی پەتییان بۆ بەکار ببەم و زانیارییەکانیش وردتر و بابەتیانەتر بێت. لێرەدا هەر ئەوەندە لەسەر ئەم بابەتە دەنووسم، لە داهاتوودا هەوڵ دەدەم هەموو ئەوانەی تریش وردتر و زیاتریان لەسەر بنووسم و هەموویشیان شەنوکەو بکەم.

## پێڕستی دەستنووسەکانی کتێبخانەی دائیرەتولمەعاریفی گەورەی ئیسلامی ئێران لە تاران

### ١- ناوی کتێب: دیوانی پرتەو؛

زمان: کوردی؛

بابەت: هۆنراوە؛

ناوی نووسەر: لەوانەیە موحەممەدکازم ئاقا موحەممەد پەرتەوی کوردستانی لوڕی بروجەردی (١٢٤٧ق/١٨٣١) بێت؛

ناوی کاتب: ؟

ژمارەی کتاب: ٦٦٥٩٥؛

ئەندازە: ١٤-١٥×١٠سم؛

ساڵی نووسین: پەراوێز ١٢٣٠ق؛

شێوەی خەت: نەسخ و نەستەعلیق و تەحریری؛

لاپەڕە: ١٤گ.

جۆری کاغەز: نەباتی.

سەرەتای کتێب: ای اوَلی کو نینە ژِ بوتە چو ابتدا/ ای آخری نِهن ژِ تَرا هیچ انتها؛

کۆتاییی کتێب: ای زین زیادت فتوت/ ای عین عنایت و مروت؛

تێبینی: ئەم دیوانە بریتییە لە ١٨٨ غەزەل، قەسیدە، مەسنەوی و موخەمیس، غەزەلەکانیش بە تەرتیبی سەرواکان ڕیزبەند کراوە.

### ٢- ناوی کتێب: پەرێشاننامە؛

زمان: کوردی؛

بابەت: مەسنەوی عیرفانی؛

ناوی نووسەر: مەلا پەرێشان؛

ناوی کاتب: ؟

ژمارەی کتاب: ٦٦٥٩٢؛

ئەندازە: ٦-٧س، ٧/٥×٦سم؛

ساڵی نووسین: بێ‌تا؛

شێوەی خەت: شکەستە و نەستەعلیق تێکەڵ کراوە؛

لاپەڕە: ١٠٤گ.

جۆری کاغەز: شین و بێجی؛
سەرەتای کتێب: بسمله
من ژ بسم الله، من ژ بسم الله/ ابتدا مکم،
من ژ بسم الله؛
کۆتاییی کتێب: که پیش چشمش، شراب‌خوار
میو/ که پیش چشمش‌شراب، خوار میو؛
تێبینی: بەیتەکانی نێو ئەم دەستنووسە ٥٣٣ بەیتە.

**٣- ناوی کتێب: الشافیه؛**

زمان: عەرەبی؛
بابەت: سەرف؛
ناوی نووسەر: ئیبن حاجب؛
ناوی کاتب: بە شێوەی مۆر «موحەممەد عەلی کوڕی موحەممەد ئیبراهیم»؛
ژمارەی کتاب: ٦٦٩٢١؛
ئەندازە: ٥س، ١٠×٥سم؛
ساڵی نووسین: بێ‌تا؛
شێوەی خەت: نەستەعلیقی پوختەی تەحریری؛
لاپەڕە: ١١١گ.
جۆری کاغەز: ڕەنگاوڕەنگی ئاهاری موهرەیی.
سەرەتای کتێب: بسمله، حمدله، صلات. و بعد، فقد سألنی من لایسعنی مخالفته...؛
کۆتاییی کتێب: علی الوجهین لا حتما لهما. و اما الحروف فلم یکتب منها بالیاء غیر بلی و حتی وعلی. تمت...
تێبینی: چەند مۆرێکی لێ دراوە و نووسراوە: لا اله الا الله الملک الحق المبین موحەممەد عەلی یان موحەممەدعەلی ١٢.

**٤- ناوی کتێب: الغایة الامکان فی درایة (معرفة) الزمان و المکان؛**

زمان: فارسی؛
بابەت: عیرفان؛
ناوی نووسەر: تاجەدین مەحموود کوڕی خوداداد هەمەدانی ئشنۆیی (اشنوی، اشنهی)
ناوی کاتب: عزیزالدین نسفی؛
ژمارەی کتاب: ٦٦٩٤٥؛
ئەندازە: ---؛
ساڵی نووسین: بێ‌تا؛
شێوەی خەت: نەسخ تەحریری پوختە؛
لاپەڕە: ١٣٥ر-١٤٢ر- گ.
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: سەرەتای دەستنووس فەوتاوە، لەناو مەجمووعە دایە. بسمله. الحمدلله الذی لآخر لاولیته و لا اول لآخریته و لابطون لظاهریته...؛
کۆتاییی کتێب: الله تعالی همگنان راه روشن کرامت کند و از آفات نفسانی نگاه دارد بلطفه و کرمه و سعه رحمته. و الحمدلله رب العالمین...
تێبینی: ناوی نووسەر لە پێشەکیی کتێبەکەدا نەهاتووە، ئەم کتێبە بە ناوی چەند کەسێکەوە چاپ کراوە و ناڕوونە.

**٥- ناوی کتێب: القاموس المحیط؛**

زمان: عەرەبی؛
بابەت: فەرهەنگ؛
ناوی نووسەر: ---؛

ناوی کاتب: عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلا ئەحمەدی نۆدشەییی ئەرمانی؛

ژمارەی کتاب: ٦٦٥٣٩؛

ئەندازە: ٢٨س، ٢٢/٥×١٣سم؛

ساڵی نووسین: ١٢٥٢؛

شێوەی خەت: نەسخی عەرەبی و مەشکوول؛ وشەکان بە سولسی گەورەی ڕەش نووسراوە؛

لاپەڕە: ٤٦٠گ؛

جۆری کاغەز: بێجی؛

سەرەتای کتێب: ---؛

کۆتاییی کتێب: بۆ موحەممەدی کوڕی موحەممەدیووسفی کوڕی عەبدوڵڵای وەزیری کوردستان نووسراوە.

**٦- ناوی کتێب: الکافیه؛**

زمان: عەرەبی؛

بابەت: نەحو؛

ناوی نووسەر: ئیبن حاجب؛

ناوی کاتب: ؟

ژمارەی کتاب: ٦٦٦٩٨؛

ئەندازە: ٥س، ١١/٥×١٤سم؛

ساڵی نووسین: بێ تا؛

شێوەی خەت: نەسخی پوختە؛

لاپەڕە: ١٥١گ؛

جۆری کاغەز: بێجی ئاهاری موهرەی فەرەنگی؛

سەرەتای کتێب: بسمله. الکلمه لفظ وضع لمعنی مفرد و هی اسم و فعل و حرف...

کۆتاییی کتێب: تۆزێک کەوتنی تێدایە... الساکنه تلحق الماضی التأنیث...

**٧- ناوی کتێب: سراج الظلمة فی شرح الحكمة؛**

زمان: عەرەبی؛

بابەت: کیمیا؛

ناوی نووسەر: یەحیا کوڕی ئەبی بەکری کوڕی موحەممەدی بەرمەکی؛

ناوی کاتب: ؟

ژمارەی کتاب: ٦٦٩٣١؛

ئەندازە: ---؛

ساڵی نووسین: ١٢٤٧ق؛

شێوەی خەت: نەسخی پوختە؛

لاپەڕە: گ ٧٤پ-٨٤ر؛

جۆری کاغەز: ---؛

سەرەتای کتێب: بسمله. حمدله. خالق ما شاء فیما شاء. و مبدع الکون بلفظ حکمته... اما بعد، یقول الحکیم الرئیس یحیی بن ابی بکر محمد البرمکی...

کۆتاییی کتێب: اذهب عنا الحزن ان ربنا لغفور...

**٨- ناوی کتێب: اثبات الواجب؛**

زمان: عەرەبی؛

بابەت: کەلام؛

ناوی نووسەر: جەلالەدین موحەممەدی کوڕی دەوانی؛

ناوی کاتب: ئەحمەدی نۆدشەیی؛

ژمارەی کتاب: ٦١٣٣٦؛

ئەندازە: ---؛

ساڵی نووسین: ١٢٤١ق؛

شێوەی خەت: نەستەعلیق؛
لاپەڕە: گ ٧٢پ - ٩٣پ؛
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: سبحانک، سبحانک ما اعظم شانک و اظهر برهانک انت الشاهد... و بعد، فیقول الفقیر الی عفو ربه الحقیقی محمد... الدوانی...
کۆتاییی کتێب: مزید تفصیل انما یعتبر علیه تعلیقاتنا. ولیکن هذا آخر ماقصدت الیه فی هذه الرساله مع تفرق الحال و تشتت البال و...
تێبینی: ئەم دەستنووسە لە گوندی سەنەندج، لە مەدرەسەی شێخ موحەممەد سەعید نووسراوەتەوە، ئەم کتێبە لە مەجموعەدا هاتووە.

## ٩- ناوی کتێب: اثبات الوجود؛

زمان: عەرەبی؛
بابەت: کەلام؛
ناوی نووسەر: شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ موحەممەد سەعیدی تەختەیی [پێشەکی]؛
ناوی کاتب: ؟
ژمارەی کتاب: ٧٨٧٢٤؛
ئەندازە: ١٤-١٥×١٠سم؛
ساڵی نووسین: ئەواخری موحەرەمی ١٢٨٩ق؛
شێوەی خەت: نەسخ و نەستەعلیق؛
لاپەڕە: گ ١٤٢ر - ١٤٥پ؛
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: حمدله. صلاة. و بعد، فیقول افقر الوری الی عفو الملک المجید عبدالقادر بن محمد سعید انجاهم الله عن العذاب الشدید...
کۆتاییی کتێب: ... یعجز عن دفعه عنه سواه تعالی. کما حصل ذلک لجمیع. منهم الصدیق رض فبا المعجزه اولی. والحمد لله علی ذلک. رقم حین غلبه النوم...
تێبینی: هەندێک پەراوێزی تێدایە بە ناونیشانی «منه».

## ١٠- ناوی کتێب: اثبات الوجود؛

زمان: عەرەبی؛
بابەت: کەلام؛
ناوی نووسەر: شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ موحەممەد سەعیدی تەختەیی [پێشەکی]؛
ناوی کاتب: ئیبراهیم،
ژمارەی کتاب: ٥٧٥٧٩؛
ئەندازە: ١٤-١٥×١٠سم؛
ساڵی نووسین: ١٣٠٠ق؛
شێوەی خەت: نەسخی تەحریری؛
لاپەڕە: گ ٢٥٩پ - ٢٥٨پ؛
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: بعد حمده علی ما هدانا الی طریق الحق، طریق رسوله الی الخلق (ع) و من التسلیمات اسناها. یقول العبد الفقیر الی رحمه الله الغنی عبدالقادر بن محمد سعید الغفاری التختی. هذه زیده فی جملتین اولیهما فی المبداء.
کۆتاییی کتێب: و هذا هو نبینا محمد (ص) و اصحابه و تابعیه الی یوم القیامه رزقنا الله خیر الاولی و الاخیره بجاهه (ص) آمین. عبدالقادر مد ظله.
تێبینی: هەمان کتێبە و بەشبەندی نەکراوە، لەناو مەجموعەدا هاتووە.

**١١- ناوی کتێب: ایقاد الضرام علی من لم یوقع طلاق العوام؛**

زمان: عەرەبی؛

بابەت: فیقهـ؛

ناوی نووسەر: گردوکۆی موحەممەد فەقیر حەقیر ناسراو بە ئین حاج؛

ناوی کاتب: موحەممەدرەحیمی کوڕی لوتفوڵڵا؛

ژمارەی کتاب: ٩٥٦٠٣؛

ئەندازە: ---؛

ساڵی نووسین: ١٣٣٣ق؛

شێوەی خەت: نەسخی تەحریری؛

لاپەڕە: گ ١پ-٦پ؛

جۆری کاغەز: ---؛

سەرەتای کتێب: بسمله. الحمدلله الذی ارسل رسوله بالهدی و شرایع الاحکام... اما بعد، فهذة لقبتها ایقاد الضرام...

کۆتاییی کتێب: هذا ما اردنا ایراده بقلم الاستعجال... برسم من هو متحتم الامتثال محط اجتناء الامال، سیدنا مولانا الملقب بالغزائی، مرجع الوقایع و الفتاوی... جامعه و راقمه محمد الفقیر الحقیر الذی یتلقب بابن الحاج شهیر سنه ١١٨٦ کاتبه محمدرحیم بن لطفالله... ١٣٣٣ق.

تێبینی: ئەم کتێبە لەناو مەجموعەدا هاتووە.

**١٢-ناوی کتێب: تفسیر الایة النور؛**

زمان: عەرەبی؛

بابەت: عرفان؛

ناوی نووسەر: مەلا سەدرای شیرازی؛

ناوی کاتب: عەلیئەکبەر مەراغەیی؛

ژمارەی کتاب: ٩٧٠٦٥؛

ئەندازە: ---؛

ساڵی نووسین: پێنج شەممە، ٩ ج١٢٠٩/٢ق؛

شێوەی خەت: شکەستە و نەستەعلیق تێکەڵاو کراوە؛

لاپەڕە: گ ٣٣ر-٥٩پ؛

جۆری کاغەز: ---؛

سەرەتای کتێب: الحمد لواهب العقل و الخیر و الجود. و الصلاة و السلام علی نقطة دایرة الوجود... اما بعد، فیقول الملتجی الی باب ربه الکریم محمد المشتهر بصدرالدین بن ابراهیم، ان هذه نکات متعلقة بتفسیر آیة النور.

کۆتاییی کتێب: و غشاوة الامتراء و الشک و الانحراف عن المهجة البیضا. هذا آخر ما قصدنا ایراده و حاولنا اظهاره...

تێبینی: ئەم کتێبە لەناو مەجموعەدا هاتووە.

**١٣- ناوی کتێب: تقریب المرام فی شرح تهذیب الکلام؛**

زمان: عەرەبی؛

بابەت: کەلام؛

ناوی نووسەر: تەفتازانی؛

ناوی کاتب: شەرح و لەسەر نووسینی شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ موحەممەد سەعیدی تەختەیی [پێشەکی]؛

ژمارەی کتاب: ٧٨٧٢٤؛

ئەندازە: ---؛

ساڵی نووسین: ج۲/۱۲۹۹ق؛
شێوەی خەت: نەسخ و نەستەعلیق؛
لاپەڕە: گ ۷پ-۱۳٤ر؛
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: بسمله. نحمد من هدانا الی الطریق الاسلام، حمدا یوافی نعمه و نشکر الذی وفقنا لتذهیب الاحکام... و بعد، فیقول العبد الفقیر...
کۆتاییی کتێب: انه خیر موفق و معین. و الحمدلله رب العالمین و الصلاة... و زیادة ماتفرد به، مما لابد منه، و نقصان ما تخرجت عنه مما لاعدله. و الحمدلله اولا و آخر، و علی نبیه...
تێبینی: لەم کتێبەدا هەندێک پاوەرەقی بەناونیشانی «منه» هاتووە. نووسەرەوەی کاتب دەنووسێت: چون شارح در آغاز جوانی بدین کار دست زده بود، هنگامی که خواستم آن را استنساخ کنم، در آن دست بردم، و تصرفاتی کردم پێ دەچێت ئەم کتێبە لە لایەن نوسخەنووسییەوە دەستکاری کرابێت.

## ١٤- ناوی کتێب: جغرافیای لرستان؛

زمان: فارسی؛
بابەت: جوگرافیا؛
ناوی نووسەر: نەناسراو؛
ناوی کاتب: ؟
ژمارەی کتاب: ۹۵۷۵۱؛
ئەندازە: جۆراوجۆرە؛
ساڵی نووسین: ۱۳۱۳خورشیدی؛
شێوەی خەت: نەستەعلیقی شکەستەئامێزی تەحریری؛
لاپەڕە: ۲۹۰گ؛
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: مقدمه. جهت مطالعۀ عمیق و تحصیل کامل وضعیت اخلاق، آداب، اطوار و سکنات هر قوم و ملتی...
کۆتاییی کتێب: نقشۀ خط شوشۀ خرمآباد، لرستان و بروجرد...
تێبینی: بە چەند بەش و قسمەت دابەش کراوە و باس لە هێرشی ساڵی ۱۳۲۰ی خورشیدی دەکات بۆ ناوچەی لوڕستان....

## ١٥- ناوی کتێب: جنگ کردها و روس‌ها؛ وقایع کردها؛

زمان: فارسی؛
بابەت: مێژوو؛
ناوی نووسەر: نەناسراو؛
ناوی کاتب: ؟
ژمارەی کتاب: ٦١٣٧٥؛
ئەندازە: ۱۲س، ۱٤/۵×۷/۵سم؛
ساڵی نووسین: بێ‌تا.
شێوەی خەت: نەستەعلیقی تەحریری شکەستە؛
لاپەڕە: ۱۵گ؛
جۆری کاغەز: کاغەزی فەرەنگی؛
سەرەتای کتێب: بسمله. در ذکر احوالات آمدن اکراد به تبریز و فرار روس‌ها، و مراجعت کردن روس‌ها به تبریز و شکست اکراد. در آن ایام که جنگ آلمانی‌ها در عین شدت اشتهار یافته بود. و همۀ بلاد اسلام را کرامت فرماید.
کۆتاییی کتێب: خداوند مقدمش را خیر و همۀ بلاد اسلام را کرامت فرماید.

تێبینی: دەربارەی شەڕی رووس و دەورانی وەلیعەهدی موزەفەرەدین میرزای قاجار و شۆڕشی کوردەکانە....

**١٦- ناوی کتێب: الحاشیه علی شرح الایساغوجی؛ قول احمد؛**

زمان: عەرەبی؛
بابەت: مەنتق؛
ناوی نووسەر: ئەحمەد کوڕی موحەممەدی کوڕی خزر؛
ناوی کاتب: یووسفی کوڕی ئیبراهیمی بەرزنجی؛
ژمارەی کتاب: ٩٧٠٦٩؛
ئەندازە: ---؛
ساڵی نووسین: ١٣٧٩؛
شێوەی خەت: تەحریری؛
لاپەڕە: گ ٦١پ-١٠٥پ؛
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: بسمله. حمدالک اللهم علی ما منحت به علی من معارف الافاضل و شکرالک... اما بعد...
کۆتاییی کتێب: العقاید الباطله لیس الا به. لیکن هذا آخر الرساله فی المنطق، ختمناهو انجام ٢: لهذا حصر المنصف العقده فی البرهان. جعلنا الله معه من الواصلین الی علم الیقین لا من السامعین و اذاقنا بعنایه منه حق الیقین... نسخهٔ (٢) ١٣٧٩؛
تێبینی: ئەم کتێبە حاشیەیە لەسەر شەرحی ئیساغوجی و ناسراوە بە »الفواید الفناری«، ئەم دانراوە لەناو مەجموعەدا هاتووە.

**١٧- ناوی کتێب: الحاشیه علی شرح الملخص؛**

زمان: عەرەبی؛
بابەت: مەعانی و بەیان؛
ناوی نووسەر: چوغمەینی –قازیزادەی ڕۆمی- بیرجەندی؛
ناوی کاتب: حەسەنی کوڕی عەبدولغەفووری کوڕی جامی حوسەینی پیرخزری مەیسەمی ساوقبلاغی؛
ژمارەی کتاب: ١٠٧٦٢١؛
ئەندازە: ---؛
ساڵی نووسین: ٢٣ی ڕەمەزانی ١١٢٥ق؛
شێوەی خەت: نەسخی تەحریری پوختە؛
لاپەڕە: گ ٧٣پ-١٤٥ر؛
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: ---؛
کۆتاییی کتێب: ---؛
تێبینی: ئەم دەستنووسەیش هەر لەناو مەجموعەدا هاتووە و نە سەرەتا و نە کۆتاییەکەی روون نییە.

**١٨- ناوی کتێب: الحشر؛**

زمان: عەرەبی؛
بابەت: کەلام؛
ناوی نووسەر: نەناسراو؛
ناوی کاتب: عەلیئەکبەری مەراغەیی؛
ژمارەی کتاب: ٩٧٠٦٥؛
ئەندازە: ---؛
ساڵی نووسین: ١٢٠٧ق؛
شێوەی خەت: نەستەعلیقی تێکەڵاو بە

شکەستە؛
لاپەڕە: گ ۳۱پ-۳۲پ؛
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: بسمله. فی أن عذاب القبر حق بقول مجمل کل من شاهد بنور البصیره باطنه فی الدنیا...
کۆتاییی کتێب: علی نفوسهم. و یحشر علی صور تلک الحیوانات فی الدار الاخره و اذا الوحوش...

### ١٩- ناوی کتێب: الحکمه العرشیه؛

زمان: عەرەبی؛
بابەت: فەلسەفە؛
ناوی نووسەر: صدرا شیرازی؛
ناوی کاتب: عەلیئەکبەر مەراغەیی؛
ژمارەی کتاب: ٩٧٠٦٥؛
ئەندازە: ---؛
ساڵی نووسین: ١٢٠٧/٨/٥ق؛
شێوەی خەت: نەستەعلیقی تێکەڵاو بە شکەستە؛
لاپەڕە: گ ٢پ-٣١ر؛
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: الحمد لله الذی جعلنا ممن شرح صدره للاسلام فهو علی نور من ربه... اما بعد، فیقول العبد المحتاج الی عفو رب...
کۆتاییی کتێب: اعاذنا الله و اخواننا المؤمنین شر الشیاطین و المضلین و نور قلوبنا بانوار الحکمه و الیقین بحق محمد و آله الطاهرین سلام الله علیهم اجمعین برحمتک یا ارحم الراحمین.
تێبینی: ئەم بابەتەیش هەر لەناو مەجمووعەدا هاتووە.

### ٢٠- ناوی کتێب: دقایق الاخبار؛

زمان: عەرەبی؛
بابەت: عەقیدە؛
ناوی نووسەر: نەناسراو؛
ناوی کاتب: موحەممەدسالەح؛
ژمارەی کتاب: ٦١٣٢٦؛
ئەندازە: ---؛
ساڵی نووسین: دوشنبە، سەفەر ١٢٩٤ق؛
شێوەی خەت: نەستەعلیق تەحریری پوختە؛
لاپەڕە: گ ١ر-٦٥پ؛
جۆری کاغەز: ---؛
سەرەتای کتێب: بسمله. الحمد لله افضل بنیآدم بالعلم و العمل و الکرم علی جمیع الخلق... اردت ان. اظهر لهم شمه من ذلک الاصل... و سمیته بدقایق الاخبار...
کۆتاییی کتێب:... فقال یا موسی لا یعلم قدره الا أنا. تمام شد کتاب دقایق الاخبار... از دست...
تێبینی: لەناو مەجمووعەدا هاتووە و لە سەنەندجدا نووسراوەتەوە.

## سەرچاوەکان


منزوی، احمد (١٣٧٧): فهرست نسخه‌های خطی کتابخانۀ مرکز دائرة المعارف بزرگ اسلامی، جلد یکم (گنجینۀ اهدایی خاندان سلطانعلی سلطانی، مرکز دائرة المعارف بزرگ اسلامی، تهران.
منزوی، احمد (١٣٨٤): فهرست نسخه‌های خطی کتابخانۀ مرکز دائرة المعارف بزرگ اسلامی، جلد دوم، از شماره ٥٤٢-١١٥٠، مرکز دائرة المعارف بزرگ اسلامی (بخش کتابخانه)، تهران.



پ.د.ئاراس محەمەد صاڵح

# بنەماڵەی زانستی خاڵ

## داربەڕوویەک پێنج سەدە لە خزمەتی زانستدا

بنەماڵەی خاڵ یەکێکن لە بنەماڵە زانستییە دێرینەکانی کوردستان، ڕشتەی خێزانەکەیان دەچێتەوە سەر پیرخدری شاهۆ، ساداتی پیرخدری شاهۆ لە هەموو کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە و خزمەتی ئایین و زانستیان کردووە، یەکێک لە لقەکانی ئەم خێزانە زانستییە لە گوندی (چۆڕ)ی سەر بە شاری مەریوانی ڕۆژهەڵات نیشتەجێبوون، سەیدەکانی چۆڕ لە هەموو کوردستاندا ناسراون و جێگەی خۆشەویستی خەڵکین.

زانای گەورە مەلا ئەبوبەکری موصەنیفی چۆڕی ساڵی(٩٠٣ک-١٤٩٨ز) لەدایکبووە و ساڵی (١٠١٤ک-١٦٠٥ز) کۆچی دوایی کردووە، باپیرە گەورەی سەیدەکانی چۆڕە، ئەم زانا بەهرەمەندە لە ڕۆژگاری هەڵۆخانی میری ئەردەڵاندا مامۆستای مزگەوتی سور بووە لە قەڵای مەریواندا، ئەم میرە زۆر ڕێزی گرتووە و مزگەوت و خوێندنگەکەی بۆ نۆژەنکردوەتەوە، هەر لەلایەن هەڵۆخانەوە گوندی چۆڕی پێدراوە و مزگەوت و خوێندنگەی تیدا کردووەتەوە، هەڵۆخان بەشێک لە داهاتی گوندی (نەنە)شی پێداوە بۆ پێویستی مزگەوت و پرۆسەی خوێندن.

لە دوای کۆچی دوایی مەلا ئەبوبەکر چوار کوڕی لەدوا بەجێماوە، ئەوانیش: مەلا عەبدولکەریم، مەلا یوسف جان، مەلا مەحمود، مەلا محەممەد، مەلا ئەبوبەکر ئامۆژەگاری کوڕەکانی کردووە هەموو کات گرنگی بە زانست و خوێندن بدەن و نازناوی مەلا هەڵبگرن نەک سەید، هەربۆیە هەموویان بە مەلا ناوبراون.

بنەماڵەی خاڵ دەچنەوە سەر مەلا محەمەدی کوڕی مەلا ئەبوبەکری موصەنیف، لە دوای کۆچی دوایی مەلا محەمەد مەلا مەحمودی کوڕی ناسراو بە (مەولانا مەحمود) لە جێگەی دانیشتووە و تەدریسی کردووە، مەلا مەحمود دوو کوڕی لە دوا بەجێماوە بەناوەکانی مەلا عەلی و مەلا حەسەن، مەلا حەسەن چووەتە گوندی قزلجەی نزیک پێنجوێن و خوێندنگە و مزگەوتی هەبووە و خزمەتی زۆری کردووە.

لە دوای ساڵانێک لە خزمەت بە ئایین و زانست لە قزلجەدا مەلا حەسەن کۆچی دوایی کردووە، لە دوای کۆچی دوایی مەلا حەسەن مەلا عوسمانی کوڕی جیگەی گرتووەتەوە، مەلا عوسمان  لە قزلجەدا نەماوەتەوە و چووەتە قەڵاچوالان کە لەو ڕۆژگارەدا پایتەختی میرایەتی بابان بووە، لەلایەن میری بابان و زانایانەوە ڕێزی زۆری لێگیراوە، میر مزگەوت و خوێندنگەکەی بۆ کردووەتەوە، بەردەوام بووە لەسەر خزمەتی زانست و ئایین هەتا کۆچی دوایی کردووە.

لە دوای کۆچی دوایی مەلا عوسمان مەلا شەمسەدینی کوڕی لە جێگەی دانیشتووە، لە ڕۆژگاری مەلا شەمسەدیندا پایتەختی میرایەتی باباندا لە قەڵاچوالانەوە گواستراوەتەوە بۆ سلێمانی، مزگەوت و خانوو و حەمامەکانی قەڵاچوالان تێکدراون و داروپەردوەکانیان بە باری وڵاخەبەرزە گواستراوتەوە بۆ شوێنی شاری نوێ و جارێکی تر بنیاتنراونەتەوە، داروپەردووی مزگەوتی مەلا شەمسەدینیش لە قەڵاچوالانەوە گواستراوەتەوە و لە گەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانیدا جارێکی تر مزگەوتەکە دروستکراوەتەوە.

لە دوای کۆچی دوایی مەلا شەمسەدین مەلا مستەفای کوڕی لە جێگەی دانیشتووە، مەلا مستەفا زانایەکی گەورە بووە و کراوەتە موفتی بابانەکان لە سلێمانیدا، بە مەلا

مستەفای قازی و موفتی میرەکانی بابان ناوبراوە.

ئەم مزگەوتە یەکێکە لە مزگەوتە دێرینەکانی سلێمانی، مزگەوتەکە کارێز و ئاوێکی زۆر ناوازەی تیدا بووە، حەوزێکی گەورەی هەبووە و هەموو کات پڕ بووە لە ماسی، لەگەڵ سیستمی نوێی ئاودا حەوز و کارێزەکە داپۆشراوە و سیستمی بەلوعە و تەنکی بۆ دانراوە.

ئەم مزگەوتە لەلایەن میرەکانی بابانەوە دروستکراوەتەوە و ژمارەیەک گوندی بۆ وەقف کراوە، بەپێی فەرمانێکی عەبدوڵلا پاشای بابان کە لە ڕۆژی (٥ شەوالی١٢٦٣ک-١٨٤٧/٩/١٦) دەرچووە، میر گوندی (مۆکەبە)ی لە ناحیەی سیتەکی قەزای ماوەتی وەقف کردووە بۆ مزگەوتی حاجی شێخ ئەمینی خاڵ، لەدوای نەمانی میرایەتی بابان زۆرێک لە گوندە وەقفکراوەکان لەلایەن بنەماڵە دەستڕۆیشتووەکانی ناوچەکانەوە دەستی بەسەرداگیراوەو لە مزگەوتەکان سەندراونەتەوە.

لە دوای کۆچی دوای مەلا مستەفای موفتی مەلا ئیسماعیلی کوڕی لە جێگەی باوکی بەردەوام بووە لە خزمەت بە خوێندن و زانست، لە دوای ئەو شێخ محەمەدی خاڵی یەکەمی کوڕی لە جێگەی باوکی دانیشتووە، بنەماڵەی خاڵ لەم شێخ محەمەدەوە نازناوی (خاڵ) براوە بەسەریاندا، ئەم مامۆستایە لەکاتی خوێندندا لای مامۆستاکەی دوو شێخ محەمەدی لابووە، بۆئەوەی لە یەکیان جیا بکاتەوە شێخ محەمەدی خاڵ، خاڵێک لەسەر ڕوومەتی بووە، لەوەوە ناوی ناوە شێخ محەمەدی خاڵ، لە دوای ئەوە ئیتر بنەماڵەکەیان بە خاڵ ناسراون.

حاجی شێخ ئەمینی خاڵ لە ساڵی (١٢٥٩ک-١٨٤٣ز) لەدایکبووە، لە باوەشی باوک و دایکێکی مسوڵمانی خواپەرستی ئازاد و سەربەست، دوور لە هەموو پڕوپوچێک گەورە بووە، و بەناوی خواو پێغەمبەرەوە (د.خ) مەلاشووی هەڵدراوەتەوە، لە تەمەنی حەوت ساڵیدا باوکی ئەلف و بێی فێرکردووە و پیتی پێناسیوە، پاشان قورئانی فێرکردووە، دوای ئەوە چەند نامیلکەیەکی فارسی پێگوتووە، پاشان (نصاب الصبیان)ی پێ لەبەرکردووە، ئەنجا (عوامل الجرجانی) پێگوتووە لەگەڵ شەرحەکەیدا، کە سەعدوڵلای گچکەیە، (تصریف الزنجانی)ی پێگوتووە لەگەڵ شەرحەکەیدا، کە دانراوی (عزالدین الزنجانی)یە و، شەرحی سەعدەدینی تەفتازانی لەسەرە، دوای ئەوە (مطول) و (سەعدوڵلای گەورە)و (الوضع والاستعارة) و (منهاج الامام النووی) خوێندووە، پاشان دەستی بە خوێندنی (جامی) کردووە، لە باسی (تنازع)دا، باوکی بە گەنجی لە ساڵی (١٢٨٣ک-١٨٦٦ز) کۆچی دوایی کردووە. بەردەوام بووە لەسەر خوێندنکەی، هەتا تەواوی کردووە لای مەلا محەمەدی کەوانەدۆڵی و شێخ عەبدولقادری موهاجیری سنەیی خاوەنی (تقریب المرام) لە شەرحی (تهذیب)دا.

لە دوای  شێخ محەمەدی خاڵی یەکەم، حاجی شێخ ئەمینی خاڵی کوڕی بووەتە ئیمام مودەڕیسی ئەم مزگەوتە، لە ڕۆژگاری حاجی شێخ ئەمینی خاڵدا ئەم مزگەوتە بووەتە ناوەندێکی زانستی و عیرفانی، حاجی شێخ ئەمین خەلیفەی شێخی بەهادینی تەوێڵە بووە، پیاوێکی زاهید و خواناس و دنیانەویست بووە، پێگەی زانستی و شێخایەتی و کۆمەڵایەتی زۆر بەهێز بووە، لە ساڵی ١٩٣١ کە کۆچی دوایی کردووە و بە مەوکیبێکی ڕەسمی بەرەو گردی سەیوان بەڕێکراوە، پیرەمێردی شاعیر هۆنراوەیەکی بۆ نووسیوە، لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ:

**ئەمرۆ ڕەنگی ئاسمان شینە**
**شینی حاجی شێخ ئەمینە.**

لە دوای کۆچی دوایی حاجی شێخ ئەمین، شێخ محەمەدی خاڵی دووەمی کوڕەزای لە ساڵی ١٩٣١ کراوەتە ئیمام و مودەڕیسی مزگەوتەکەیان، لە ساڵی ١٩٣٢ شێخ محەمەدی خاڵ مزگەوتەکەی باپیری نۆژەنکردوەتەوە و دوو کۆڵەکەکەی سەردەمی قەلاچوالان کە هەتا ئەوکات لەم مزگەوتەکەدا ماون لادراون، لە ساڵی ١٩٢٨ وە شێخ محەمەدی خاڵ ئیجازەی تەدریسی هەبووە، هەتا ساڵی ١٩٣٩ کە کراوەتە قازی بەردەوام بووە لەسەر وانەوتنەوە، لە ساڵی ١٩٣٩ هەتا ساڵی ١٩٦٧ قازی بووە، بەڵام دەستی لە مزگەوتەکە بەرنەداوە و بەردەوام سەروکاری کردووە.

شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ ئەمینی خاڵە، ئەم زانا بەهرەمەندە لە ساڵی ١٩٠٤، لە شاری سلێمانی لە بنەماڵەیەکی ئایینی لەدایکبووە، سەرەتای خوێندنی لای باپیری شێخ ئەمینی خاڵ دەستپێدەکات، لای زانایانی گەورەی وەک  شێخ جەلالی قەرەداغی و شێخ عومەری قەرەداغی و مەلا حسێنی پیسکەندی خوێندوویەتی، لەکۆتایدا لای زانای ناسراو شێخ عومەری قەرەداغی ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە.

لەدوای وەرگرتنی ئیجازەی عیلمی شێخی خاڵ بەهۆی کێشەیەکی تایبەتییەوە ڕوودەکاتە شاری کۆیە و دەچێتە مزگەوت و حوجرەی مەلای گەورەی کۆیە، لەبەرئەوە هەندێ دەڵێن کە گوایە لای مەلای گەورە ئیجازەی وەرگرتووە، پێدەچێت شێخی خاڵ دوای چوونی بۆ کۆیە بۆ جاری دووەم لای ئەو زانا گەورەیەش ئیجازەی وەرگرتبێ، بەڵام چوونی بۆ کۆیە و تێکەڵاوبوونی لەگەڵ بیروئەندێشەی مەلای گەورەدا گۆڕانی گەورە لە بیر و دنیابینی خاڵدا دروست دەبێت، هەر لای مەلای کۆیە دەکەوێتە ناو بیری قوتابخانەی ئیصلاحی جەمالەدینی ئەفغانی و شێخ محەمەد عەبدەوە .

خاڵ لە ساڵی ١٩٣٩ کراوەتە قازی و لە زۆر جێگای وەک سلێمانی و هەڵەبجە و چەمچەماڵ و موسڵ و بەغدا قازی بووە، ماوەی بیست و هەشت ساڵ لەو پۆستەدا

دەمێنێتەوە، بەهۆی سەرقاڵبوونی بە قازیەتییەوە تا ڕادەیەک لە بواری نووسین و هەوڵە ئیصلاحییەکانی کە زیاتر لە ڕێگەی نووسینەکانییەوە هەوڵی بۆ دەدا دوور دەکەوێتەوە، لە ساڵی ١٩٦٧ خۆی خانەنشین دەکات و بەیەکجاری واز لە کاری ڕەسمی دەهێنێ و خۆی بۆ کاری نووسین تەرخان دەکات.

لەکاتی دەرچوونی گۆڤاری (گەلاوێژ)دا دەلاقەیەکی گەورە بۆ خاڵ دەکرێتەوە، لەسەر ڕووپەڕەکانی ئەو گۆڤارە و لە ڕێگەی تەفسیری قورئانەوە پرۆژە ئیصلاحییەکەی زیاتر بڵاودەکاتەوە، لە هەر ژمارەیەکی ئەو گۆڤارەدا تەفسیری ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بە بیرێکی نوێ و زیاتر لەژێر کاریگەری قوتابخانەی ئیصلاح و تەفسیری (المنار)دا بڵاودەکاتەوە، خاڵ لەو نووسینانەیدا زیاتر جەخت لەسەر کێشە کۆمەڵایەتی و فکری سیاسییەکانی ئەو ڕۆژگارە دەکاتەوە، لەهەمانکاتدا لەگەڵ تەفسیری ئایەتەکاندا جۆشی دەدات و پەنجە دەخاتە سەر دەرد و ئێش و ئازارەکانی کۆمەڵ و لەبەر ڕووناکی قورئاندا چارەسەریان بۆ دەدۆزێتەوە.

**بنەماڵەی زانستی خاڵ نزیکەی پێنج سەدە خزمەتی پرۆسەی خوێندن و زانستیانکردووە، لە ڕۆژگاری مەلا ئەبوبەکری موصەنیفەوە هەتا ساڵی ١٩٨٩ کە شێخ محەمەدی خاڵ کۆچی دوایی کردووە، (٤٩٢) ساڵ خاوەنی مزگەوت و مەدرەسە بوون**

ئەم هەنگاوەی خاڵ لە بواری تەفسیری گوتاری ڕۆژنامەنووسیدا (التفسير المقالی) یەکێکی ترە لە هەنگاوە تازە و نوێخوازەکانی خاڵ، لە دوای محەمەد ڕەشید ڕەزا کە لە گۆڤاری (المنار)دا، شێخی خاڵ لەسەر هەمان ڕێبازی قوتابخانەی ئیصڵاحی ئیسلامی یەکەم کەسە کە تەفسیری گوتاری ڕۆژنامەنووسی بە کوردی نووسیوە، لە دوای ئەوان ئەو شێوازە لە جیهانی ئیسلامیدا وردە وردە گەشەی کردووە، لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤار و ئێزگە و تەلەفیزۆنەکان زیاتر دەرکەوت، ئەوەی لە ڕادیۆوە پەخش دەکرا بە تەفسیری ئێزگەیی (التفسير الاذاعی)یش ناودەبرێت.

لەکاری ڕووناکبیریی و ڕێکخراوەیدا لە ساڵی ١٩٥٤ بووەتە ئەندامی کۆڕی زانیاری عێراقی، لە ساڵی ١٩٧٠ بووەتە جێگری سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد، هەر لە هەمان ساڵدا دەبێتە سەرۆکی لقی سلێمانی یەکێتی نووسەرانی کورد، لە ساڵی ١٩٧٣ کراوەتە جێگری دووەمی سەرۆکی کۆڕی زانیاری عێراقی، لە ساڵی ١٩٨٠ بووەتە ئەندامی کۆڕی

زمانی عەرەبی ئەردەنی، خاڵ بەردەوام بووە لەکاری ڕووناکبیریی و دانانی کتێب و لێکۆڵینەوەی زانستی هەتا دواساتەکانی تەمەنی.

لەبەرئەوەی شێخ محەمەدی خاڵ زانایەکی مونەوەر و ڕۆشنبیر و نووسەر بووە، لە ڕۆژگاری ئەودا مزگەوتەکەی بووەتە ناوەندێکی ڕۆشنبیریی و فەرهەنگی و شوێنی کۆبوونەوەی شاعیران و ڕۆشنبیرانی شار، هەربۆیە حەسیب قەرەداغی شاعیر لەمبارەیەوە ئەڵێ:

**قامـەتی بەرزت گەورە شـارێ بوو**
**بۆن و بەرامەت نـەوبەهـــارێ بوو**
**خامەت پەیامی بەهرە و هونەر بوو**
**خامەم لە ڕووتا دەستەونەزەر بوو**
**هیمەتت پایەی شێخ و پیران بوو**
**مەجلیست یانەی ڕۆشنبیران بوو**
**ئەی ڕۆژی هەینی، کوا ئێوارانت**
**شێخم کۆچی کرد کوێرە باوانت**
**ئەمەك لە حەوزی مزگەوتی خاڵ بێ**
**دەبێ لە دوای تۆ گۆمی بەتاڵ بێ**
**فەرهەنگی خاڵە دەریای بێ پەیە**
**شانازی کوردە فەرهەنگی هەیە**

هەروەها نووسەر (مستەفا صاڵح کەریم) ئەم مزگەوتەی بە یەکەم صاڵۆنی ئەدەبی ناوبردووە لە سلێمانیدا، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ پەیوەندی زۆری لەگەڵ زانایان و ڕۆشنبیرانی ڕۆژگاری خۆیدا هەبووە، لە کوردستاندا لەگەڵ زۆرێک لە زانا گەورەکانی وەک مەلای گەورەی کۆیەو مەلا گچکەی هەولێر و بنەماڵەی ڕەشاد موفتی و زانایانی سلێمانی و بەغداد و موصڵدا پەیوەندی هەبووە و بیروبۆچوونیان گۆڕیوەتەوە و سەردانی یەکتریان کردووە.

هەروەها لەگەڵ ژمارەیەک لە زاناکانی وڵاتانی عەرەبی پەیوەندی هەبووە، لەگەڵ شێخ عومەر وەجدی سەرۆکی (رواق الاكراد) بەشی ناوخۆیی قوتابیانی کورد لە زانکۆی ئەزهەر پەیوەندی هەبووە، لە ساڵی ١٩٥٤ شێخ مەحمود شەلتوتی سەرۆکی زانکۆی ئەزهەر نامەی بۆ ناردووە و بە زانایەکی گەورە ناویبردووە.

لە ساڵی ١٩٤٧ پەیمانگای دەستخەت و کەلەپووری کۆکاری وڵاتانی عەرەبی (جامعة الدول العربية) دوو نامەیان بۆ ناردووە، بۆئەوەی پێرستی دەستخەتەکانی سلێمانی و دەوروبەریان

بۆ بکات، شێخ محەمەدیش وەڵامی داونەتەوە و ئامادەیی دەربڕیوە بۆ ئەوە کارە.

لە ساڵی ١٩٥٧ چاپی یەکەمی کتێی (پەندی پێشینان)ی بڵاوکردوتەوە، بەم هەنگاوەش خزمەتی گەورەی بە ئەدەب و کەلەپووری کوردی کردووە، هەر لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا کتیبەکانی (موفتی زەهاوی، البیتوشی، الشیخ معروف النودهی) بڵاوکردووەتەوە، هەر لەو ساڵانەدا لە گۆڤاری (المجمع العلمي العراقي) ژمارەیەک توێژینەوەی بەپێزی نووسیوە.

لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا بەچڕی دەستیکردووە بە نووسینی تەفسیری خاڵ، توانیویەتی جزمی یەکەم و دووەم و سێیەم تەواو بکات، هەروەها تەفسیری جزمەکانی (٢٧ و ٢٨ و ٢٩ و ٣٠) قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە و چاپی کردوون.

بنەماڵەی زانستی خاڵ نزیکەی پێنج سەدە خزمەتی پرۆسەی خوێندن و زانستیانکردووە، لە ڕۆژگاری مەلا ئەبوبەکری موصەنیفەوە هەتا ساڵی ١٩٨٩ کە شێخ محەمەدی خاڵ کۆچی دوایی کردووە، (٤٩٢) ساڵ خاوەنی مزگەوت و مەدرەسە بوون و خزمەتی زۆری زانست و نووسین و پرۆسەی خوێندن و مزگەوتیان کردووە.

ئەوەی جێگەی خۆشحاڵی هەموو لایەکە لە ساڵی ٢٠٢١ لەلایەن لیژنەیەکەوە و بەسەرپەرشتی ناوەندی ڕۆشنبیری و هزری خاڵ دەستکرا بە کۆکردنەوە و نووسینەوەی سەرجەمی بەرهەمەکانی خاڵ، سوپاس بۆ خوای گەورە توانرا لە ماوەی ساڵێکدا هەموو بەرهەمەکانی جارێکی لە (٨) بەرگی قەبارە گەورە و ناوازەدا بەناوی (کۆبەرهەمی شێخ محەمەدی خاڵ)ـەوە جارێکی تر چاپ و بڵاوبکرێتەوە.

## سەرچاوەکان

– عبدالکریم المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، الطبع الأولى، بغداد، ١٩٨٤.

٢- شێخ موحەممەدی خاڵ، بەشێک لە ژیانی حاجی شێخ ئەمینی خاڵ، ئامادەکردنی: د.ئاراس محەمەد صاڵح، چ١، سلێمانی، ٢٠٢١.

٣/ ڕۆڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیری، ژمارە (٢٩) شێخ موحەممەدی خاڵ مونەوەرێکی گەورە و چراخانێکی زمانی کوردی.

٥/ د.ئاراس محەمەد صاڵح، مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ لە کۆمەڵە دیدارێکی ڕۆژنامەنووسیدا، چ١، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی ،٢٠١٥.

٦/ عمر علی محمد، الشیخ محمد الخال مفسرا، الطبعة الاولی، أربیل، ٢٠٠٥.






# کۆبەرهەمی شێخ محەمەدی خاڵ




**کتێبی نوێی ڕێکخراوی هزیی و ڕۆشنبیریی خاڵ**

**ئێستا لە کتێبخانەکاندایە**



ڕیکلام

# زنجیرەی توێژینەوەکان

## سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی



























# دواخاڵ ٧

**پ.د. یادگار لەتیف شارەزووری**
**کۆلیژی زمان - زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر**

# دەوڵەتی خراپەکاری و دەوڵەتی مۆز

(دەوڵەتی خراپەکاری – دولة الفجور State of debauchery) چەمکێکە (لەوانەیە ببێتە زاراوایەکی زانستە سیاسییەکان) بۆ ئەو دەوڵەتانە، یاخود ڕژێمانە بەکاردەهێرێت، کە هەموو داهات و گشت سەروەت و سامانی دەوڵەت بە موڵکی تایبەتی خۆیان دەزانن، بە ڕەوای دەزانن دەستبگرن بەسەر هەموو خێروبێری وڵاتدا، بەسەر خۆیان و نەوە و خزم و دارودەستەکەیاندا دابەشی بکەن. توێژەران دەڵێن ئەم کارە ئەوپەڕی پێشێلکارییە بەرامبەر (دەوڵەوتی یاسا – دولة القانون)، هەروەها ئەوپەڕی پێشلێکارییە بەرامبەر مافی مرۆڤ و کەرامەتی مرۆیی (استهداف أهل السنة، د. نبیل خلیفة: ١٠٠).

توێژەری مارۆنی لوبنانی (د. نبیل خلیفة)، یەکێکە لەو توێژەرانەی ئەم چەمکە یاخود زاراوەیەی بەکارهێناوە و توێژینەوەی وردی لەسەرکردووە. ئەو پێی وایە هەڵسوکەوتی ئەم جۆرە ڕژێمانە دەبێتە مایەی پشێوی کۆمەڵایەتی و ئاشووبی دووبەرەکی، دابڕانی قوڵیش لە نێوان دەسەڵات و گەلدا دروستدەکات. لەیەک تێنەگەیشتن و ناحەزبوون بە یەکتری دەبێتە ڕووخساری دیاری پەیوەندی نێوانیان. لەبەرئەوەی ئەوان – واتە چینی دەسەڵات - لە ناو خۆشگوزەرانییەکی وەهادا دەژین لە واقیعی ژیاوی کۆمەڵگەی دابڕیون، بۆیە بە هیچ شێوەیەک لە گرفت و خەم و هەناسەساردی چینە بەشمەینەتەکان تێناگەن. ئەم دابڕانە هەستی نیشتیمانی و ئینتیمای نیشتیمانی نەک لاواز دەکات، بەڵکو لە ناوی دەبات، بۆیە لە کاتی گرفت و تەنگوچەڵمە دەرەکییەکاندا، کاتێک وڵاتی خاوەن ئەم جۆرە

ڕژێمە دووچاری هەڕەشەی سەربازی و داگیرکاری دەبێتەوە، لە کورتترین کاتدا سوپاکانی ئەم جۆرە ڕژێمانە دادەڕمێت، هەرەسدەهێنێت، چونکە سوپا و دامودەزگاکانی دەوڵەتەکانیان لەسەر بنەمای توانست و لێوەشایی و دڵسۆزی بۆ خاک و نیشتیمان دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر بنەمای وەلائی کەسیی و بەرژەوەندیخوازی مادی دامەزراون، لەوەش گرنگتر، لەبەر ئەوەی هاوڵاتیان بێبەشکراون لە داهاتی خاکەکەیان، خۆیان بە خاوەنی ئەو وڵاتە نازانن، بە هی خۆیانی دانانێن.

ئەم دیاردەی هەرەسهێنانە خێرایانە ئەوە دەخوازێتنب گرنگی بە چارەسەرکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی هاوڵاتیان بدرێت، سوپا و دام و دەزگاکانی دەوڵەت لەسەر بنەمای زانستی نوێی هاوچەرخ دابمەزرێت، ژیانی کۆمەڵگە و چینەکانی باش بکرێت و دەستەبەری کۆمەڵایەتی (الضمان الاجتماعي) کارابکرێت.

ئەزموونە هەموو چەشنەکانی مێژووی بەڕێوەبردنی سیاسی کۆن و نوێ و هاوچارخ ئەوەی سەلماندووە کە هیچ کەس و دەسەڵاتێک ناتوانێت داوای قوربانی لە گەلێک بکات خۆی نا دادپەروەر بووە لەگەڵیدا، چەوساندوویەتییەوە، گەلی بێکاری برسی کە هەردەم لە داهاتوویەکی تاریک دەترسێت، ناتوانێت، بەڵکو خەبات لە پێناو ئەم جۆرە ڕژێمەدا ناکات و بەرگریشی لێناکات. هیچ باوکێک ناتوانێت داوای گوێڕایەڵی لە نەوەکانی بکات گەر باش نەبووبێت لەگەڵیاندا و ژیانێکی سەربەرزانەی بۆ دابین نەکردبن، ئیتر چۆن دەکرێت داوا لە گەلێک بکەیت گوێڕایەڵ و ڕێکخراو و باوەڕی بە نیشتیمانپەروەری هەبێت، کە خۆت بێبەشت کردووە لە هەستی هاونیشتیمانی، چۆن دەکرێت چاوەڕێی قوربانیدانی خۆویستی لێبکرێت گەر دادەوەری نەمابێت و ژیانێکی خۆشگوزەرانی بۆ دەستەبەر نەکرابێت؟!، گەر خوێندنێکی شایستە و کارێکی شایستە بۆ هاوڵاتییان دابین نەکرابێت؟!.

گۆڕانکاری سروشتخێرا ڕووخساری دیاری ئەم سەردەمەمانە، تەمەنی ڕژێمە خراپەکان وەک ئەوشا نییە بتوانێت سەدان ساڵ بڕ بکات. تاکە هۆکاری مانەوە و ئاسایش و ئارامی؛ دابینکردنی ژیان و گوزەرانێکی سەربەرزانەیە بۆ هاوڵاتیان، ئەم هەنگاوەش دەستەبەری هۆشیاری گشتی و ئینتیمای نیشتیمانییە. لەم پێناوەدا پێویستە لە بری قسەی گەورە و دروشم و دروشمکاری، هاوڵاتیان

فێری ئەنجامدانی کارەکانیان بکرێن بە شێوازێکی هونەری و مەنهەجییانە، فێری ڕیزگرتن بکرێن لە کات (وجهة العالم الإسلامي، مالك بن نبي: ١٤٣ – ١٤٧)، بەڵام لە پێش هاوڵاتییانەوە، دەبێت ڕژێمی بەڕێوەبردن خۆی سەرمەشقی ئەم کارەبێت، لە خۆیەوە دەستپێبکات، ئینجا داوا لە هاوڵاتیان بکات.

پشتگوێخستنی هاوڵاتیان و پشتگوێخستنی کەس و کەسایەتییە باش و بە تواناکان و زنا و دڵسۆزەکان و لەبری ئەمان هێنانە پێشی کەسانی کۆڵەوار و مەراییکەر و باش نەکردنی ئاستی بژێوی خەڵکی و پشتگوێخستنی پەروەردە و فێرکردن و کەرتی تەندروستی و پیشەسازی بە جۆرە جیاوازەکانییەوە، هەروەها پشتکردنە بوار کشتوکاڵ، گەورەترین هۆکاری دارمانی کۆمەڵگە و بێئومێدکردنی چین و توێژە جیاوازەکانییەتی، بە تایبەتی چینی گەنجان، لە بری ئەوەی حکومەتەکانی جیهانی سێ، بە تایبەتی تر حکومەتی خۆمان لە خەمی پرۆژەی نیشتیمانیدا بێت، بە پێچەوانەوە بیرکردنەوە و کار و کردەوەیان لە بەرژەوەندی تاکە کەسیی و بنەماڵەییدا کورت بووەتەوە، لەبری ئەوەی دەوڵەتی یاسا پەیڕەوبکرێت و بکرێتە بەردی بناغەی دەوڵەتی هاونیشتیمانی، کۆڵەکەکانی (دەوڵەتی خراپەکاری – دولة الفجور State of debauchery) دەچەسپێنرێت.

(کۆماری مۆز) دیارترین تایبەتمەندی ئەم جۆرە ڕژێمانەیە؛ (کۆماری مۆز) دەستەواژەیەکی گاڵتەپێکەرە بۆ بەچاویکەم تەماشاکردنی دەوڵەتێکی نا سەقامگیر لە ڕووی سیاسییەوە بەکاردەهێنرێت، شوناسە بۆ ئەو دەوڵەتەی هیچ قورساییەکی سیاسی و ئابووریی نییە لە نێوان دەوڵەتاندا، ئابوورییەکەی پشت بە چەند بەرووبومێکی کشتوکاڵی دەبەستێت، بۆ نمونە وەک مۆز، دەوڵەتەکەش لەلایەن کۆمەڵە دەوڵەمەندێکی گەندەڵکاری بچووکەوە فەرمانڕەوایی دەکرێت.

ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمجار لە ساڵی (١٩٠٤)دا لەلایەن (ئۆ هێنری William Sydney Porter) نووسەری ئەمریکاییەوە بەکارهێنرا لە کۆمەڵە کورتە چیرۆکێکیدا بە ناونیشانی (کەلەرم و پادشاCabbages and Kings )، شانۆی ڕووداوەکانی ئەم کۆمەڵە کورتە چیرۆکە ئەمریکای ناوەندە. پاشان ئەم زاراوەیە بۆ ئەو حکومەتە دیکتاتۆرییانە بەکارهات ڕێگە بە دامەزراندنی موستەعمەراتی کشتوکاڵی فراوان دەدەن لەسەر خاکەکەیان بەرامبەر دەستکەوتێکی کەم. پاشتر لەناو (زانستە سیاسییەکان)دا ئەم زاراوەیە بۆ وەسفکردنی سیستمی ناجێگیر

یاخود دیکتاتۆری بەکارهات، بەتایبەتی ئەو سیستمانەی هەڵبژاردن تیایدا ساختە و تەزویرە، سەرۆکەکەشی خزمەتکاری بەرژەوەندی دەرەکییە (Cabbages and Kings by O. Henry: Summary & Quotes https://study.com) (جمهوریە الموز: https://www.aljazeera.net/).

مەترسی ئەم جۆرە لە سیستمانە هەمەچەشن و درێژخایەنە، گەر زوو لە ڕێگەی هۆشیاری کۆمەڵگە و بە پشوودرێژی لە ڕوویدا ڕانەوسترێت، لە شوێنی خۆیدا ڕانەگیرێت. چونکە ئەم جۆرە سیستەمە بۆ بەردەوامی قۆرخاکری و بەتاڵانبرندنی سەرەوت و سامانی ئێستا و نەوەکانی داهاتوو، هەردەم هەنگاو بەرەو حوکمی تۆتالیتاری تاکە کەسی دەنێت، ئەمەش وا لە ڕەوشی وڵات دەکات هەردەم پشێو و نائارام بێت، دەسەڵات وایلێدێت بە چاوی گومانەوە تەماشای هەموو کۆمەڵگە بکات و بە نەیار و ناحەزی خۆی بزانێت، چونکە خۆی باش دەزانێت هەموو کەرتە خزمەتگوزارییەکانی پشتگوێخستووە، تەنیا ڕەچاوی بەرژەوەندی خۆی دەکات، کار لەسەر بردنەدەرەوەی سەروەت و سامانی بە تاڵانبراوی گەل و نیشتیمان دەکات، ئیتر ئەم جۆرە ڕژێمە ترسی لە هەموو شتێک هەیە، لە هەموو ئەوانە دەترسێت کە دەیانچەوسێنێتەوە، لە پێناو شاردنەوەی ترسەکەیدا، بە هەموو شێوازێکی ناپەسەند، خەریکی گەورەکردنی هێزەکەیەتی، ئەو بە تەنیا زانست پشتگوێناخات و کەسانی زیرەک و دڵسۆز دوور ناخاتەوە، بەڵکو گەندەڵی لە هەموو شوێنێکدا بڵاو دەکاتەوە. ڕژێمی تۆتالیتاری و فەرمانڕەوای خۆسەپێن، هەموو جۆرەکانی دووڕوویی دەخاتە خزمەت هێزی تاکە کەسی خۆیەوە. لەبەرئەوەی خۆیان لە خەڵکی بە بەرز و باڵاتر دادەنێن، ڕێگەی بڵاو کردنەوەی شوێنی ڕابواردن و قومارکردن دەگرنەبەر و پشت دەبەستن بە داماڵینی مرۆڤ لە مرۆڤبوونی. بۆ ئەوەی کەسی ملهوڕ هەموو شتێک بێت، پێویستە گەل هیچ نەبێت، هەموو شتێک لە هەموو کەس دادەماڵێت. خۆ بە گەورەدانان و خۆ بەزلزانینی وای لێدەکات خۆی بە هاوتای خوداوەندەکان دابنێت، خۆی وەک بتێک دەبینێت. وەک سروشتی هەموو ڕژێمە خۆسەپێنە نا شەرعییەکان، هێزی سەربازی تەنیا بۆ پارێزگاری خۆی دەبێت و لە ڕێگەیەوە ژیانی کۆمەڵایەتی تێکدەدات و خەڵکی ڕاپێچی ڕێچکەی ترسناک دەکات و هەموو چاکەکارییەکان لە ناو کۆمەڵگەدا دەپوکێنێتەوە، لە ڕێگەی هۆکارە جۆراوجۆرەکانەوە (بڕوانە مقالة

العبودية الطوعية: ٥٧ – ٦٢ و ٩٣ – ١٧٥).

نووسەر و قازی بە ناوبانگی فەرەنسی (ئێتیەن دو لا بۆییسی Étienne de La Boétie / ١٥٣٠ - ١٥٦٣) خاوەنی چەمکی (خۆ بە کۆیلەکردنە)، لە کتێبە بە ناوبانگەکەیدا (گوتاری کۆیلە بوونی دڵخوازی یاخود گوتاری خۆ بە کۆیلەکردن)، دەربارەی کەمتەرخەمی گەل و بێباکیان بەرامبەر مەترسی ئەم جۆرە ڕژێمانە دەڵێت: ئێمە بە تەنیا وەک مرۆڤی ئازاد لە دایک نەبووین، بەڵکو لەسەریشمانە بەرگری لێبکەین؛ هەڵەکانی گەل و میللەت و ئەو نرخەی دەیدەن لە بەرامبەر دووڕوویی کردنیان بۆ فەرمانڕەواکان و مەرایی کردنیان، دەستینشان دەکات و هانی خەڵکی دەدات بەرگری بکەن و بە جەرگ بن لە پێناو رزگار بوونیان لە دەست ئەو سەرکردانەی بەرەو هەڵدێر راپێچیان دەکەن. دەڵێت ستەمکاران نا توانن هیچ بکەن گەر ئێوە خۆتان نەبنە چاویان و نەبنە دەست و باسک و هێزیان. ئێوە منداڵ دەخەنەوە و بە ناز گەورەیان دەکەن، بۆ ئەوەی ئەوان بیانکەنە سووتەمەنی جەنگەکانیان، ئێوە خۆتان لاواز دەکەن بۆئەوەی ئەوان بەهێزبن. ئێوە دەتوانن لەو گوناحە گەورانە رزگاتان بێت کە ئاژەڵانیش ناتوانن بەرگەی بگرن گەر هەستی پێبکەن، گەر تێبکۆشن دەتوانن رزگارتان بێت. هەوڵ مەدەن رزگارتان بێت لە دەستیان بەڵکو تەنیا حەزتان بۆ ئازادی رابگەیەنن. خۆتان کۆبکەنەوە و بڕیار بدەن بە یەکجاری لە ژێردەستەیی رزگارتان بێت، خۆتان دەبیننەوە کە ئازادن. داواتان لێناکەین بە یەکجار پایەکانی ژێردەستەیی خاپوور بکەن، بەڵکو تەنیا واز بێنن لە پشتگیری کردنی، ئەو کاتە دەبینن ستەم و ستەمکاران وەک پەیکەرێکی گەورەی بنکۆڵ وان کە بەهۆی قورسی کێشییەوە لار دەبێتەوە و وردوخاش دەبێت (مقالة العبودية الطوعية: ٥٧ – ٦٢ و ٩٣ – ١٧٥).